# سەردەم 34

ئاب
2004
ســــــالّی شەشەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی



ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 1303473

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە (14665/615 و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:

www.sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

- سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.
- تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.
- بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.
- هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك

## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# فەلسەفە و کێشە هەنوکەییەکان

حەسونە مسباحی
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

بە پێچەوانەی سەدەکانی ڕابردووەوە، بە تایبەتی سەدەکانی پاش سەردەمی ڕۆشنگەری، پێدەچێت فەلسەفە لەمڕۆدا – واتە لە بەراییەکانی هەزارەی سێهەمدا – ئاوا بووبێت. هەرچی فەیلەسوفیشە، ئەوا بۆتە شتێکی دەگمەن و بگرە دەکرێت بڵێین بەرەو نەمان دەچن و ئەوەی کە ماوە چەند بیریارێکن، ئەوانیش کاریان بە تەنها لێکدانەوەو تاوتوێکردنی بەرهەم و ئایدیای فەیلەسوفە کۆنەکانە، ئەوانەی نوسەری گەورە "تەها حسێن" بە (ڕابەرانی بیر) ناویان دەبات و بەم شێوەیە پێناسیان دەکات و دەڵێت: (ئەوانە ئەو مرۆڤانەن کە گەورەترین ڕۆڵیان لە دروستکردنی نەتەوەدا هەیە و هەروەها دەستیان لە نەخشاندنی سستمە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینییەکاندا هەیە، هاوکات بە شدارن لە ئامادەکردنی نەتەوە بۆ گەشەکردن و بەرەو پێشچون). فەیلەسوفی ئەڵمانی "پیتەر سلۆتاردایک" باشی پێکماوە، کاتێک بەر لە چەند ساڵێك نوسیبووی: (ماوەی سەدەیەکە فەلسەفە لە گیانەڵادایە، بەڵام ناتوانێت بمرێت، لەبەرئەوەی ئەرکی خۆی تەواو نەکردووە).

لەوەها هەلومەرجێکدا فەلسەفەیەك نییە تا باسی ئەو (هەزاران بیابانە چۆڵ و ساردانەی مۆدێرنەمان) بۆ بکات، نەبونی ئەوەش وایکردووە خەڵکی هۆگری ئامرازەکانی (بینین و بیستن) بن و لێیانەوە بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا بگەڕێن کە پەیوەندیان بە چارەنوسی مرۆڤایەتیەوە هەیە، لە ئێستا و لە داهاتودا.

چارەنوسی مرۆڤایەتی بە هۆی زیادبوونی شەڕە ناوخۆیی و ئەتنیکی و ئاینییەکان و ڕمانی بەهاکان و جیاوازی زۆری نێوان هەژار و دەوڵەمەند و نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتوو، هەروەها تەشەنەسەندنی تاوانی بە بەرنامە و لەگەڵ ئەو مەترسیانەی ڕووبەڕووی ژینگە دەبێتەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ تاریکتر دەبێت.

بەڵام ئامرازەکانی (بینین و بیستن) ئەو شتانە ناخاتە بەردەستی ئینسانەکان تا ڕاستیەکان بزانن، بەڵکو زۆر جار بەشدارە لە چەواشەکردنی خەڵك یان

ڕێگرتن لەوەی بتوانن شتێکی ئەوتۆیان دەسگیر بێت، تا کەمێك لەو ترس و گومانانەیان برەوێتەوە کە سەبارەت بەو شتانەی لە چوار دەوریان ڕوودەدات هەیانە.

لەبەرئەم هۆکارانە زۆرێك لە بیریارانی ئەمڕۆ هەوڵدەدەن گەورە فەیلەسوفانی کۆڵمان پێبناسێنن، بە تایبەت فەیلەسوفانی شارستانیەتی گریك، وەك: "سوکرات و ئەفلاتۆن"، هەروەها ئاشنابوون بەو فەیلەسوفانەی لە دوای سەردەمی ڕۆشنگەریەوە هاتن. ئەم هەوڵەشیان بەو مەبەستەیە لە میانەی بیرو بۆچون و بەرهەمی ئەو فەیلەسوفانەوە، پەی بە حەقیقەتی دنیای ئەمڕۆ بەرن، حەقیقەتی دنیایەك کە گۆڕانکاری و پشێوی ترسناك بەخۆیەوە دەبینێت و مایەی ترس و نیگەرانیەکی قوڵە.

فەیلەسوفی فەرەنسی "ئەندرێ گلۆکسمان" کە بە یەکێك لە هەرە فەیلەسوفە تازە ناسراوەکان دادەنرێت، دەڵێت: (فەیلەسوفانی یۆنانی وەك سوکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ تالیس و زەینەفۆن و ئەبیکۆر و.. هتد، شایستەی ئەوەن لەمڕۆدا بیانخوێنینەوە، لەبەرئەوەی ئەوان زیاد لە هەر کەسێکی تر دەتوانن یارمەتیدەرمان بن بۆ ئەوەی لە واقعی ئێستامان تێبگەین). تەنانەت ئەو پێی وایە، ئەو فەیلەسوفانە زۆر لەوانە نزیکترن لێمان کە هەنوکە لە گەڵماندا دەژین.

ڕاستە ئەوان لە سەردەم و ڕۆژگارێکدا ژیاون کە سەرلەبەر لەسەردەم و قۆناغی ئێمە جیاوازترە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان ئاگاداری (حەقیقەتی مرۆڤ و کەینونە)بوون. لەبەرئەوە گەڕانەوە بۆ لای ئەو پۆلە فەیلەسوفە کارێکی پێویستە، بۆ ئەوەی پەی بە حەقیقەتی جیهانی ئەمڕۆ بەرین.

"بیار هنری لیڤی"یش کە یەکێکە لە فەیلەسوفە ناسراوە تازەکانی فەرەنسا، پێیوایە "سپینۆزا" یەکێکە لە گرنگترین ئەو فەیلەسوفە کۆنانەی پێویستە لەمڕۆدا بخوێنرێتەوە. لەمبارەیەوە دەڵێت: (لە ئێستادا من بە نوسینی کتێبێکەوە خەریکم دەربارەی فێندەمێنتالیسم، لەسەر ئەو بابەتەش دەقێك هەیە کە ناتوانم فەرامۆشی بکەم، ئەو دەقەش دەربارەی پەیوەندی نێوان تیۆلۆژیا و سیاسەتە و سپینۆزا نوسیویەتی.. لە خوێندنەوەی ئەو دەقەدا نوسەرێکی مەزن بەدی دەکەین کە توانای بەرهەم هێنانی زاراوە گەلێکی وای هەیە، یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی ڕۆشنایی بخەینە سەر ئەو مەسەلانەی زۆر دژوار و ئاڵۆزن، یاخود ئەو کێشانەی پێمان وایە چارەسەرکردنیان ئەستەمە و پەیوەندیان بە بارودۆخی سیاسی و ئاینیی ئەمڕۆمانەوە هەیە).

### دەمارگیری و توندڕەوی لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟

ئەم پرسیارەی ئەمڕۆ دەکرێت، لە سەردەمی "سپینۆزا"شدا لە ئارادا بوو.. من بۆیە پەنام بۆ ئەم فەیلەسوفە هێناوە "بیاهنری لیڤی دەڵێت"، بەو مەبەستەیە تا بەرچاو ڕونیم بداتێ دەرهەق بەو پرسیارەی سەرەوە، هەروەها بۆ ئەوەی لە مەسەلەی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی توندڕەو یاخود دەنگی "ئوسامە بن لادن" حاڵی ببم.

لەلایەکی ترەوە "بیار هنری لیڤی" داوامان لێدەکات لەگەڵ "سپینۆزا"دا "هیگڵ"یش بخوێنینەوە، لەمبارەیەوە دەڵێت: (پێش سی ساڵ هیگڵم خوێندەوە و هەستم بە خۆشی و سەرسامیەکی لەڕادەبەدەر کرد.. ئەگەرچی دوابەدوای ئەوە فەیلەسوفانی دیکەی وەك سارتەر و نیچە و جۆرج باتای و هایدگەریشم خوێندەوە، بەڵام ئەوە تەنها هیگڵە کە سەر سامم دەکات).

هەروەک "بیار هنری لیڤی"، فەیلەسوفی ئەڵمانی "یۆرگن هابرماس" پێی وایە "هیگڵ" شایستەی ئەوەیە بە بەردەوامی بخوێنرێتەوە و لەمبارەیەوە دەڵێت: (سەروەختێك هیگڵم خوێندەوە، بە تایبەت هیگڵی لاو، درکم بەوە کرد کە تەنها لە ساتە وەختە تراژیدیەکانی مێژوودا دەشێت وێنای ئەقڵ بکەین، بەڵام لە نەبوونی ئەوەدا ئەوا دەچینە دۆخێکەوە کە ناتوانین ببین).

سەبارەت بە "ئیمانوێل کانت"ی فەیلەسوفیش، "یۆرگن هابرماس" دەڵێت: چەمکی سەربەخۆبوونم لەوەوە خواست، ئەو چەمکەی فەلسەفەی بە ئاراستەیەکی تازەدا برد. شتێك کە زۆر لە فەلسەفەی کانتدا سەرنجی ڕاکێشام، سەربەخۆیی هاوڵاتی بوو لە ڕووی سیاسیەوە. پێموایە لە فەلسەفەی ئەڵمانیدا تاکە بیریارێکە کە لەسەر ئاستی سیاسی ڕون و شەفاف بووبێت.. هەر بۆیە پاش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی، بۆ نەوەی ئێمە بووە ئەو بیریارەی یارمەتی ئەوەی داین ژیانمان ڕزگار بکەین).

بیریاری فەرەنسی "ئالان فینکلکراوت" پێی وایە گەڕانەوە بۆ لای "هایدگەر" شتێکی بنەڕەتییە، لەبەرئەوەی ئەو بە باشی لە کاریگەری تەکنۆلۆژیا بەسەر ژیانمانەوە تێگەیشتبوو. بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم بۆچونەی "فینکلکراوت" دەڵێت: (پێموایە بۆچونی هایدگەر سەبارەت بە تەکنۆلۆژیا و کاریگەریەکانی لەسەر ژیانی مرۆڤی هاوچەرخ، دووربینیەکی زۆری تێدایە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئاشکراتر دەبێت. ئەوەتا وەکو هایگەر دەڵێت: تەکنۆلۆژیا بە تەنها ئامرازێك نییە بە دەستمانەوە، بەڵکو شێوازێکە لە ڕێیەوە واقیع خۆیمان بۆ ئاشکرا دەکات). هەر لە درێژەی قسەکانیدا "فینکلکراوت" دەڵێت: (کلۆد لیڤی شتراوس، هانس یۆناس، هانا ئاراندت، بۆ من زۆر گرنگ بوون، لە ڕێی ئەوانەوە توانیم پەی بە پڕۆژەی نوێی مۆدێرنە بەرم، ئەو پڕۆژەیەی باسی ئاوابوونی خەیاڵپلاوەکان دەکات لە دنیای ئێمە و پاش ئەوەش چۆن دەتوانین بە شێوەیەکی ئەقلانی ئاراستەی جیهان بکەین، بەو مەبەستەی لە ئێش و ئازارەکانی ئینسان کەم کەینەوە، ئەمەش بۆ خۆی ئایدیایەکی جوانە.. بەڵام ئەمڕۆ تەواو پێچەوانەی ئەو پێشبینیە چاوەڕوانکراوانە دەبینین کە باسدەکرا.

هەنوکەش ناتوانین ڕێگا بەو تەوژمە بگرین و ئاراستەی بگۆڕین. ئێمە بەردەوام پێمان وابوو لە داهاتودا زۆر ئازادتر دەبین، بەڵام وا ئێستا دەبینین لە دۆخێکداین ناتوانین ئاستێك بۆ ئەو جوڵەیە دابنێین کە سەر شێتانە بەرەو مەترسی و بە هیلاك چوون پەلکێشمان دەکات.. ئەمەش ئەو شتە بوو کە هایدگەر درکی پێکردبوو).

هەروەها "کلیمان روسێ" کە خاوەنی کتێب گەلێکە دەربارەی فەیلەسوفانی کۆن و هاوچەرخ، پێی وایە "نیچە" وەڵامی زۆر لەو پرسیارانەمان دەداتەوە کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕووبەڕوی مرۆڤایەتی دەبێتەوە. "ڕوسێ" دەڵێت: (نیچە یەکەمین فەیلەسوفێکە چەکوشی بە دەستەوە گرتبێت، بۆ وردوخاشکردنی ئەو خەیاڵپلاوانەی مێشك و بیری خەڵکانی سەردەمی خۆی و خەڵکانی ئەم سەردەمەشی داگیرکردبوو. هاوکات یەکەمین فەیلەسوفێکیشە کەوتبێتە تێکوپێکدانی ئەو ڕێسا ئەخلاقیانەی، تا ئەو کاتەش بە توندوتۆڵی و تۆکمەیی مابووەوە.. گرنگترین شتێکیش لە فەلسەفەی نیچەدا ئەوەیە ئەو پێی وابوو، ڕۆڵی ڕاستەقینەی فەلسەفە ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردە زۆر ترسناکەکانی ژیانە، بێ ئەوەی ئەمە وا بگەیەنێت کە نابێت چێژ لە خۆشیەکانی ببینین..

ئەمەشــە ئێمــە لــە ســاتە وەخــتی ئێســتاماندا پێویســتمان پێیــەتی، بــە تایبــەتی کــە ئێمــە لــە دنیایـــــەکی نـــــاجێگیردا دەژیـــــن و ڕووداو و کارەســاتەکانی ژیانمــان لــێ تــاڵ دەکــەن و وامــان لێدەکەن لە دڵە ڕاوکێیەکی بەردەوامدا بژین)..

وەکو "کلیمان روسیٚ"، "پاسکاڵ برۆکینەر"ی نوســەر پێــی وایــە بــێ چــەند و چــون "نیچــە" فەیلەسوفی مۆدێرنەیە، ئەوەتا لەم بارەیەوە دەڵێت: (مەزنی نیچە لەوەدایە بونی سستمێکی تەواو و بێ کەموکوڕی ڕەتدەکاتەوە و دەکەوێتە تێکوپێکدانی ئــەو ئایــدیۆلۆژیا و فەلســەفانەی بــەر لــە خــۆی لــە ئـــارادا بـــوون، هـــەروەها ڕەخنـــەی تونـــد ئاڕاستەی سەرەڕۆییەکانی مۆدێرنە دەکات کە لە مرۆدا دەیبینین).

بیریــاری فەرەنســی "لــۆک ڤێــری" کــە "ژاک شــیراک" دوای هەڵبژاردنــەوەی بــۆ دووەمجــار بــە سەرۆکی فەرەنسا لە هەڵبژاردنەکانی بەهاری ساڵی 2002دا، وەک وەزیــری پــەروەردە دەستنیشــانی کــرد، هاوڕایــە لەگــەڵ "یــۆرگن هابرمـــاس"ی فەیلەسـوفی ئەڵـەمانی سـەبارەت بـەوەی "ئیمانوێـل کانـت" دەتوانێـت یارمـەتی مرۆڤایـەتی بـدات، بـۆ ئەوەی لە واقعی ئێستای تێبگات. ئەوەتا دەڵێت:

(هەنـدێک لـە فەرەنسـاییەکان پێیـان وایـە لـە ڕووی گرنگیـەوە ڤۆڵتێر لـە پـێش کانتەوەیـە، سـەرەڕای ئەوەی حوکمێکی لەمجۆرە زیادەڕۆیی تێدایە و بێ مانایە، هاوکات ناوەڕۆکی مەسەلەکەش ناپێکێت.. ڕاستە ڤۆڵتێر نوسـەرێکی بە توانا و ڕۆشـنبیرێکی قـوڵ و بەهرەمەنـدە، بـەڵام بـەراوردکردنی بـەکانت لەسـەر ئاسـتی فەلسـەفی، بەوە دەچێت کە بەراورد لـــە نێـــوان گردۆڵکـــەکانی مۆنمارتـــەر و چـــیای هیمالایەدا بکەین).

هــەر لــە درێــژەی قســەکانیدا "لــۆک ڤێــری" دەڵێت: (پێمان خۆش بێت یان نا، دەتوانین بێ دوو دڵــی بڵــێین ئیمانوێــڵ کانــت بەرجەســتەکەری ڕاستەقینەی فەلسەفەی هاوچەرخە.. ئەو یەکەمین کەســە ڕایگەیانــدبێت کــە ســەیرکردنی جیهــان تــا ئێســـتاش تیۆلۆژیانەیــە. بۆیــە دەڵــێم: ئەگــەر فەلسـەفەیەک لـە ئـارادا بێـت و پێویسـت کـات بـە بـەردەوامی بگەڕێمـەوە سـەری، جگـە لـە فەلسـەفەی کانت شتێکی تر نییە).

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)، 2003/5/14.

# ناوەختی پاش مودێڕن

پەیام یەزدا نجوو
لە فارسییەوە: عادل محەمەد پوور

-1-

دەگمەن هەڵئەکەوێ تاکە مرۆڤێك بیەوێ لەگەڵ داهـاتی چـەمکە مەزنـەکانی: مۆدێرنیتـە، دیمۆکراسی، کۆمەڵگەی مەدەنی، مافی مرۆ، ئازادی بەیان و.. ململانێ بکا و لە هەمبەر دۆزە رەواکانی ئەم چەمکە نوێباوانە بوەستێ. ئەڵبەتە، زۆرن ئەو کەسـانەیش تێدەکۆشـن بـۆ وەگـەڕ خسـتنی ئـەو داهاتـە ئێسـتاییانە، لـە کۆمـەڵگای دواکەوتوو و کۆیلەدا.

بـەڵام ئایـا "مۆدێرنیتـە" چارەنووسـی لـێ نـەبڕاوی ئێمەیـە؟ ئەگـەر لەسـەر واتـای ڕواڵـەتی "مـۆدێرن" بدەینـەوە، شـایەت دان بەوتەکـەی "لیۆتـار"دا دابنـێن کـە دەڵـێ: "هەنووکـەیی بـوون، یانـێ: بەزانـدنی سـنووری هەنووکـە و چـرکە ساتەکان". ئەڵبەتە، ئەم هەڵوێستە لە ئاستی خۆیدا کێشە ساز دەکات. روانینی "لیوتار" بۆ ئەم واتا زۆر سانایە، ئەم بۆچوونە لە ناخدا هەڵگری باوەڕی چەمکی "مۆدێرنیتە"یە، کەوا بوو "پەساموودێڕن" تاکە مەنهەجێکە بۆ "مۆدێرن" بوون" بۆ ئێستایی بوون. بەڵام بە باوەڕی من، "پەسامودێڕن" دیاردەی ئێستایی نەبوونە. "پەسامودێڕن" لەگەڵ هەنووکەدا پەیوەنـدار نییـە. "پەسـامودێڕن" ناوەختییـە" بێ وادەییە.

ناوەخت چییە؟ سەرهەڵدانێکە پێش یان پاش "کـات"وە روو ئـەدات" شـتێك پێشـبینی نـەکراو، غـەیرکاتی، ناتـەبا و نالـەبار. کـەوابوو بـە پێـی ئـەم واتـا، روانینـەکانی "نیچـە" نـاوەختی و غـەیر کـاتی بـوون. نووسـراوەکانی "پەسـامودێڕن" نووسـینی بێوادەیی و غەیر کاتین.

-2-

بـەڵام ئایـا هـەر چەشـنە نـامۆدێڕن بوونێـك، "پەسـامودێڕن" بوونـە؟ ئەڵبەتـە ئەگـەر قایـل بـەم بۆچـوونە بـین، بـێ گومـان تووشـی هـەمان گشـتی کردنەی "لیوتار" دەبین. کـەوا بـوو "پەسامودێڕن" چییە؟ ئاشکرایە کـە هێشـتا بـە راشـکاوی و سـەر ڕاستی پێناسەی نەکراوە" هەڵێنجاندنێکی یەك لا و کـامڵی تـەژی بـەم چـەمکە نـەکراوە، ڕوانگـەی

جۆراوجۆر لە هەمبەر ئەم چەمکە، نیشاندەری ئەم گۆمانەیە. بەڵام ئایا نەبوونی پێناسەی یەك لا و سەر ڕاست، وامان لێ ئەکات کە هەر چەشنە نامۆدێڕن بوونێك بگرێتە بەر؟ لە ڕاستیدا هۆی تێنەگەیشتنی ئێمە لە چەمکی "پەسامودێڕن" هەر لەم خاڵەدایە. ئەوەتا دواکەوتووترین ئەندێشە سەر بە بزاوتی "پەسامودێڕن" دادەنرێ. وێڕای تێکهەڵچوون لەگەڵ چەمکی "مۆدێڕن" ئەیشبێ بە دزێوترین ئامراز بۆ سەرکوت کردنی بزاڤە ئازادیبیرە فرە دەنگیەکان.

لەوەدا کە "پەسامودێڕن" هێشتا دەرەنجامێکی روون و ئاشکرای نییە، دەگەڕێتەوە بۆ واتای تەماوی و نادیاری "مۆدێڕنیتە". هێشتا سنووری نێوان "سوننەت و مۆدێڕنیتە" یان "مۆدێڕنیتە و پەسا مۆدێڕنیتە" ئاڵۆز و تەماوییە. بێ گومان کە هێشتا ئێمە بە درووستی و بێ لادان لە چەمکی "مۆدێڕنیتە" حاڵی نەبووین و کەم تا زۆر لە نێو بازنەی "سوننەت"دا دەژین. بەڵام ئایا ئەو خاڵە هاوبەشانەی کە چەمکەکانی "سوننەت و مۆدێڕنیتە" پێکەوە گرێ دەدا (وەك: دوانگاری اقتدار: دەسەڵات و تمامت خواهی: گشتی خوازی) بە ئێمە ئیجازە نادا تا لە ڕوانگەی (پەسا سوننەتەوە) لەسەر (پەسا مۆدێڕنیتە) بئاخێفین و ڕاڤە بکەین؟

"پەسامودێڕن" نە "سوننەتی" بوونە و نە "مۆدێڕن"تر لە "مۆدێڕن" بوونە.

"پەسامودێڕن" نە یەك سەر ستایشگەری "سوننەتە" و نە مەحکووم کەری بێچوون و چرای "مۆدێڕن". توێژکاری لەسەر "پەسامودێڕن"، توێژینەوەیەکی نسبی و فرەچەشنی و هەمەلایەنەیە. لەم ڕوانگەوە هەر چەشنە رەخنەیەك کە لەسەر "مۆدێڕنیتە" بکرێ، چەمکی "سوننەت"یش دەگرێتە خۆی. "پەسامودێڕن" لە بنەمادا ڕەوتی هێڵی (سیر خطی) "سوننەت – مۆدێڕنیتە – پەسامۆدێڕن" ڕەت دەکاتەوە.

## -3-

"پەسامودێڕن"ەکان هەمیشە تاوانبارن بە ڕوانینی "کۆتاییگەری مێژوو "بەڵام ئەم تاوانە هاوبەندیەی چەپ و ڕاست، ئەم تاوانەی کە "مارکسیستەکان و لیبراڵەکان" بە یەك ئەندازە لە بەستێنی کاریاندایە" هەمان باوەڕی مۆدێڕنیستی – ڕەوتی پێشڕەوانەی هێڵی مێژوویی (راستای خطی و پیش رونده تاریخ)–یە.

ئەو لیبراڵە سەرمەستانە کە ئەمڕۆ لە کۆتایی مێژوو دەمدەکوتن، لەگەڵ ئەو مارکسیستانەی کە پشتگری لە پڕۆژەی نیوەکارەی "مۆدێڕنیتە" ئەکەن" بە یەك ئەندازە بیر لە "کۆتاییگەری" دەکەنەوە.

ڕوانگەی ڕاستەکان، هۆی لووتکەی مێژوو یان پایانگەری، بە پێشکەوتنخوازی دیاردەی کۆمەڵگەی پیشەیی "بۆرژوازی" دەزانێ. ڕکەبەرێ و ململانێ چەپە مارکسیستەکان، لەگەڵ چەمکی "کۆتایی مێژوو" ئەوەتە کە ئەیانەوێ: داهاتی چەمکی "لووتکەبوون و پایانگەری"یەکەی مێژوو، لە داهاتووی زەمەنیدا لە نێو کۆمەڵگەی "سۆسیالیستی" یان "کۆمۆنیستی"دا ببیننەوە. بەڵام نەستەق وتەکەی "بوودریار"ە، کە دەڵێ: "لەم ڕوانینەدا هیچ پایان گەریەك هەبوونی نییە "وەهمی "کۆتایی گەری" خاڵی هاوبەشی سەرجەمی "لیبراڵەکان و مارکسیستەکان"ە، خاڵی هاوبەندی سەرجەمی "مۆدێڕن"ەکانە کە کۆتایی "مۆدێڕنیتە" بە

"کۆتایی مێژوو"، "کۆتایی میتافیزیک"، "کۆتایی مرۆ" و.. دادەنێن.

بیرمەنـــــدانێك وەك: "فۆکۆیامـــــا" کــــە سەرمەسـتانە، سـۆزی ئـەم ئـاوازە، لـە وێرانـەی "یۆتۆپیـــا"دا دەژەنـــن، یـــان نووســـەرانێك وەك: "بێکـت" کـە بـە شـێوازی نـەزۆکی خۆیـان، تازەیـە باری ئەم بێ واتاییەن.

-4-

بێ بڕوایـی بـە ڕەوتـی هێڵـی مێـژوو (ڕاسـتای خطـــی تـــاریخ) پـــڕ کێشەســـازترین چـــەمکی "پەسـامودێڕن" بـە ئـەژمار دێ. ئـەم بـێ بڕواییـە، دەبێتـــە هـــۆی لادان و بەزانـــدنی حەڵقـــەی بازنـــە دیاریکراوەکان و تێکدانی پێوەرە ناسراوەکان. پتر لـــە هـــەموو دیاردەیـــەك ئـــەم خاڵـــە، ئەندێشـــەی "سـوننەتی و مۆدێڕنـەکان" دەخاتـە مەترسـییەوە. ئایا ئەم سنوورشکێنییە لادەریانە، شتێك غـەیر لە هەمان "ناوەختی پەسامۆدێڕن"ە؟

بە ڕای من ڕوانگەی توێژکارنێك وەك: "برایـان مـــەك هیـــل" کـــە جـــەخت لەســـەر ســـنووربەندی دیاردەکانی (فەرهـەنگی، کۆمەڵایـەتی، سیاسـی و..) و ڕەنگدانەوەیان لە وەزع و حاڵی ئێمەدا ئەکەن و لە ئەساسیشـدا ڕەنگدانـەوەی "پەسـامودێڕن"یش هـەر لەم خاڵەدایـە" ڕوانگەیـەك وشیارانەترە لـە ڕوانگـەی بیرمەنـدانێك وەك: فردریـك جەیمسـۆن – کـە دەڵـێن: سـنوور بەنـدی لـە وەزێعـەتی پەسـامۆدێڕندا – بـە تایبـەت لـە نێـو فەرهـەنگی بـەرز (والا) و فەرهـەنگی گشـــتی (عامـــە)دا –0 بـــە تـــەواوەتی تواوەتـــەوە. "نـــاوەختی پەســـامۆدێڕن"یش گـــوێ ڕایـــەڵی ئـــەم ســــنووربەندیانەتە و بەزانـــــدنی چوارچـــــێوەی دیـاریکراو. هـەر لـەم ڕووەوە، چـاو لێنـەکردنی ئـەم خاڵـــە لـــە نووســـین "پەســـامۆدێڕن"دا مەحاڵـــە.

تێپەڕبوون لـە سنوورەکانی "سوننەت مۆدێڕنیتـە"، ئاڵۆزکردنی ڕوخساری پیرۆزیـان بـە نـاتۆر و بردنـە ژێـر پرسـیاری هـەموو خاڵـە سـەرەکیەکانی ئـەم دوو چـەمکە – ئایـا ئـەو دیـاردە دزێوانـە نـین، کـە ئـەمرۆ ســیمای "پەســـامۆدێڕن"ی بـــۆ ئێمـــە و دیـــاردە فەرهەنگییـەکان، ئاوا مەترسـی هێنـەر و ناوەخـت و بێ وادە، نیشان داوە؟

-5-

"پەسـامۆدێڕن" شـتێکە و لاسـاییکردنەوە لـە ڕوانگاکـــانی "پەســـامۆدێڕن"، شـــتێکی کـــە. لـــە کۆمەڵگەی فەرهەنگی ئێمەدا، ژمارەیەکی زۆر دەق و بەرهەم دەخولقێ و ڕاوبۆچوون گەلێك وەردەگێڕدرێ و ڕەخنەگـەلێك دەنووسـرێ، لـە نێـو هـیچ کـام لـەم بەرهەمانەدا کە باس لە تەوژمی مەترسیهێنەرێك کە "پەسـامۆدێڕن" لەگـەڵ خۆیـدا دەیهێنـێ – هـەمان "ناوەختی پەسامۆدێڕن" – بکەن" نابینرێ.

ئایا ئـەو ڕوانگـە چاولێکەرانە و خۆدۆڕاندنـەی ئێمـە بـۆ "پەسـامۆدێڕن" و هۆگریمـان بـە کـردەوەی سوننەتی و شـایەت مـۆدێڕن، ئێمـە ناگەیەنێتـە ئـەو قەناعەتە کە ئیمان بێنین بەمە کە ڕوانین و بۆچوونی بە تەوژم و تێکدەری "پەسامۆدێڕن" بـۆ ئێمـە تـەنیا نواندراوێکە – بە وتەکەی "بوودریار" – کە جەخت لەســـەر ئاسایشـــی خـــۆی بـــۆ پتـــەوکردنی هـــەمان ڕەوش و کارکردی پێشوو دەکات؟

کۆمەڵگە و فەرهەنگی ئێمـە لەگـەڵ دیاردەکـانی "پەســـامۆدێڕن" تـــەبا نیـــە. بـــەڕای مـــن هـــەر لـــەم ڕوانگــەوە، پەســـامۆدێڕن لـــە ئـــەدەبیاتی ئێمـــەدا، کاردانەوەی نەبووە و لە داهاتوویشـدا بـەم زووانـە و بـــە ســـانایی نایبـــێ. مـــن لـــە ڕوانینمـــدا ئەوەنـــدە ســـایلۆح و خـــۆش بـــین نـــیم کـــە بـــە کـــار بەســـتن و وەرگرتنـــی چـــەند تایبەتمەنـــدی چـــاولێکەرانە، لـــە

بەرهەمێکدا بە چەمکی "پەسامۆدێرن" بزانم. ئەمە نابێتە "ناوەختی پەسامۆدێرن". ئەمە لە ناواخندا دووپات کردنەوەیەکی بێ تام و چاولێکردنەوەیەکی بێ هەژاندنە. ئاوا تێڕوانینێك، زۆر خۆش بینانە (ئیجازە بدەن بڵێم) ڕواڵەت دیتنانەی (سطحی نگرانە)ی کەسانێکە کە بڕوایان بە شکڵ گەرایی فەرهەنگی (بۆ وێنە دیمۆکراسی) و تاووتووکردنیان لەگەڵ ناواخنی دیاردە سوننەتیەکاندا هەیە.

"پەسامۆدێرن"، لە سەرەتاکانی دەهەی شەستدا سەریهەڵدا و پێش لە هەموویش، لە ناڤینی دەهەی هەفتادا، کۆتایی پێهات.

کەوابوو، ئەبێ ئەدەبیاتی "پەسامۆدێرن" تەنیا بە دیاردەیەکی پەیوەندیدار بە رابردوو و بابەتێکی توێژکاری بزانین؟ هۆی دژایەتی من لەگەڵ سەرەنجامە، قەبووڵ نەکردنی ئەو نەخشە ڕۆژژمێرەتە. ئەدەبیاتی "پەسامۆدێرن"، چ لە نووسین و چ ڕوانیندا، هێشتا، بە تەواوی ئامریکا-تەوەرە، ئەو نەخشە ڕۆژژمێرە نیشاندەری رەوتێکە، کە لە ئامریکاوە دەستی پێکردووە و لە ئەورووپا و ئامریکای لاتیندا تەشەنەی کردووە، و لە وەرچەرخانێکدا، هەمیسان لە ئامریکادا کپی نیشتوەتەوە. ئەگەر قایل بە ئاوا نەخشەیەك بین — جگە لەمە ڕێگایەکی ترمان نیە تا — وەك "لوری مەك کافری" — ئەدەبیاتی پاش ئەم زەمەنە بە "پەسا — پەسا مۆدێرن"، یان بە هەر حاڵ، "غەیر پەسامۆدێرن" نێو دێر بکەین. بەڵام بەرای من پێکهاتەکانی، ئەدەبیاتی دەهەی شەست و هەفتا، تەنیا پرشەیەك (جلوە) بوو لە "پەسامۆدێرن" و "ناوەختی" ئەو چەمکە" "پەسامۆدێرن"یش تەنیا لەم پرشەدا، قەتیس ناکرێ.

ئەگەر قایل بە جیاوازی دەقێق نێوان "مۆدێرن" و "مۆدێرنیست"بین، (بەم پێیە، بۆ وێنە، زۆلا بە مۆدێرن و بودلێر بە مۆدێرنیست بزانین) ئەدەبیاتێك کە تا ئێستا نواندراوە، ئەدەبیاتی "پەسامۆدێرن"ە نەك ئەدەبیاتی "پەسامۆدێرنیستی". ئەڵبەت ئەمە جیاوازیەکە، کە نووسەرانی ئەم زنجیرە وتارە، سەر و مڕ ئاوڕیان لێنەداوەتەوە. بەم حاڵە، من زۆر خۆش بینانە، لەم باوەڕەدام هەروەها کە لە ناخی دڵی بیرمەندانی "پەسامۆدێرن"ی مەزن و هەندێ بیریار وەکوو: لیوتار، دلۆز، فۆکۆ و.. بیرمەندی مەزنی ناوەختی پەسامۆدێرن" یانێ "بوودریار" سەری هەڵدا" دێریا زوو لە پانتایی ئەدەبیاتدا، شاهێدی سەرهەڵدانی بزڤێك و نووسەرانی "پەسامۆدێرن" ئەبین" هەر چەند ڕەنگە، هێڵ گیری (جهت گیری) ئەدەبیاتی دوو دەهەی دوایی لە ڕۆژئاوادا، دانپێنەری ئەم بۆچوونە، نەبێ. ئەمە لە خۆیدا، "ناوەختی پەسامۆدێرن"ە.

## سەرچاوە

ادبیات پسامدرن.
نووسینی پەیام یەزدانجو لا 3-10.

# هێزە فیکرییەکان و دەرکەوتنی بیردۆزی کۆمەڵناسی

جۆرج ریتزەر

لە ئینگلیزییەوە: عەتا قەرەداخی

لەگەڵ ئەوەشدا کە کارکەرە کۆمەڵایەتییەکان گرنگن، ئەم بەشە لە ئاستی یەکەمدا جەخت دەکاتە سەر کارکەرە فیکرییەکان کە دەورێکی سەرەکیان بینیووە لە پێکهێنانی بیردۆزی کۆمەڵناسیدا. لە جیهانی راستەقینەدا، بێگومان کارکەرە فیکرییەکان ناشێت لە هێزە کۆمەڵایەتییەکان جیابکرێنەوە، بۆ نموونە لە گفتوگۆی ڕۆشنگەریدا کە دواتر دێینە سەری، ئێمە دەبینین کە ئەم جوڵانەوەیە بە شێوەیەکی پتەو پەیوەستە بەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیانەوە کە لە سەرەوە ئاماژەیان بۆ کرا. ئەم جوڵانەوەیە لە زۆر حاڵەتدا بنەمای فیکری بۆ ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیانە پێشکەش کردووە.

هێزە فیکرییە زۆرەکانی کە گەشەکردنی بیردۆزە کۆمەڵایەتییەکانیان پێکهێناوە لە سنووری چوارچێوەی نەتەوەیدا گفتوگۆ دەکرێن کە لەوێدا کاریگەری ئەو هێزانە لە ئاستی یەکەمدا هەستی پێکراوە. (بڕوانە لیڤین – 1995). لێرەدا دێینە سەر گفتوگۆکردنی ڕۆشنگەری و کاریگەرییەکانی لەسەر گەشەکردنی بیردۆزی کۆمەڵناسی لە فەرەنسادا.

## ڕۆشنگەری

ڕوانینی زۆرێک لە چاودێران ئەوەیە کە ڕۆشنگەری پەرەسەندنێکی رەخنەیی پێکدێنێ لە سەردەمەکانی پەرەسەندنی دوایی کۆمەڵناسیدا بۆ نموونە هۆسۆرن 1976، هۆگۆس و مارتن و شارۆك لە ساڵی 1995دا و، نیزبات لە ساڵی 1981 و 1990 و 1994 و 1996 دا، لە خاوەنانی ئەو پەرەسەندنە رەخنەییەن. ڕۆشنگەری بریتی بوو لە سەردەمی پەرەسەندنێکی فیکری باڵا و گۆڕانکاری لە فیکری فەلسەفیدا. ژمارەیەك لە بیروڕاو بڕوای مێژوودار – کە زۆرێکی پەیوەستە بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە لابران و لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا جێگایان گیرایەوە. بیرمەندە هەرە دیارەکانی کە پەیوەستبوون بە ڕۆشنگەرییەوە بریتی بوون لە فەیلەسوفە فەرەنسییەکان لەوانەش چارلس مۆنتیسکیۆ (1689–1755) و جان جاك ڕۆسۆ

(1712-1778). كاریگـــــەری ڕۆشـــــنگەری لەســـەر بـــیردۆزی كۆمەڵناســـی هەرچـــەندە زۆر ناڕاســـتەوخۆتر و خـــراپتر بـــوو لـــە چـــاو ئـــەوەی ڕاســتەوخۆ و بــاش بێــت. هــەروەك ئــارڤینگ زیــتلین دایدەنێت: كۆمەڵناسی سەرەتا وەكو كاردانەوە بۆ ڕۆشنگەری پەرەی سەند (بڕوانە 1981 – ل10).

ئەو بیرمەندانەی كە خەریكی ڕۆشنگەری بوون لە سەرووی هەموو شتێكەوە لەلایەن دوو ئاڕاستەی فیكرییەوە كاریان لێكراوە كە ئەوانیش بریتی بوون لە فەلسەفەی سەدەی حەڤدەیەم و زانست.

فەلســـەفەی ســـەدەی حەڤدەیـــەم ئەوەیـــە كـــە پەیوەســـتە بـــە بەرهـــەمی بیرمەنـــدانی وەكـــو دێنـــە دیكارت و تۆماس هۆبز و جۆن لۆكەوە. جەختكردن لەسەر بەرهەمهێنانی سیستەمی گەورە و گشتی و زۆر ئەبســـتراكتی ئـــەو بیروڕایانەیـــە كـــە هەســـتی عەقڵانیـەتیان دروسـتكردووە. بیرمەنـدەكانی دوایـی كە خەریكی ڕۆشنگەریی بوون ئەو بیروڕایەیان ڕەفز نـــەكرد كـــە گوایـــە سیســـتەمەكانی بـــیروڕا پێویســتە گشــتی بــن و دەبــێ هەســتی عەقڵانیــەت دروســـت بكـــەن، بـــەڵام ئـــەو بیرمەندانـــە كۆششـی گـەورەتریان كـرد بـۆ ئـەوەی بیروڕاكـانی خۆیــان لــە جیهــانی ڕاســتەقینەوە دابڕێــژن و لــەو جیهانەشدا تاقیان بكەنەوە. بە وشەیەكی تر ئەوان ویسـتیان توێژینــەوەی ئەزمونگــەری و عــەقڵ (هــۆ) پێكــەوە كۆبكەنــەوە (بــۆ نموونــە بڕوانــە ســیدمان 1983، ل 36-37).

نموونـــەش بـــۆ ئـــەم بۆچـــوونە لـــە بـــواری زانســتدا بــوو بــە تایبــەتی فیزیــای (نیــوتن)ی. لــەم خاڵەوە ئێمە سەیری دەركـەوتنی داواكاری ڕێبـازی زانســتی دەكــەین بــۆ مەســەلە كۆمەڵایەتیــەكان. بیرمەنـدانی ڕۆشـنگەری بەلایـەنی كەمـەوە تـەنیا ئـەوەیان نەویسـتووە كـە بیروڕاكانیـان لـە جیهـانی ڕاستەقینەوە دابڕێژرێت، بەڵكو ویستوویشیانە ئەو بیروڕایانــە بــۆ جیهــانی كۆمەڵایــەتی بــە ســوودبن، بەتایبـــەتی لـــە شـــیكردنەوەی ڕەخنەییانـــەی ئەو جیهانەدا.

لە سەرووی هەموویەوە، ڕۆشنگەری بە هۆی ئەو بڕوایەوە وەسفكراوە كە خەڵكی توانیوویانە لە گـەردوون تێبگـەن و دەسـەڵاتی بەسـەردا بكـەن لـە ڕێگــای عــەقڵ و توێژینــەوەی ئەزموونگەرییــەوە. ڕوانینەكە بەو جۆرە بوو چونكە جیهانی فیزیكی دەســـەڵاتی بەســـەردا كرابـــوو لەلایـــەن یاســـا سروشـــتیەكانەوە، كـــە لەوانەیـــە جیهـــانی كۆمەڵایـەتیش هـەر بـە هـەمان شـێوە بووبێـت. بـەم جـۆرە بـەكارهێنانی عـەقڵ و لێكدانـەوە كـەوتبووە سـەر فەیلەسـوفەكە، كـە ئـەو بەكارهێنانـەش بـۆ ئاشـكراكردنی ئـەم یاسـا كۆمەڵایەتیانـە بـوو. بـۆ جارێــك ئــەوان تێگەیشــتن كــە چــۆن جیهـــانی كۆمەڵایـــەتی كـــاری كـــردووە، لـــەو ڕووەوە بیرمەنـــدانی ڕۆشـــنگەری ئامـــانجێكی عەمـــەلیان هـەبوو. ئـەویش دروسـتكردنی جیهـانێكی عـەقڵانی تری باشتر بوو.

لەگەڵ جەختكردنە سەر عەقڵدا، فەیلەسوفانی ڕۆشـنگەری مـەیلیان بـەلای ڕەتكردنـەوەی بـاوەڕدا بـوو لـە دەسـەڵاتی تەقلیدیـدا. كـاتێ ئـەم بیرمەندانـە بەها تەقلیدییەكان و دامەزراوەكانیان هەڵسەنگاند، ئاســایی بۆیــان دەركــەوت كــە بــەهاو دامــەزراوی ناعــەقڵانین – ئــەوەش ناكۆكــە لەگــەڵ سروشــتی مرۆڤــدا و بەربەســتە لــە ڕێگــای گەشــەكردن و پەرەسەندنی مرۆڤدا. پەیامی فەیلەسوفە عەمەلی و ئاڕاســتە گۆڕاوەكــانی ڕۆشــنگەری بــە مەبەســتی دەســـەڵات كردنـــە بەســـەر ئـــەم سیســـتەمە ناعەقڵانیانـەدا. ئـەو خـاوەن بـیردۆزەی كـە زۆر بـە ڕاســـــتەوخۆیانە و ئیجابیانـــــە لەلایـــــەن

بیرکردنەوەی ڕۆشنگەرییەوە کاری لێکراوە کارل مارکسە، بەڵام مارکس بیروباوەڕی تیۆری سەرەتایی خۆیی لە ئەڵمانیا داڕشتووە.

## کاردانەوەی پارێزکارانە بۆ ڕۆشنگەری

لە رووکەشدا لەوانەیە وا بیر بکەینەوە کە بیردۆزی کۆمەڵناسی کلاسیکی فەرەنسی وەکو بیردۆزی مارکس راستەوخۆ و بەشێوەیەکی پڕ لە دڵنیاییەوە لەلایەن ڕۆشنگەرییەوە کاری لێکرابێت. کۆمەڵناسی فەرەنسی بووە بە شتێکی عەقلانی و ئەزمونگەری و زانستی و ئاراستە گۆڕاو، بەڵام پێشتر وانەبوو، هەروەك کۆمەڵناسی فەرەنسی بەهۆی زنجیرەیەك بیروڕاوە پێکهاتووە کە لە کاردانەوەدا بۆ ڕۆشنگەری پەرەیان سەندووە. لە ڕوانینی سیدماندا "ئایدیۆلۆژیای دژە ڕۆشنگەری هەڵگەڕانەوەی راستەقینەی ڕۆشنگەری لیبریالیزمی دەنواند. لە شوێنی پێگەکانی نوێخوازدا، ئێمە دەتوانین لە ڕەخنەگرانی ڕۆشنگەریدا هەستێکی بەهێزی دژی نوێخواز ئاشکرا بکەین. وەکو دەبینین، کۆمەڵناسی بە گشتی و کۆمەڵناسی فەرەنسی بە تایبەتی هەر لە سەرهەڵدانیەوە تێکەڵاوبوونێکی نەگونجاوی بیروباوەڕی ڕۆشنگەری و دژە ڕۆشنگەری بووە.

شێوازی هەرە توند و تیژی نەیاری بوون بۆ بیروباوەڕەکانی ڕۆشنگەری فەلسەفەی دژە شۆڕشی کاسۆلیکی فەرەنسی بوو کە بەهۆی بیروباروەڕەکانی لویس دی بۆنالد (1754–1840) و جۆزێف دی ماستفیە (1753–1820) و ریدی (1994)یەوە خراوەتە ڕوو. ئەم پیاوانە کاردانەوەیان نواندووە نەك تەنیا دژی ڕۆشنگەری بەڵکو دژی شۆڕشی فەرەنساش، کە ئەمان تا ڕادەیەك وەها سەیریان کردووە کە شۆڕش بەرهەمی جۆرێك لە خاسێتی بیرکردنەوەی ڕۆشنگەری بێت. بۆ نموونە دی بۆناڵد بەهۆی گۆڕانکارییە شۆڕشگێرییەکانەوە سەری لێشێواو پەرۆشی گەڕانەوە بوو بۆ ئاشتی و هارمۆنیای سەدەکانی ناوەڕاست. لەم ڕوانگەیەوە خودا سەرچاوەی کۆمەڵ بوو، لەبەرئەوە، عەقڵ کە زۆر گرنگ بوو بۆ فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری وا دەبینرا کە لە ئاستێکی نزمدا بێت بۆ بیروباوەڕە ئاینییە تەقلیدییەکان. سەرباری ئەوەش بڕوا وا بوو کە لەبەرئەوەی خودا کۆمەڵی دروستکردبوو، خەڵك دەبوو دەستکاری نەکەن و هەوڵنەدەن ئافریدەیەکی پیرۆز بگۆڕن. بەهۆی فراوان بوونەوە، دی بۆناڵد نەیاری هەر شتێك بوو کە ئەم دامەزراوە تەقلیدیانەی وەکو (باوکسالاری، خێزانی تاك ژنی، پاشایەتی، کەنیسەی کاسۆلیك)ی لاواز بکردایە.

سەرباری ئەوەی کە دی بۆناڵد شێوازێکی هێجگار توندوتیژی کاردانەوەی پارێزکارانەی نواند، بەرهەمەکانی (سەرەتای سوودبەخشی) بۆ پێگەو پاشکۆ گشتییەکانی پێکدەهێنن. پارێزکاران لەوە دوور کەوتنەوە کە وایان دانا یان حسابیان کرد بە عەقلانیەتی "ساویلکە"ی ڕۆشنگەری. نەك تەنیا لایەنە ناعەقلانیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیان پەی پێنەدەبرد بەڵکو نرخ و بەهایەکی چاکیشیان بۆ دادەنان. بەم جۆرە پارێزکاران ئەم جۆرە دیاردانەی وەکو داب و نەریت و خەیاڵ و سۆزدارێتی و ئاینیان وا داناوە کە سوود بەخش بن و ڕەگەزە بنەڕەتیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیش بن.

لەوەشدا ئەمان حەزیان لە گۆڕانکاری خێرا (ئینقلاب) نەدەکرد بەڵکو هەوڵی پاراستنی سیستەمی باویان دەدا و خەمیان بۆ بەرەوپێشەوە چوونەکانی وەکو شۆڕشی فەرەنسا و شۆڕشی

پیشەسازی دەخوارد کە وەکو هێزی تێکدەر سەیریان دەکردن. پارێزکاران ئارەزووی ئەوەیان هەبوو کە جەخت بکەنە سەر رێکخستنی کۆمەڵایەتی، ئەویش جەختکردنێك بوو کە بوو بە یەکێك لە فیکرە سەرەکیەکانی بەرهەمی هەندێ لە خاوەن بیردۆزە کۆمەڵناسیەکان.

زیتلین (ساڵی 1981) دە پێشنیاری خستەڕوو کە وای دەبینێت لە کاردانەوەی پارێزکارانەوە دەرکەوتوون، هەروەها چەند بنەمایەك بۆ پەرەسەندنی بیردۆزی کۆمەڵناسی کلاسیکی فەرەنسی پێشکەش کردووە کە ئەمانەی خوارەوەن:

1-لەگەڵ ئەوەشدا کە بیرمەندانی رۆشنگەری ئارەزووی جەخت کردنە سەر تاکە کەسیان هەبوو، کاردانەوەی پارێزکارانە بوو بە هۆی بایەخپێدانی گەورەی کۆمەڵناسی و جەخت کردنە سەر کۆمەڵگا و دیاردە مەودا فراوانەکانی تر.

2-کۆمەڵگا یەکەی هەرە گرنگی شیکردنەوەیە و وەها سەیری دەکرێت کە زۆر لە تاکە کەس گرنگترە. کۆمەڵگا تاکە کەسی بەرهەمهێناوە ئەویش بەشێوەیەکی سەرەتاییانە لە کردەی بە کۆمەڵایەتی بووندا گەیشتۆتە ئەنجام.

3-تاکە کەس تەنانەت وەها سەیر نەکراوە کە رەگەزێکی هەرە بنچینەیی بێت لە کۆمەڵگادا. کۆمەڵگا لەو جۆرە پێکهاتانەی وەکو دەور، پلە و پایە، پەیوەندی، بنیاد و دامەزراوەکان دروست بووە. تاکەکان وەها سەیریان کراوە کە شتێکی زۆر کەمیان کردووە بێجگە لە پڕکردنەوەی ئەم یەکانەی نێو کۆمەڵگا.

4-بەشەکانی کۆمەڵگا وەها سەیر کراون کە لە ناوەوەڕا پێکەوە پەیوەند و پەیوەستن لە راستیدا ئەم پەیوەندییە ناوکۆییانە بریتی بوون لە بنەما سەرەکیەکانی کۆمەڵگا. ئەم ڕوانینە بەرەو ئاراستەیەکی سیاسی پارێزکارانە رۆیشتووە ئەوەش لەبەرئەوەیە کە بەشەکان پابەند بوون بەوەی کە پەیوەندی ناوکۆییان هەبێت. ئەمەش وایکردووە کە یاریکردن بە یەکێك لە بەشەکان بە چاکی ببێت بە هۆی لاوازکردنی بەشەکانی تریش و لە ئاکامیشدا ببێت بە هۆی لاوازی سیستەمەکە بە شێوەیەکی گشتی. ئەمەش مانای وایە کە ئەو گۆڕانکارییانە لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا دەبێ بە وریاییەکی زۆرەوە ئەنجام بدرێن.

5-گۆڕانکاری وەها سەیرکراوە کە تەنیا هەڕەشە نییە بۆ سەر کۆمەڵگا و پێکهاتەکانی بەڵکو هەڕەشەیە بۆ سەر تاکەکانیش لە کۆمەڵگادا. پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا وەکو ئەوە سەیرکراون کە تێرکەری پێداویستییەکانی خەڵك بن. کاتێ دامەزراوەکان تێکشکێنران، خەڵکی لەوانەبوو ئازار بچەژن و لەوانەبوو ئازار چەشتنەکەشیان ببێت بەهۆی ئاژاوەی کۆمەڵایەتی.

6-ئاراستەی گشتی یان سۆزداری گشتی ئەوە بوو کە سەیری پێکهاتە مەودا فراوانە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا وەها بکات کە سوودبەخشن بۆ کۆمەڵگا و بۆ تاکەکانیش لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵگایەدا. لە ئەنجامی ئەوەدا ئارەزوویەکی کەم هەبوو بۆ لەدواگەڕانی کاریگەرییە خراپەکانی بنیادە کۆمەڵایەتییە باوەکان و دامەزراوەکۆمەڵایەتیەکان.

7-یەکە بچووکەکانی وەکو خێزان و دراوسێیەتی و دەستە ئایینی و پیشەییەکان وەکو شتی گەوهەری بۆ تاکەکەس و بۆ کۆمەڵگا سەیر کراون ئەم یەکانە زەمینەی بەهێزی پەیوەندی و زەمینەی ڕووبەڕووبوونەوەیان پێشکەش کردووە کە خەڵکی پێویستیان بووە بە مەبەستی

زیندووکردنەوەو و ژیانەوەو لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا.

8-ئارەزوویەك هەبوو بۆ بینینی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیە هاوچەرخە جۆراوجۆرەکانی وەکو بە پیشەسازی کردن و بەشاری بوون و بە بیرۆکراتی بوون کە ئەمانەش کاریگەری شێواندیان هەیە. ئەم گۆڕانکارییانە بە ترس و نیگەرانیەوە سەیر کراون و جەخت کردنیش لەسەر پەرەسەندنی ڕێگاکانی خۆ خەریك کردن بە کاریگەرییە تێکدەرەکانیانەوە لە ئارادا بووە.

9-لە کاتێکدا زۆربەی ئەم گۆڕانکارییە ترسناکانە بوونەتە هۆی هێنانی کۆمەڵگایەکی فرە عەقڵانی، کاردانەوەی پارێزکارانە بووە بە هۆی جەختکردن لەسەر گرنگی کارکەرە ناعەقڵانیەکانی وەکو (کەشە ئاینییەکان، سروتەکان، پەرستیاری..) لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا.

10-لە کۆتایدا، پارێزکاران پشتگیری بوونی سیستەمێکی هەرەمی دەسەڵاتیان لە کۆمەڵگادا کردووە. ئەوە بینراوە کە بۆ کۆمەڵگا شتێکی گرنگە کە سیستەمێکی جیاواز یان جۆراوجۆری پایە و پاداشتی هەبێت.

ئەم دە پێشنیارە لە کاردانەوەی پارێزکارانەوە بۆ رۆشنگەری داڕێژراون و پێویستە وەکو بنەما فیکرییە راستەوخۆکانی پەرەسەندنی بیردۆزی کۆمەڵناسی لە فەرەنسادا سەیر بکرێن. زۆرێك لەم بیرۆکانە ڕێگای خۆیان بردۆتەوە سەر بیری کۆمەڵناسی سەرەتا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە بیرۆکەکانی رۆشنگەری (بۆ نموونە: ئەزموونگەرێتی) کاریگەر بوون.

## گەشەکردنی کۆمەڵناسی فەرەنسی

ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ دامەزراندنی راستەقینەی کۆمەڵناسی لەو ڕوانگەیەوە کە لقێکی زانیاری خاوەن سیفاتی دیارە.. بەتایبەتیش دەگەڕێینەوە بۆ بەرهەمی سێ بیرمەندی فەرەنسی کە ئەوانیش (کلۆد سان سیمۆن و ئۆگۆشت کۆمت و ئیمیلی دۆرکایم)ن.

کلۆد سان سیمۆن (1760-1825) گەورەتر بوو لە ئۆگۆست کۆمت، لە راستیشدا کۆمت لە ساڵانی سەرەتایدا وەکو سکرتێر و قوتابی سان سیمون خزمەتی کردووە. لێکچوونێکی تەواو لە نێوان بیروڕای ئەم دوو بیرمەندەدا هەیە، هەرچەندە گفتوگۆیەکی بچوك لە نێوانیاندا پەرەدەستێنێ و دەبێتە هۆی دوا جیابوونەوەیان (بڕوانە پیکەرنیگ 1993 و سۆمپسۆن 1975).

لایەنی هەرە پڕ بایەخی سان سیمۆن گرنگی دانی بوو بە پەرەسەندنی بیردۆزی پارێزکاری (کۆمت) و بیردۆزی مارکسی رادیکاڵیانە. لەلایەنی پارێزکارییەوە، سان سیمۆن ویستی کۆمەڵگا وەکو ئەوەی هەیە بپارێزرێت، بەڵام هەوڵی گەڕانەوەی بۆ ئەو ژیانە نەدا کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبووە، یان وەکو ئەوەی دی بۆناڵد و دی مایستری کردیان کە گەڕانەوە بوو بۆ ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست. لە سەروی ئەوەشەوە سان سیمون پۆزتڤیست بوو (بڕوانە دورکایم 1928-1962) ئەمەش مانای ئەوە بوو کە بڕوای وا بوو توێژینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان پێویستە هەمان تەکنیکی زانستی بەکار بهێنێت کە لە زانستە سروشتییەکاندا بەکارهاتوون. لەلایەنی رادیکاڵیەوە، سان سیمۆن پێداویستی بۆ ریفۆرمی سۆشیالیستی دەبینی بە تایبەتی نەخشە دانانی ناوەندی (مرکزی) سیستەمی ئابوری. بەڵام سان سیمۆن زۆر لەو مەسەلەیە نزیك نەبووەوە وەکو ئەوەی دواتر

ماركس لێی نزیك بووەوە. سەرباری ئەوەی كە سان سیمۆن هەمان شێوەی ماركسی بینی چۆن سەرمایەداری جێگای خانەدانێتی دەرەبەگایەتی گرتۆتەوە، هەستی كرد ناشێت راستی ئەوە بسەلمێنرێت كە چینی كرێكار بێت و جێگای سەرمایەداران بگرێتەوە. زۆرێك لە بیروراكانی سان سیمۆن لە بەرهەمەكانی (كۆمت")دا دەبینرێن، بەلام كۆمت لە شێوەیەكی زۆر سیستاماتیكانەدا پەرەی پێداون. (بروانە پیكەرینگ 1997).

ئۆگۆست كۆمت (1798–1857). كۆمت یەكەمین كەس بوو كە زاراوەی كۆمەڵناسی بەكارهێنا (بروانە پیكەرینگ: لەسەرو بەندی دەركەوتندا). كۆمت كاریگەرییەكی بەربلاوی لەسەر خاوەن بیردۆزانی كۆمەڵناسی دوایی هەبوو (بەتایبەتی هێربێرت سپێنسەر و ئیمیلی دۆركایم). كۆمت بڕوای وا بوو كە توێژینەوەی كۆمەڵناسی دەبێ زانستی بێت هەر چۆن زۆر خاوەن بیردۆزی كلاسیكی ئەوەیان كردووە و زۆربەی كۆمەڵناسە هاوچەرخەكانیش ئەوە دەكەن. (بروانە لینزەر – 1975).

كۆمت تا ئەندازەیەكی زۆر بەهۆی گێرەشێوێنی كۆمەڵگای فرە پەلهاوێشتووی فەرەنسییەوە دووچاری بێزاری هات و بووە جێگای رەخنەی ئەو بیرمەندانەی كە بنەمای رۆشنگەری و شۆرش هەردووكیانیان دانابوو. كۆمت تێروانینی زانستی خۆی پەرەپێدا كە ئەویش پۆزەتیڤیزم یان فەلسەفەی پۆزەتیڤە، ئەویش بە مەبەستی خەباتكردن دژی ئەوەی كە بە فەلسەفەی خراپ و روخێنەری داناوە لە رۆشنگەریدا.

كۆمت لەسەر ئەو هێڵە بوو، هەروەها كاریشی لێكرا لەلایەن كاسۆلیكی دژە شۆرشی فەرەنساوە (بە تایبەتی لەلایەن دی بۆناڵد و مایستری)یەوە، هەرچەندە كارەكانی ئەم بە لایەنی كەمەوە لەسەر دوو بنەما دوورن لە كارەكانی ئەوانەوە. یەكەم بیری نەكردۆتەوە لەوەی كە گەرانەوە بۆ سەدەكانی ناوەراست شتێكی شیاو بێت و بەرەو پێشەوەچوونی زانست و پیشەسازی بەلای كۆمتەوە ئەو گەرانەوەیەی كردۆتە شتێكی نەشیاو. دووەم كۆمت پەرەی بە سیستەمی زۆر پەرەسەندوی تیۆریدا لە چاو كەسانی پێش خۆیدا. ئەوەش شتێك بوو بەس بوو بۆ پێكهێنانی بەشێكی باشی كۆمەڵناسی سەرەتا.

كۆمت پەرەی بە فیزیای كۆمەلایەتی (سروشتی كۆمەلایەتی)دا یان ئەوەی كە لە ساڵی 1839دا ناوبرا بە كۆمەڵناسی (پیكەرینگ – لە سەروبەندی دەركەوتندا). بەكارهێنانی زاراوەی فیزیای كۆمەلایەتی روونی كردەوە كە كۆمت لە دوای نموونەیەكی كۆمەڵناسی گەراوە لە دوای "زانستە قورسەكانەوە" ئەم زانستە نوێیە كە لە روانینی ئەودا لە ئاكامدا بوو بە زانستی بالادەست پەیوەندی هەبوو بە هەردوو بواری جێگیری كۆمەلایەتی (بنیادە كۆمەلایەتیە باوەكان) و جوڵەی كۆمەلایەتیەوە (گۆرانی كۆمەلایەتی). سەرباری ئەوەی هەردووكیان گەران بە دوای یاساكانی ژیانی كۆمەلایەتیان لە خۆگرتووە، هەستی بەوە كرد كە جوڵەی كۆمەلایەتی زۆر گرنگترە لە جێگیری كۆمەلایەتی. ئەم جەختكردنە لەسەر گۆرانكاری بایەخی ئەوەی بە چاكسازی كۆمەلایەتی دەرخست، بە تایبەتی چاكسازی ئەو نەخۆشیانەی كە شۆرشی فەرەنسی و رۆشنگەری دروستی كردن. كۆمت داوای گۆرانكاری شۆرشگێرانەی نەكرد، چونكە هەستی كرد پەرەسەندنی سروشتی كۆمەلایەتی شتەكان باشتر دەكات. چاكسازی پێویست بوو تەنیا بۆ یارمەتی دانی پرۆسەیەكی بچوك.

ئەمەش بەرەو بنچینەی سەرەکی ڕێبازەکەی (کۆمت) دەمان بات واتە بیردۆزی پەرەسەندن، یان یاسای سێ قۆناغ. ئەم بیردۆزە پێشنیاری ئەوە دەکات کە سێ قۆناغی فیکری هەن کە جیهان بە درێژایی مێژوو پیایاندا ڕۆیشتووە. بە پێی کۆمت تەنیا جیهان نییە کە بەم پرۆسێسەدا تێدەپەڕێت، بەڵکو دەستەو کۆمەڵگا و زانست و تاکەکان و تەنانەت عەقڵیش بە هەمان سێ قۆناغدا دەڕۆن. قۆناغی ئایینزانی یەکەم قۆناغە و وەسفی جیهان دەکات تا ساڵی 1300 لەم سەردەمەدا گەورەترین سیستەمی فیکری جەختی کردەسەر ئەو بڕوایەی کە هێزە سوپەر ناچراڵەکان و هێما ئاینییەکان کە لە دوای ڕەگەزی مرۆڤەوە بوون بە نموونە لە ڕەگ و ڕیشەی هەموو شتێکدان. بە تایبەتی جیهانی کۆمەڵایەتی و فیزیکی وا دەبینرێت کە لەلایەن خوداوە پێشکەش کراون. قۆناغی دووەم قۆناغی میتافیزیکە کە کەوتۆتە نێوان ساڵی (1300 و 1800)ەوە. ئەم سەردەمە بەو باوەڕە وەسفکراوە کە هێزە ئەبستراکتەکانی وەکو "سروش" زیاتر لە بتە دانراوەکان بە شێوەیەکی واقیعیانە هەموو شتێك ڕاڤە دەکەن. لە ئاکامدا ساڵی 1800 جیهان پێی نایە قۆناغی پۆزەتیڤیزمەوە کە ئەم قۆناغە بە هۆی بڕوا بوون بە زانستەوە وەسفکراوە. ئێستا خەڵك ئارەزووی ئەوەیان هەیە کە دەست بەرداری گەڕان بە دوای هۆکارە ڕەهاکاندا ببن واتە (خودا یان سروشت) و لە جیاتی چاودێریکردنی جیهانی کۆمەڵایەتی و فیزیکی خەڵك جەختی کردۆتە سەر گەڕان بە دوای یاساکانی بەڕێوەبردنی ئەو جیهانەدا.

ئاشکرایە کە لە بیردۆزەکە سەبارەت بە جیهان کۆمت جەختی کردۆتە سەر کارکەرە فیکرییەکان. لە ڕاستیدا کۆمت گفتوگۆی ئەوەی کرد کە پەشێویی فیکری هۆکاری پەشێویی کۆمەڵایەتی بووە. پەشێویی لە سیستەمە سەرەتاییەکانی بیروڕاوە سەرچاوەی گرتووە واتە (ئایین زانی و میتافیزیك) کە لە قۆناغی پۆزەتیڤیزمدا (قۆناغی زانست) بەردەوام بوونیان هەبووە. تەنیا کاتێ پۆزەتیڤیزم دەسەڵاتی گشتی بە دەست هێناوە کە هەڵگەڕانەوەی کۆمەڵایەتی وەستا بێت. چونکە ئەمە پرۆسەیەکی پەرەسەندن بووە، پێویست نەبووە هەڵگەڕانەوە و شۆڕشی کۆمەڵایەتی برەویان پێبدرێت پۆزەتیڤیزم سەریهەڵدا، هەرچەندە لەوانەیە ئەو دەرکەوتنە بەو جۆرە خێرا نەبووبێت وەکو هەندێ کەس حەزیان لێیەتی. لێرەدا چاکسازی کۆمەڵایەتی کۆمت و کۆمەڵناسیەکەی پێکەوە دەگونجێن. کۆمەڵناسی توانای گەیشتنی پۆزەتیڤیزم خێرا بکات و لەوێشەوە ڕێکخستن لە جیهانی کۆمەڵایەتیدا فەراهەم بکات. لە سەرووی هەموو ئەمانەوە، کۆمت نەیوویست وا دەرکەوێت کە شۆڕش پەیڕەو دەکات. لە ڕوانینی ئەوەوە پەشێوییەکی تەواو لە جیهاندا هەبوو. لە هەر حاڵەتێکدا و لە تێڕوانینی (کۆمت)ەوە ئەوەی پێویست دەبوو گۆڕانکاری فیکری بوو، لەبەر ئەوە هۆی کەم هەبوو بۆ شۆڕشی کۆمەڵایەتی و سیاسی.

ئێمە پێشتر ڕووبەڕووی هەندێ لەو هەڵوێستانەی کۆمت بووینەوە کە گرنگی گەورەیان هەبووە بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵناسی کلاسیکی – لەوانەش بیردۆزی پارێزکاری سەرەکی و چاکسازی و زانیاری و ڕوانینی پەرەسەندووانەی بۆ جیهان. هەندێ لایەنی تری کارەکانی شایانی ناوهێنانن چونکە دەورێکی گەورەیان بینیووە لە پەرەسەندنی بیردۆزی کۆمەڵناسیدا. بۆ نموونە کۆمەڵناسیەکەی کۆمت جەخت ناکاتە سەر تاکەکەس بەڵکو تاکە

کـەس وەکـو یەکەیـەکی بنـەڕەتی وەردەگرێـت بـۆ شـیکردنەوەی پێکهاتـەی گـەورەتری وەکـو خێـزان. دیسـان کۆمـت سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی کـە ئێمـە سـەرنجی هـەردوو لایـەنی بنیـادی کۆمەڵایـەتی و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بدەین. بەهۆی گرنگیدانێکی زۆرەوە بە بیردۆزی کۆمەڵناسی دوایی، بە تایبـەتی لـە بەرهەمـەکانی سپێنسـەر و پارسۆنسـدا جـەخت دەکرێتـە سەر بۆچوونی کۆمـت لـە بارەی خاسێتی سیستاماتیکانەی کۆمـەڵگاوە واتـە پەیوەندییـەکانی نێوان پێکهاتـە جۆراوجۆرەکانی کۆمـەڵگا. هـەروەها کۆمت بایـەخێکی زۆری داوە بـە دەوری ڕێککـەوتنی دەسـتەجەمی لـە کۆمـەڵگادا. ئـەو بـە هێنـدگرتنێکی بچووکی بینیووە لەو بیروڕایەدا کە کۆمـەڵگا بـەهۆی ناکۆکییـــەکی رەتنـــەکراوەی نێـــوان کرێکـــاران و سـەرمایەدارانەوە وەسـف کـراوە. سـەرباری ئـەوە، کۆمت جەختی کردۆتە سەر پێویسـتی بەکارهێنانی بـــە بیردۆزکردنـــی ئەبســـتراکتیانە و دەرچـــوونە دەرەوە و ئەنجامـدانی توێژینـەوەی کۆمەڵناسـیانە. کۆمت بە توندی داوای ئەوەی کرد کە کۆمەڵناسان چـاودێریکردن و ئەزموونگـەرێتی و شـیکردنەوەی بەراوردکارانـەی مێـژوویی بـەکاربهێنن. لـە کۆتایـدا کۆمـت بـڕوای وابـوو کـە کۆمەڵناسـی لـە ئاکامـدا بووەتـە هێزێکـی زانسـتی باڵادەسـت لـە جیهانـدا ئـەویش بـەهۆی توانـای دیارییـەوە بـۆ راڤـەکردنی یاسـا کۆمەڵایەتییـەکان و بـۆ بـەرەو پێشـەو بردنـی چاکسـازی بـە مەبەسـتی چارەسـەرکردنی کێشـەکان لە سنووری سیتەمەکەدا.

کۆمـــت لـــە بـــەرەی پێشـــەوەی پەرەســـەندنی کۆمەڵناسـی پۆزەتیڤیزمـدا بـوو (برایـەنت – 1985، هـــافپێنی – 1982)، بـــەلای جۆناســـان تێرنـــەرەوە پۆزەتیڤیزمی کۆمت جـەختی کـردە سـەر ئـەوەی کـە (گـەردون) جیهـانی کۆمەڵایـەتی کـە ملکەچـە بـۆ پەرەســەندنی یاســا ئەبســتراکتەکان دەتوانرێــت لــە ڕێگای کۆکردنـەوەی بەئاگایانـەی زانیارییـەوە تاقی بکرێتەوە، ئەم یاسا ئەبستراکتانە ئاماژە دەکات بـۆ خاســـێتە بنـــەڕەتی و دیارەکـــانی گـــەردونی کۆمەڵایەتی و ئەمانیش پەیوەندی سروشتی خۆیـان دیاری دەکەن.

وەك دەبیـنین ژمارەیـەك لـە خـاوەن بیردۆزانـی کلاســـیك (بەتایبـــەتی سپێنســـەر و دۆرکـــایم) بەشـــدارییان کـــرد لـــە بایەخـــدانی (کۆمـــت)دا لـــە ئاشـکراکردنی یاسـاکانی ژیـانی کۆمەڵایەتیـدا. لـە کاتێکدا پۆزەتیڤیزم لـە کۆمەڵناسی هاوچەرخدا بـە گرنگی دەمێنێتەوە، بەڵام کەوتۆتە بەردەم هێرشەوە لە چەند لایەکەوە. (بڕوانە مۆرۆ – 1994).

تەنانـەت سـەرباری ئـەوەی کۆمـت بنەمایـەکی پتـەوی ئـەکادیمی نـەبوو کـە لەسـەری قوتابخانـەی بـیردۆزی کۆمەڵناسـی کـۆمتی (ئۆگۆسـت کـۆمتی) بنیـــاد بنێـــت، لەگـــەڵ ئەوەشـــدا بنەمایـــەکی بـــۆ گەشـــەکردنی ئاراســـتەیەکی گرنگـــی بـــیردۆزی کۆمەڵناسـی دانـا، بـەڵام بایەخـدانی درێژخایـەنی کۆمـت لـە لایـەن جێگیرەوەکەیـەوە لـە کۆمەڵناسـی فەرەنســیدا و لــە لایــەن میراتگــری ژمارەیــەك لــە بیروڕاکانیـــەوە بچـــووك دەکرێنـــەوە کـــە ئـــەو جێگرەوەیـەش ئیمیلـی دۆرکایمـە. (لـە پێنـاوی گفتوگۆیەکدا لەسەر دان نان بە دۆرکایمدا، هەروەها خـــاوەن بـــیردۆزە کلاســـیکیەکان، لـــە بەشـــی دواتـردا گفتوگـۆ دەکرێـت، بڕوانـە پارکـەر 1997 و مۆزیلیز 1997.).

## سەرچاوە

George Ritzer. Sociological Theory, fifth edition, New York, 2000, p.p. 10-15.

# شار لە ڕۆمانی عەرەبیدا

## فەسڵێك لە كتێبی (گەشتی تیشكێك)

عبدالرحمن منیف

لە عەرەبییەوە: شیرین. ك

وێنــەی شــار لــە ڕۆمــانی عەرەبیــدا هێشــتا تەمومژاوییــە, هەنــدێجاریش لێڵــە, چونكە زۆربــەی ئــەوەی ســەبارەت بــە شــارە عەرەبییــەكان نوســراون گشتگیرن یـان نوسینێكن لـە دەرەوەو لـە دوورەوەی ئــەو شــارانەدان, تــەنیا نــەجیب مــەحفوزو ئــەو شەیداییەی نەبێت كە ئالوودەیە بە نوسین سەبارەت بــە قــاهیرە بەتایبــەتیش ســەبارەت بــە گەڕەكــە كۆنــەكانی, زۆربــەی ئــەو ڕۆمانــە عەرەبیانــەی ســەبارەت بــە شــار نوســراون ڕەنگدانــەوەی واقیعــە زیندووەكەی و تانوپۆ بەیەكداچووەكەی ئەو شارانە نین, بەشێوەیەكی كەم نەبێت, تەنانەت دەتوانین بە دەستكاریكردنێكی كەم و گۆڕینی نـاوی شـارێك بـە شارێكی تر هەریەك لەو شارانە بتوانێ جێی ئەوی دی بگرێتەوە بێئەوەی شتێكی ئەوتۆی لێبگۆڕدرێ یـان هەسـت بـە جیاوازییـەكی بنـەڕەتی بكـەین لـە نێوانیانــدا, كەچــی دەتــوانین چــەندین شــاری ئــەوروپایی و چــەندینی تــری ئەمــەریكایی بــە وردەكارییەكانیانـــەوە بناســـینەوە, لـــەڕێی خوێندنــەوەی ڕۆمانــە ڕۆژئاواییەكانــەوە دەتــوانین نـاوی چەندین شوێن و جێگەو مێژووی شارگەلێك شـارەزابین, ڕەنگـە تووشـی سەرسـوڕمانیش نـەبین كاتێ سەردانی هەندێك لەو شارانە دەكەین دەبینین ئـەو وێنەیـەی لـە یادەوەریمانـدا بۆمـان كێشـاوەو ئەوەی بە چاو دەیبینین جیاوازییەكی جەوهەری و گەورەیان لەنێواندا نییە.

ئەمەش بە مانای ئەوە دێ كە چەمك و وێنـەی شار لە ڕۆمانەكانی تردا ئاشكراترو جێگیرترە وەك لەوەی لە ڕۆمانە عەرەبییەكاندا دەیبینین, هـەروەها بــەو مانایــەش دێ كــە شــێوازی خســتنەڕوو و نیشـاندانی شـار یـان بەشـێك لـە شـار لـە ڕۆمـانی عـەرەبی و ڕۆژئاواییـدا جیـاوازن، چونكە سروشـتی پەیوەندییەكەو دواتریش تێڕوانینـی هـەر لایـەكیان

بۆ شار تایبەتمەندە گەر نەڵێین جیاوازە, شوێن لە ڕۆمانی عەرەبیدا بە تایبەتی شوێنی ئاشنا زۆربەی جار لە یادەوەرییەوە سەرچاوەی گرتووە, زیاتر لەوەی لە ناسین و تێڕوانینی ڕاستەوخۆوە هاتبێت, لەبەر ئەوە شتەکان و شوێنەکان بەیەکدادەچن و تێکەڵ دەبن, ئەوەی زیاتریش شتەکان تێکەڵ دەکات ئەو تێڕوانینە شاعیرانەیەیە کە نووسەرانی ڕۆمانی پێناسراوە, لای ئەوان بابەتەکە دەبێتە مەجازو لاشیان وایە ئەوە گشتگیرترو کاریگەرترە لەبەرئەوە وێنە واقعیەکە دوور دەکەوێتەوە و وێنەیەکی گریمانەیی جێی دەگرێتەوە, ئەم وێنەیەی دواییش تێکەڵەیەکە لە ئارەزوو, خەون, واقیع, ئەمەش دووجار تێڕوانینەکە دەشڵەژێنێ و نازانرێ ئاخۆ نووسەر مامەڵە لەگەڵ شوێنێکی واقعیدا دەکات یان لەگەڵ شوێنێکی لە خەیاڵ خوڵقاودا, ئاخۆ مەبەستی ئەم شارەیە یان شارێکی دی, خۆ لەوانەشە هەر شارێکی تەواو بە خەیاڵ دروستکراو بێت.

ژمارەی ئەو شارە عەرەبییانەی تیایدا تووشی ئەم حاڵەتە دەبن کەم نین، کە نووسەر باس لە شارێك دەکات, هەر شارێك بێئەوەی مەبەستی شوێنێکی جوگرافی تایبەت بێت کە ڕووداوەکانی تیا ڕوودەدا, چونکە نوسەر مەبەستی ڕووداو و کارەکتەرەکانە و بەلایەوە ئەوە هەموو شتێکە، لەوە بترازێ کەمبایەخ و زیادەیە، ئەمەش وایلێدەکات شوێنە جوگرافییەکە پشتگوێ بخات یان گوێنەدا بە وێنەکێشانی وردەکارییەکانی ئەو (شانۆ)یەی ڕووداوەکانی لەسەر ڕوودەدا, دەبێ ئاماژەش بەوە بکرێ و جەخت لەسەر ئەوەش بکرێتەوە کە شوێن هیچی کەمتر نییە لە ڕەگەزەکانی تری ڕۆمان, هەر شوێنە قەوارەیەکی ڕاستەقینە دەدا بە ڕۆمان و تاموچێژێکی تایبەتمەند دەداتە ڕووداو و کارەکتەرەکان کە لە ئەنجامدا ڕۆمانێك لە ڕۆمانێکی تر جیا دەکاتەوە.

ئەو ڕۆمانە عەرەبییانەی بەم خەوشەوە ناسراون کەم نین, دەتوانین بیشیگەڕێنینەوە بۆ چەند هۆیەك, یەکەم شت مەسەلەکە پەیوەندی بە تەمەنی ڕۆمانی عەرەبییەوە هەیە گەر بە ڕۆمانی ئەوروپایی بەراورد بکەین, لەلای عەرەب ڕۆمان هێشتا ڕەگەزێکی ئەدەبی تازەیە لەچاو شیعردا, کەواتە پێویستی بە زەمەن و ئەزموون و کەڵەکەبوون هەیە تا ڕۆمانی عەرەبی بتوانێ ببێتە خاوەنی ئەدگاری خۆی و ئەو کەموکوڕییانە تێپەڕێنێ کە تووشی ئەزموونە سەرەتاییەکانی بوون, هەر بۆیە کاتێ ڕۆمانی عەرەبی بەراورد دەکەین بە ڕۆمانی ئەو وڵاتانەی لە پێش ئەمانەوە دەستیان داوەتە ڕۆمان دەبێت ڕەچاوی ئەو جیاوازییە بکەین و بە هەند وەریگرین, دووەم دەبێت ئاوڕ لەو تایبەتمەندییە بدەینەوە کە یادەوەری عەرەبی پێ جیادەکرێتەوە, لێرەدا ئاماژە بۆ یادەوەری مێژوویی دەکەین, کە ئەویش یادەوەری کۆچەری بۆماوەییە, هەرچەندە ئەو یادەوەرییەش کاتی بەسەرچووە و دەبێ تێپەڕێنرێ, ئەو یادەوەرییەی هێشتا ئەدگاری بیابانی هەڵگرتووە, فراوانی بیابان و لەیەکچوونی بەشەکانی, ئینجا ئەو بۆشاییە پان و بەرینەی لە نێوان جێگایەك و جێگایەکی تریدا هەیە بێئەوەی هیچ شوێنێك شتێکی تیابێت لەوی دی جیابکاتەوە سەرەڕای ئەو گەڕانە بەردەوامە بەدوای ژیان و ئازادیدا, کە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر گەڕان بووە بەدوای لەوەڕگە و ئاودا, دواتر چەندین هۆکاری تری بۆ

زیاد کراوە ئەم شتانەو چەندینی تر لەگەڵ ئەو گۆڕانەی لەچاو رابردوودا روویداوە, کاریگەرییە دەروونییەکانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووەو رێی بە گوزارشتکردنەکانی داوە دزە بکات بۆ سەردەمەکانی تر گەر بە نهێنیش بووە, دواتریش ئەنجامەکانی گەر بە پۆشراویش بووە دزە بکاتە ناو یادەوەرییەکانییەوە, لەوانەش بینینی شوێن بەسەریەکەوەو بەگشتی وەردەگیرێ, ئەمە بەسەر شارداو ئەو نوسینەی لەبارەشییەوە دەنووسرێ شکاوەتەوە.

ئەوەی زیاتر ئەم وێنەیە تەمومژاوی دەکاتو چەندین رەهەندی مادی پێدەبەخشێ, ئەوەیە کە شارە عەرەبیە هاوچەرخەکان بەخۆیانو پێکهاتەو پەیوەندیەکانیانەوە هێشتا گەلێك پێکهاتەو پەیوەندی پێش بەشاربوونی هەڵگرتووە, واتە ئەو شارانە هێشتا لە قۆناغی نەشو نماو دروستبووندان, لەبەرئەوە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری پەیوەندییە ناشارییەکانەوە.

ئەگەر بەغدا بە نموونە وەرگرین دەبینین شارەکە هەرچەندە فراوانەو ژمارەی دانیشتوانی چەندین جار زیادی کردووە لە چاو سەردەمانی پێشوودا کەچی هێشتا ئەم شارە کەوتۆتە ژێر باری پەیوەندییە ناشارییەکانەوە لەبەرئەوەی درێژکراوەی ئەو گوندو شارۆچکانەی دەوروبەریتی, بەڵکو لەوەش زیاتر کاتێ خەڵکی هەر گوندێك یان شارۆچکەیەك دەچنە بەغدا تا بەیەکجاری لەوێ نیشتەجێبن, دەچنە ئەو گەڕەکانەی کە پێشتر خەڵکی ناوچەکەیان لێی نیشتەجێبوون یان ئەو گەڕەکانەی لێوەی نزیکن, ئەوەشمان لەبیر نەچێت ئەوانەی پێشیان کەوتوونو هاتوونەتە شار هێشتا گەلێك لەو ئەدگارو پەیوەندیانەیان لەلا ماوەتەوە کە لە شوێنەکانی پێشوویان پێی ئاشنا بوون, تێکەڵبوونیشیان بە خەڵکانی تر خاوو خلیچكو سنووردارە, ئەم ئەدگارانە هێشتا روونو کاریگەرن, هەر ئەمەش شاری گەورە دەکاتە چەند کۆمەڵەیەکی بەتەنیشت یەکەوە زیاتر لەوەی شارێك بێتو بتوانێ پێشوازی لە زۆرترین کەس بکاتو جارێکی تر بەپێی مەنتیقو پەیوەندییەکانی خۆی بیانخولقێنێتەوە هەروەکو چۆن شارە گەورەکانی ئەورووپا دەیکەن کە لە ماوەیەکی کورتدا دانیشتووەکەی دەکاتە یەکێك لە رۆڵەکانی خۆی تەنانەت زیاتر لەوەی رۆڵەی ئەو شوێنە بن کە تیا لەدایکبوون.

ئەم حاڵەتە بە هەموو دیاردەکانییەوە لە شوێنی تردا کتو مت دەیبینین, لە زۆر شاری تردا وەکو عەمان بە نموونە کە لەپرێکا گەورەو فراوان بووە, ژمارەی دانیشتوانی چەندین جار زیادی کردووە, بەڵام لە پەیوەندییەکانیدا هێشتا لە شارۆچکەیەك دەچێت کە لە نێوەندێکی کشتوکاڵیو شوانکارەییدایە, تەنانەت شێوەی درێژبوونەوە و فراوانبوونی لەرووی خانوو و بەرەوە هەروا لەخۆیەوە بووە بێ هیچ پلانێکی ئاشکراو تۆکمە, بەجۆرێك شارەکە بەم حاڵەی ئێستایەوە زیاتر لە کۆمەڵێ گوندی بەتەنیشت یەکەوە دەچێت وەك لەوەی لە شارێك بچێت, ئەو بۆشاییانەی لە نێوان شوێنێكو شوێنێکی تردا هەیە, ئەو پەیوەندییانەی لە نێوان خەڵکی گەڕەکەکانیدا هەیە, ئینجا شێوازەکانی ژیان و نەریتی خواردنو پۆشاك پۆشینو هەڵسوکەوتیان کە دوو شێوازی جیاواز وەردەگرێ کاتێ ئەو

خەڵکانە لە نێوەندە بازرگانییەکەدا دەبن بە جۆرێك ڕەفتار دەکەن کە بۆ ماڵەکانیشیان دەگەڕێنەوە بە جۆرێکی تر، کاتێ لە بازاڕ دەبن و خەریکی کڕین و فرۆشتن و مامەڵە دەبن زیاتر لە مەنتیقی شارەوە نزیکدەبن، بەڵام هەرئەوەندەی بازاڕەکەیان جێهێشت و مامەڵەی کڕین و فرۆشتن تەواو بوو یەکسەر دەبنەوە بەخەڵکی ئەو شارۆچکەوگوندانەی لێوەی هاتوون، لە ڕووی ئەو پەیوەندییانەوە کە بە خەڵکیانەوە دەیبەستێ یان وەکو ڕەفتارکردنیان لە شێوازی نانخواردن و قسەو هەڵسوکەوتدا، بەڕادەیەك وا هەستدەکەیت کە ئەمانە قەت ئەو گوندو شارۆچکانەیان جێنەهێشتووە کە لێوەی هاتوون، ئەمەش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئەوانە هێشتا هەر لەوێ دەژین بەڵام بەو ڕادەیە ئینتیمایان بۆی نییە.

ئەو سیفەتانەو هاوشێوەکانی لەزۆربەی شارە عەرەبییەکانی ڕۆژهەڵاتدا دەدۆزینەوە، بەتەنیا لە قاهیرە نەبێت، جگە لە بەیروت و ئەسکەندەرییەش بەڵام ئەوان بەشێوەیەکی جیاواز، ئەمەش وامانلێدەکات بگەینە ئەو باوەڕەی کە ئەو کۆمەڵە دانیشتوانە زۆرو زەوەندو گەورەیەی لە هەمان شوێندا دەژین زیاتر لەتەنیشت یەکەوە دەژین وەك لەوەی بەیەکەوە گرێدرابن یان ئاوێتە بووبن، واتە هێشتا لە پەیوەندییەکی شارییانەدا نەتواونەتەوە وەکو حاڵی شارە ئەوروپییەکان.

ئەو شێوازو ماوە زەمەنییەی شارە عەرەبییە هاوچەرخەکانی تێدا دروستبووە هێشتا ماوەی ئەوەی نەبووە پەیوەندییە شارییەکانی تیا دروست ببێت و بچەسپێت، لەبەرئەوە پەیوەندییە پێش شارییەکانی تیایدا زۆر ئاشکرایەو زیاتر کارلێکەری لەسەر شارە عەرەبییەکانی ئێستا هەیە.

ئەگەر وامانزانا کە ڕۆمان زادەی شارە هەروەکو مێژوونوسان و ڕەخنەگرانی ئەدەب جەختی لەسەر دەکەن یان لە سایەی ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەدا لەدایکبووە کە لە ئەوروپادا لە قۆناغی شۆڕشی پیشەسازیدا ڕوویدا، ئەم ڕۆمانانەی ئێستا لە ڕۆمانی سەرچڵییەکان و سوارچاکەکان و گۆڕانیبێژە گەڕۆکەکانەوە بەرەوپێشەوە چووەو لە قۆناغێکدا بووە بە ڕۆمانی ڕۆمانسی، لە قۆناغێکی تردا بووە بە ڕۆمانی سروشتی و لە قۆناغێکی دواتریشدا بووە بە ڕیالیزم، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوە بوو کە هەر قۆناغێك کۆمەڵێ گۆڕانکاری گەورە لەگەڵ خۆی دەهێنێ کە پەیوەندییەکان و تێڕوانینەکانیش دەگۆڕێ بەهۆی ئەو پەیوەندییە نوێیانەی لەنێوان خەڵکیدا دروست دەبن، گۆڕانی پەیوەندییەکان، تێڕوانین و هەڵوێستەکانیش هەروا بەپەلەو بەیەککەڕەت ڕوونادەن، بەڵکو ئەمە ئەنجامی کەڵەکەبوونێکی درێژخایەن و بەردەوامە کە شانبەشانی بەرەوپێشەوە چوون لە لەبیرکردنەوەو هۆکارەکانی گوزارشتکردندا ڕوودەدەن، ئەم مەسەلەیە هێشتا لەشارە عەرەبییەکاندا ڕووینەداوە، لەبەرئەوە شێوازی ڕوانین و مامەڵە کردن لەگەڵ شاردا لە ڕۆمانی عەرەبیدا ڕیتمێکی جیاوازی وەرگرت، یان بە ڕێچکەیەکی زەمەنی جیاوازدا ڕۆیشت لەچاو ئەوەی لە ڕۆمانی ڕۆژئاواییدا ڕوودەدا.

زۆربەی ئەوانەی سەبارەت بەشاری عەرەبی نووسیویانە ئەوانەن کە درەنگ وەختێك لە شار

نیشتەجێبوون, دواتر سەرژمێرییەك لەو بوارەدا دەتوانێ ئەم گریمانەیە بسەلمێنێ, ئەمەش مانایەكی سلبی نییە بەقەد ئەوەی وەسفی حاڵەتێكە كە هەیە, ئەو شارە عەرەبیانەی تا ئەم دواییانەش شاری گەورەی بازرگانی بوون, لای رۆڵەكانی تێڕوانینو هەڵوێستێكی دروستكردووە بەپلەی یەكەم پەیوەندی بە بازرگانییەوە هەبێت, بۆیە توانا بنەڕەتییەكان رووی لەم بوارە كردووەو هیچ شتێكی وای بۆ ئەفراندن بەتایبەتی رۆمانو شانۆ نەهێشتۆتەوە جگە لە كۆچ یا قایلبوون بەو پەراوێزە تەسكە, چونكە شاری عەرەبی لە سەردەمی خۆیدا لە قۆناغی نەشو نماكردنو فراوان بوونیا شێوەیەكی مەركەزی وەرگرتووە, دوای ئەوەی رۆڵێكی سیاسیش خرایە سەر رۆڵە بازرگانییەكەی, لەو كۆمەڵە هۆكارانەی كە دەبنە مایەی راكێشانی خەڵكی بەرەو شار ئەوەیە كە رووگەیەكە بۆ زانستو بەرزبوونەوەی ئاستی كۆمەڵایەتی چونكە بوارو ئەگەرەكان دەستەبەر دەكات لەچاو شارۆچكە بچووكەكاندا, لەبەرئەوە زۆر كەس لەبەر گەلێك هۆ یەكەمجار بەرەو شارە نزیكەكان كۆچیان كردووە دواتر بەرەو پایتەختو تیا نیشتەجێ بوون, ئەمەش لەكاتی گۆڕانكارییە خێراو هەندێجار كوتو پڕو توندوتیژەكاندا روویداوە كە بەسەر ناوچەی عەرەبیدا بەدوای یەكدا هاتوون, ئەمە وایكردووە مانەوە لە شوێنی نوێدا شتێكی زیندو و خۆشو بەرفراوانیش بێت, رۆڵەی گوندەكان ئەوانەی هاتوونەتە شارە عەرەبییەكانو تیایدا نیشتەجێبوونو لە ئەنجامی جووڵەی یەك لەدوای یەكو خێرای كۆمەڵایەتی, كە چەندین شێوازی وەرگرتووە, بەشێكی گەورەی لەوانە كردووە بە بەشێك لە بونیادی نوێی دانیشتووانی ئەو شارانەو هانیداون كە ئەمەش مافی رەوای خۆیانە, بەدوای دەورێكو پێگەیەكدا بگەڕێن, چونكە یەكێك لە هۆكارەكانی جێگۆڕكێیان وشیاری بووە, ئەو وشیارییەی زۆریانی گۆڕیوە, ئەو وشیارییە بە چەندین جۆر تەعبیری لەخۆی كردووە, دیارە ئەدەبو هونەریش هەر لەو رێچكەیەدان, لەبەرئەوەی رۆمان شێوازێكی تایبەتی دەركەوتنە, رۆمان لە قۆناغەكانی دواییدا رۆڵی گەورەترو بایەخدارتر بووە, بەمجۆرە هەڵبژاردەیەك لەوانە بە رۆمان گوزارشت لەخۆیان دەكەن هەروەها بە رۆمانی شاریش.

رەنگە گشتگیركردنی ئەم مەسەلەیە هێشتا كاتی نەهاتبێت بەڵام نموونەكان دیارنو لە زۆر شاری عەرەبیدا هەیەو ئەم گریمانەیە دەسەلمێنێ كە زۆربەی ئەوانەی سەبارەت بە شاری عەرەبی نوسیویانە ئەوانەن لە لادێوە هاتوون.

لێرەدا كە باسی ئەو نووسینانە دەكەین هیچمان مەبەست نییە جگە لەوەی ئەو نووسینانە تاچەند توانیویانە وێنەی شار بگرنو چۆنیان دیوەو چۆن گوزارشتیان لێكردوون.

ئەو چاوە نامۆیە, واتە -ئەو نوێیەی- بەو شتە یان بەو شوێنە دەتوانێ بە ڕێگەیەكی جیاواز ئەو شتە یان ئەو شوێنە ببینێ وەك لەو چاوەی بەو شتو شوێنەوە لكاوە, ئەوەی ئەو چاوە رادەگرێ ئەوەیە كە پێشتر نەیدیوە, چونكە شتی نوێو جیاوازی تیا دەبینێ, ئەو چاوە یادەوەرییەكی بینینی-ی جیاوازە, دەتوانێ چەندین حاڵەتو چركە تۆمار بكات كە بۆ چاوێك یان یادەوەرییەكی نیشتەجێ بوو ئاساییو ئاشنا بێت, بێگومان

ئەمجۆرە بینینە نوێیە شتێکی نوێ زیاد دەکات، بەڵام لەو پرۆسەی پێوانەکردن‌و دۆزینەوەیەدا وەکو تێڕوانینێکی دیوی دەرەوە دەمێنێتەوە، لەبەرئەوە لەکاتێکدا شتەکان تۆمار دەکات زۆر شت لەبیر دەکات یان زۆرشتی پێش یەکەم بینین‌و لەوانەشە دوای یەکەم بینین پشتگوێ بخات.

بەوپێیەی شار زۆربەی کات سەخت‌و داخراوە، خۆی بە تویکلێکی رەق داپۆشیوە، باوەش بۆ ئەو کەسە ناکاتەوە کە تازە هاتووەو نهێنی خۆی بۆ نادرکێنێ، کلیلەکانی ناداتە دەستی بەم پێیەش ئەو هاتووە جوانییەکانی شار نابینێ، تەنیا رووکەش دەبینێ یان ئەوەی شار بە خواستی خۆی بۆی نمایشدەکا یان ئەو هاتووە دەتوانێ پێیبگات، شاریش بەتەنیا شتە بینراو و بەردەستەکان نییە، بەڵکو ئەو شتانەشە کە لەپشتییەوە هەن، بەمجۆرە شار دەبێتە دوو شار یەکێك ئاوەڵایە، ئەوی تریان خۆی بە چەندین بەرگی ئەستوور دادەپۆشێ لەبەردەم نامۆو هاتووەکاندا، نامۆو هاتووەکان دەبێت پیتەکانی شار فێربن، ئەمەش پێویستی بە کات‌و سەبرو تێکۆشانە ئەگەر ئەو کەسە هاتووە زوو دەستی کرد بە نووسین سەبارەت بەو شارە، یان بەتەنیا بە سەیرکردن‌و بینین رازی بوو دەستی کرد بەگێڕانەوە، لەو حاڵەتەدا ئەو نوسەرە باسی جۆرە پیتێکی جیاواز دەکات‌و هەر دەرەوەش دەبینێ، چونکە ئەو کەسە رووکەشەکەی تێنەپەڕاندووەو لە شتی سەیرو سەمەرەو خۆش زیاتری نەدیوە، لە زۆربەی رۆمانی ئەو کەسانەی لە لادێوە هاتوون بۆشار دەبینین کە رووداوو کارەکتەرەکان لە شوێنە گشتی‌و کراوەکان تێپەڕ ناکەن، یان لە پەراوێزدا روودەدەن یان لەناو هاتووەکان خۆیانداو بەمەش وێنەکەی تری شار بزر دەبێت کە لەوانەیە وێنە راستەقینەکەی بێت، یان ئەو رۆمانانە هەر لە دیوی دەرەوە وێنەی ئەو شارانە دەگرن ئەمەش وادەکات وێنەی ئەو شارە لە باشترین حاڵەتیدا وێنەیەکی ناتەواوی کاڵ‌و کرچ بێت، چونکە هەر لە دوورەوە گیراوە، بەبێ ئەوەی ئەو پیتانەی کە حوکمی پەیوەندییە ناوخۆییەکان دەکەن فێربووبێت، ئەو پیتانەی تام‌و چێژو ئەدگار دەدا بەهەر شارێك‌و بەمجۆرەش لە شارەکانی تری جیادەکاتەوە.

راستە قاوەخانەو هەندێجاریش باڕو نایتکلەپەکان شوێنی یەکترناسین‌و یەکتر بینینە، بەو پێیەی شوێنی گشتین‌و ژمارەیەکی زۆر خەڵك لەخۆیان کۆدەکەنەوە، لەڕێی ئەو شوێنانەوە دەتوانین چەندین وێنەو نموونە وەرگرین کە لایەنێك لەو شەبەنگە کۆمەڵایەتیەی خەڵك دەرئەخات، بەڵام ئەو شوێنانە، رەنگدانەوەی واقعی شار نین‌و گوزارشت لە حەقیقەتی ناکەن، چونکە شار وەکو مرۆڤ وایە، چەند چینێکی کەڵەکە بووەو یادەوەرییەکی بۆماوەیە، لەبەرئەوە هاتووە نوێیەکە ناتوانێ بەناخیدا رۆبچێت‌و بگاتە حەقیقەتەکەی پاش ماوەیەکی زۆرو بەزەحمەت نەبێ، ئەوەی سەرنج رادەکێشێ ژمارەی ئەو رۆمانانە کەم نین کە رووداوەکانی یان کارەکتەرەکانی لەو شوێنانەوە وەردەگیرێن، لەبەرئەوە لە ئەنجامدا ئەو رۆمانانە پەراوێزکەوتوو و ناتەواو دەبن چونکە هەر بەناو نمایشی شار دەکەن.

ئێمە لێرەدا باس لە لایەنی هونەری ئەو رۆمانانە ناکەین بەڵکو هەوڵدەدەین بزانین چۆن لەو

ڕۆمانانەدا شار بینراوە واتە چۆن وێناکراوە, بڕی ڕاستیو وەهم تیایدا چەندە, شار, هەر شارێك تانو پۆیەکی ئاڵۆزو بەیەکدا چووە, لە چەندین چینی کەڵەکەبوو پێکهاتووە کە تیایدا بە ژیانێکی دوورو درێژو هەوڵدانێکی بەردەوام نەبێت ناگەیتە ناخی, هەروەها بە خۆشەویستیو حەزی فێربوونیش.

ڕاستە چەندین ڕۆمان هەیە, هەرچەندە ژمارەیان هەر کەمە, شاری عەرەبی تیایاندا ڕەنگیداوەتەوەو لە یەکێك لە دەرکەوتنەکانیدا وێنایان کراوە, بەڵام زۆربەی ئەو ڕۆمانانە دیلی ڕابردوون لەپشت یادەوەریو سێبەرو تانوپۆی شتەکانەوە خۆیان مەڵاس داوە, ئیتر ئەو شتانە مرۆڤ بن یان دارو درەختو گوڵ, ئەمەش وەکو بەرگرییەك لە ڕابردوویەك کە ناگەڕێتەوە, بەم پێیەش شارێکی وەهمی وێنا کردووە, ئەو شاری ڕابردووەی بونێکی واقعی نەماوە, ئەمەش هەڵاتنە لە تۆمارکردنی شاری ئەمڕۆ بەهەموو ململانێو دژواریو دیاردەکانیەوە, بەمجۆرەش دەبینین وێنەی شار لە ڕۆمانی عەرەبیدا هێشتا لێڵ و تەمومژاوییە, چونکە تێکەڵەیەکە لە گوندو هەڵویستی ڕەتکردنەوە, چونکە نە جومگە ڕاستەقینەکانیو نە ئەو دیاردانەی ئەدگارە بنەڕەتییەکان دروست دەکەن وەرنەگیراون, ئەمەش خۆی بۆ خۆی تەحەدایەکە بۆ ڕۆمانی عەرەبیو ڕۆماننووسە عەرەبەکان چونکە ئێمە پێویستمان بەوەیە باس لە شاری ئەمڕۆ بکەین, نەك شاری ڕابردوو وەهم, ڕەنگە ئەم تەحەدایە هاندەرێك بێت بۆ ڕۆمانی نوێ کە ڕەنگە لە داهاتوویەکی نزیکدا, ڕۆمانی وادەرکەوێ تووشی سەرسوڕمانمان بکاتو نووسەرەکەشی بڵێ: ها ئەوە منو ئەوەش شارەکەم.

## سەرچاوە

کتێبی گەشتی تیشکێك-ی عبدالرحمن منیف.

# ئەناتۆڵ فرانس لەنێوان هیومانیزم و سێپتیسیزم (1)

لە فەرەنسییەوە: جەلال حەمید

ئـەناتۆڵ تیبـۆ کـە پاشـان نازنـاوی ئـەناتۆڵ فـرانس وەردەگـرێ لـە سـاڵی 1844 لـەدایك بـووە، کـــوڕی کتێـــب فرۆشـــێکی ســـەر وێســـتگەی شەمەندەفەری مالا کێیەو هەر لەمنداڵیەوە خولیای خوێندنـەوەی پـەرتووك و بەڵگەنامـەکانی دەکەوێتـە سـەر و هـۆگری لەگـەڵ سـەردەمی کلاسـیك پەیـدا دەکات. سەرەتا لەچاپخانەی لۆفیغ سەرقاڵی کاری لێکۆڵینەوە دەبێت و هۆنراوەی پار ناسی و_ چامە زێڕینـــەکان، 1873_ و پاشـــان هۆنراوەیـــەکی درامـاتیکی لـەژێر ناونیشـانی_ زەماوەنـدەکانی کۆرنتی، 1876- بڵاودەکاتەوە. وەك لۆکۆنت دولیل دەکرێتـە نهێنـی پـارێزی کتێبخانـەی ئەنجوومـەنی پیران. لەگەڵ نووسینی_ تـاوانی سلڤسـتەر بۆنـاغ، 1881- ڕێچـکەی ڕاسـتەقینە لـە ڕۆمـانی تـەنز ئـامێزی ڕەنگرێـژراو بـە هیومـانیزم و فەلسـەفەی سـێپتیك دەدۆزێتـەوە_ بڕوانـە، شارسـتانیەتی فەرەنسی، سەدەی نۆزدەیەم، ل560_ و پاشان لە کتێبـی_ هاوڕێیەکەم، 1885_ باسی یاداشتەکانی منـداڵی دەکـات و لـە _thais، 1889 _ خـۆی لـە قـەرەی ڕۆمـانی مێـژوویی دەدات و پاشـان لـە _برژێنخانەی شاژنە پیرۆك، 1892-و- بیروڕاکانی ژێغـۆم کوانیـاغ، 1893-بـۆ چـیرۆك و ئەفسـانە فەلســـەفیەکان دەگەڕێتـــەوە. حـــەزو ئـــارەزووە کلاسـیکیەکانی لەهـەمان سـەردەم لـە تـوێی هەواڵـە ووردکارییـەکانی وەك-ژیـانی ئـەدەبی و ڕۆژنامـەی زەمـــان، 1887_1893_ دوو پـــات دەبنـــەوە. دوابـەدوای ڕۆمانـە خۆشەویسـتیە نەویسـتراوەکەی کـە سـروش لـە پەیوەنـدی خـۆی و مـەدام کایاڤێ وەردەگـرێ و لـەژێر ناونیشـانی_ گوڵـە شـلێری سوور، 1894_ کۆمەڵێك بیرۆکەو پەندی گوماناوی لـە _باخچەی چێژ، 1894_ دەنووسێ. ڕوودەکاتە سروشـە هەڵبژاردەکـەی لـە بەرهـەمی_ ڕەشـەداری مێکوت، Le manneqquin dosier، 1897_ کە دوو بـــەرگی یەکـــەمی کتێبـــی مێـــژووی هاوچـــەرخ پێکدەهێنێ و بـریتین لـە سـاتیرێکی گاڵتـە ئـامێزی سـەر سـەخت و تـەنراو بـە سەرکێشـی ئـایینی و گاڵتـەجاڕ بـە شارۆچـکەی هەرێمـەکان. لـە سـاڵی 1897 وەرچـەرخانێکی گـەورە لـەبواری کارەکەیـدا

دەبینێ و بۆ ماوەیەکی کوورت خایەن گوومانکارییە هەڵبژاردەکەی بواری دەدات ڕەخنەی توونـد لەگەندەڵی و حوکمە پێشینەکان بگرێ و ڕووداوە هاوچەرخەکان خێرا لە پێناوی وەدەرخستنی ئەم بزاڤە کار دەکەن:

1-**لایەنگرانی دریفۆسی ئەفسەر:**

لەسەرەتای مەسەلەی دریفۆس کە ئەو ڕاستیە لەلایەن دادگاوە گەورە دەکرێتەوە ئەناتۆڵ فرانس کێشەکە لە قاڵبێکی تەنز ئامێز دادەڕێژێ و بۆ پیاچوونەوەی داوانامەکە لایەنگری زۆلا دەکات. ئیتر لەو کاتەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر بەشداری لە بەرابەرییە ڕامیارییەکان و پشتگیری سۆشیالیستەکان دەکات و لە دووایین ڕۆژگارەکانی تەمەنی پەیوەندی بە بزاڤی کۆمۆنیستی تازە دەرکەوتوو دەکات و هەروەها بەشێوەیەکی ڕەوان پاڵپشتی لە چالاکی کۆماریخوازەکان و جیاکردنەوەی کڵێسەکان لە دەوڵەت دەکات. هەر وەك شێوازی ساتیر ئامێزەکەی لە تویێی هەردوو بەرگی مێژووی هاوچەرخ فرە توونذوتیژ تر دەبێت وەك لە_ *L anneau d amethyst*, 1899 _و_ مەدام بێغـژوغێ لە پاریس, 1901_ دەردەکەوێ و هەروەها داخوازییە کۆمەڵایەتیەکان لە تویێی هەردوو بەرهەمی _کغانکۆبیل, 1902 _و_ لەسەر بەردی سپی, 1905_ ڕەنگدەدەنەوە.

2-**نائومێدی و ڕەشبینی:**

دوای نووسینی ژیانی _جان دارك, 1908_ نووسەر ڕوو دەکاتە ئەدەبی جەنگ بەڵام بەهۆی لەدەسچوونی مەدام گاڤایێ هاوڕێی کارەکانی ڕەخنە ئامێزترو ڕەشبینتر دەبن. بەبۆنەی شۆڕشی ڕوسیا لەساڵی 1905 و نزیکبوونی هەڵگیرسانی جەنگ لەساڵی 1914 چالاکی خەباتگێڕی بەرفراوانتر ئەبێ بەڵام دووچاری نائومێدییەکی قووڵ دەبێ بەهۆی نشووستی هێنانی شۆڕشگێڕە ڕووسیەکان و سەرهەڵدانی دژەکرداری سەندیکایی وەزارەتە کۆماریخوازەکان لەپاش گێڕانەوەی بێتاوانی بۆ دریغۆس و زایەڵەی ئەم ڕەشبینیە لە _دوورگەی بەتریق, 1908 _و_ ڕاپەڕینی فریشتەکان, 1914 _و_ خواوەندەکان تینوون, 1912_ دەردەکەوێ.

3- **خۆکێشانەوە لە بێشولغی:**

سەرکاری چاکەخواز کە بەخۆشەویستیەکی بێ پایانەوە پێشوازی لە قوتابیەکانی دەکرد لەگەڵ چەند دەستەیەك لەڤیلا سەیدەوە ڕوویانکردە تۆرین لەسەر خاکی بێشولغی. ئەم ئاشتیخوازە خوازیار نەبوو باوەڕ بە مەترسیەکانی جەنگ بکات و بە هەڵەکانی کاریگەر دەبێت و بەرامبەر بە گەوجێتی و خوێناوێتی مرۆڤەکان ترس و پەژارە دایدەگرێ بۆ لەبیرچوونەوەی ئەو مەترسیانە دووایین ساڵەکانی ژیانی بۆ زیندووکردنەوەی بیرەوەرییەکانی مناڵی لە _بەردی بچووك, 1918 _و_ ژیانی نێوگوڵ, 1922 _ تەرخان دەکات. کە خەڵاتی نۆبڵ لە ساڵی 1921 وەردەگرێ دەگاتە لووتکەی شکۆمەندی. لەساڵی 1924 کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی لە ڕێوڕەسمێکی نیشتمانی گەورەدا بەرەو گۆڕستان بەڕێدەکرێ.

## بیروباوەڕی

ئەناتۆڵ فرانس لە ماوەی نیوەی یەکەمی ژیانی بەشێوەیەکی تایبەتی گومانکارییە گاڵتەجارییەکانی دەخاتەڕوو و لە بۆتەی مۆرك و سیما گەلێکی خاوەن خولیا ئارەزووی ئابلۆوقەدانی خوێنەرەکانی دەکات و بەسانایی گەمە بە بیرۆکەکان دەکات و وێڕای ئەوەش کارەکانی لەڕووی شێواز لەوانەی ڤۆڵتێر دەچن کە

هێڵی بەرفراوانی دوکترینگەلێکی بەهێز پیشان دەدەن.

**1-سێپتیزمی عەقڵانی:**

گەر چێژە هوونەرییەکەی لەڕێگەی ڕوونکردنەوەی ئەفسانەو باوەڕە ئاینییەکان وەرگرتبێ ئەوا گومانکارییەکی بەشێوەیەکی تایبەت خۆی لەسۆنگەی بابەتە ئاینییەکاندا دەبینێتەوە. بەهۆی سۆفیگەری کریسچیانەوە بەرەنگاری چێژەکانی ئەبیقۆرییەکی نەرمونیان ڕادەوەستێ و گەلێ جار هێرش دەکاتە سەر کلێسەو تۆمەتی دەمارگیری ئایینی و دژایەتیکردنی دیموکراسی دەخاتە پاڵ.

**2- بیری سیاسی و کۆمەڵایەتی:**

ئەناتۆڵ فرانس بڕوای بە سروشتی چاکەخوازی مرۆڤ نەبوو و هەوڵی دەدا ئەو بڕیارە پێشینانە ڕیشەکێشکات کە ببوونە هۆی دواخستنی گەشەی لەسەرەخۆی مرۆڤ و لەو ئاقارەوە پەیتا پەیتا هەوڵی لەپێناو دەرباز بوون لەبنچینە بەربەرییەکەی دەخاتە گەڕ. لە زۆربەی کتێبەکانیا ساتیری توونـد لە جەنگ و دادوەری مرۆڤایەتی و ئامادەیی تێکڕای نایەکسانییەکان دەگرێ. لەبواری ڕامیاریدا هۆگری ئازادی دەبێت و حوکمی کۆماری بەچاکدەزانێ چونکە لە ڕژێمەکانی دی پتر ڕێز لە تاکە کەس دەگرێ. ئاواتە مرۆییەکانی دوورتر دەیانڕوانی و خەون بەڕژێمێکی سۆشیالیستی دەبینی کە ڕێگە بە مرۆڤ بدات ئازاد بێت لە دەستنیشانکردنی خۆشگوزەرانی خۆیدا وەك لە _مەدام بێغژغێ لە پاریس دا_ ڕەچاو دەکرێ: "پێم وایە... ماوەیەکی دوور هاووڵاتیانی سەر بەهەمان نەتەوە لەبری ئەوەی شمەکە پێویستیەکانی ژیان بەیەکسانی دابەش کەن کەچی بەتووڕەییەوە لێکدی دەستێنن و هەر وەك پێم وایە مرۆڤ گەر کەم کڵۆڵ بێت کەمتر دڕندە دەبێت و پێشکەوتنی پیشەسازی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن خاوییەك لەبوارەکانی ئاکارو پەیوەندییەکان بەرپا دەکات. من دەنگی سەرفرازی لەخودی ئامێرەکانەوە دەبیستم. ئامێر کە هەرەس بە خەڵکانێکی زۆر دەهێنێ بەهێمنی و بەخشندەیی لەپێناو حەوانەوەی جەستەی مرۆیی یارمەتی پێشکەش دەکات. بەڵام ئەمانە هیچ نین, نەخێر هیچ نین جگە لە خولخولۆکەو دانی تیژی ئامێرە تێکچڕژاوەکان و دەسکی ئاسنی سوڕێنەرو سووکانی هەڵسوڕێن و هەڵخزێنەرو دەسکی دەرگاکان نەبێ کە سیفاتی مرۆیی لەخۆ دەگرن گەر مرۆڤەکان ببنە هەڵگری دڵی ئاسنین. ئەمانە دووبارە چاوەڕێ و بانگەوازی گۆڕانێکی گەورە دەکەن. ڕۆژێك دێت کە تیایدا سەرکارێك ڕووەو ئاکاری جوان باڵا دەگرێت و لەنێو کرێکارە ئازادبووەکاندا دەبێتە کرێکارو بەهیچ جۆرێك مووچە نامێنێ و ئاڵوگۆڕی شمەك پەیدا دەبێ. پیشەسازی گەورە جێگەی جوامێری دێرین دەگرێتەوەو لاسایی دەکرێت و شەوی چواری ئەیلوول دروست دەکات. گەر ئەم کۆمارە هەرگیز نەیەتە دی ئەوا پیرۆزبایی لەخۆم دەکەم بەوەی کە لە هزرمدا بەرجەستەی دەکەم چونکە پێکهێنانی یۆتۆپیا کردەوەیەکی ڕێگەپێدراوە. خەونی فەیلەسووفەکان لە هەموو سەردەمێکدا خاوەن کارەکان ووریا دەکات و هانی جێبەجێکردنی کارەکانیان دەدات. بیری ئێمە دروستکەری ئایندەیە. بەڵام لەگەڵ نزیکبوونی جەنگ تێڕوانینی بۆ جیهان دووچاری ڕەشبینی بوو کە ووتارو نووسینەکانی سروشێکی ڕەخنە ئامێزی توندو تۆڵتریان لێوە هەڵێنجا وەك لە ستایلی سویفت و _دوورگەی بەتریقەکان, 1908 _و_ ڕاپەڕینی فریشتەکان, 1914_ دا دەردەکەوێ.

بابەتەکانی ساتیرگرتن لەئایین و دەمارگیری و ستەمکاری و نەبوونی دادپەروەری و گۆڕینی گاڵتەجاڕییانەی مەسەلەی دریفۆس لای نووسەر گەلێ خۆشەویست دەبن وێڕای ئەوەی کە لە تۆنێکی نائومێدییانەدا بەرجەستەی دەکات. گەواهێتی گفتووگۆی ناوەوەی بیدۆکۆکی ئەستێرەناس کە لە پێناو بەرژەوەندی دریفۆس دووچاری گێرمەو کێشە دەبێت و دەگاتە بڕوایەك کە سەرکەوتنی هەق هەموو نادادییەك پوچەڵ دەکات و هەروەها بەغەمگینیەوە ڕوودەکاتە پرژە ئاگرەکان _نیزك_ و ئەوە دەبینێ _چاکسازی هەڵەکان کارێکی ئاستەنگە سەرلەنوێ هەڵئەداتەوە_ ئەم بابەتی گەڕانەوە ئەزەلیە لەدواساتەکانی تەمەنی ئەناتۆڵ فرانس بەشێوەیەکی چڕوپڕ ڕەشبینیەکەی بەرجەستە دەکات و دوورگەی بەتریقەکان لەسەر بناغەی مێژووی کۆتایی نەهاتووی ساتەکانی ئاییندە تەواو دەبێت: لەچەند شارستانیەتێکی مەزنی داڕووخاو بەدەس چەند ئەنارشیستێکی دوابەدوا یەك هاتوو بەدرێژایی شارستانیەتە گەورەکان تا ئەو ڕۆژەی کە دانایەك بۆ تەقاندنەوەی ئەم هەسارەیە دینامیتێکی زۆر کۆدەکاتەوە.

## هوونەرەکەی ئەناتۆڵ فرانس

وەك بیرمەندێك بەردەوام لە مشتومڕ دابوو بەڵام لەگەڵ سەراپای دەنگەکان کۆك و تەبا بوو. بۆ تامو بۆی کلاسیکی وەفادارو ئالوودەی ڕەوانبێژی و ڕووکەشکاری بوو. بەرپەرچی زبری و ڕەقایەتی سروشتگەراییەکان و تەمومژێتی هێماگەراکانی دەدایەوە. شێوازە ڕوون و ساناو شیرینەکەی دانسقەترین ئامرازە کە کەسێکی زیرەکی وەك خۆی بێ ووردەکاری زیادەڕۆو تاکڕەوێتی بەکاری هێناوە. وەك خۆی دەڵێ _ بەهرەی ڕووانین لەڕووی کۆمیدی شتەکان_ بریتییە لەبەکارهێنانی گاڵتەجاڕی لەبۆتەی تۆنی ناسك و ڕەنگاڵەیی ڕەها. هەروەها کارەکانی سیخناخن لەسۆزو هەستیاری و شەهوانێتی و گەلێ جار بەهۆی سۆزەوە تەنز ئامێزییەکەی هێور دەکات و هەمان سروش بەبابەتەکانی دی دەبەخشێ:-"چەنێ پتر بیر لەژیانی مرۆیی بکەمەوە بڕوا بەوە زۆرتر دەکەم کە پێویستە چەشنی گەواهی و حوکمەکان گاڵتەجاڕی و سۆزی پێببەخشم". گاڵتەجاڕی و سۆزداری دوو ئامۆژگاریکەری نایابن یەکێکیان بەپێکەنینەوە ژیانمان لا خۆشەویست دەکات و ئەوی دی بەگریان ژیانمان لا پیرۆز دەکات. ئەو گاڵتەجاڕییەی من ئاماژەی پێدەکەم دڵڕەق و بێ سۆز نییە. گاڵتە بەخۆشەویستی و جوانی ناکات. نەرمونیان و سۆزاوییە. پێکەنینی هەڵچوون هێوردەکاتەوە. هەر ئەوە فێرمان دەکات گاڵتە بەچەتوون و شەڕەنگێزەکان بکەین و بێ ئەویش دەتوانین ببینە خاوەن ڕقوکینەی بێ هێز" (باخچەی چێژ).

## مەدام بێغژوغێ لە پاریس

بەرهەمی_ *amethyst* *Lanneaud*, 1889_

بەرگێکە لەکتێبی مێژووی هاوچەرخ بۆ چەند سەرکێشییەکی تایبەت تەرخانکراوەو تیادا لەپێناو بەرزکردنەوەی پلەوپایەی موترانێك وادەبین گوێبیستی سەداکانی مەسەلەی دریفۆس بین کە پلەی یەکەم لەبابەتی _بێغژوغێ لەپاریس, 1901_ داگیردەکات. لەسۆنگەی ئەم نووسینە ڕەچاوی ژمارەیەك کەسایەتی پاریسی زەوقدارو جیهانی بووکەڵەو کەسانی گوندنشین و کاریکاتێر تاموبۆیەکی بەچێژ دەبەخشێتە بەشی ناوەوەی کارەکە گەرچی تۆنێکی گەلێ تووندوتیژ لەخۆ

دەگرێ. پروفیسۆری دانا لەم کارەدا خۆی دەهاوێتە نێو هەڵمەتێکی چاکسازی و بەشێوەیەکی تایبەت بەرگری لەسیستەمی کۆماری دەکات کەلەلایەن چەند سیاسەتمەدارێکەوە بەشێوەیەکی خراپ داکۆکیلێدەکرێ و دەدرێتە دەس کەسانی خاوەنکارەوە هەروەها بەتووندی جەخت لەسەر ئاواتی هەبوونی سیستەمێکی مرۆیی و چەند پرانسیپێکی سۆشیالیستی دەکات کە تەواوی بیروبۆچوونەکانی ئەناتۆڵ فرانس ڕەنگ دەداتەوە. نووسەر حەز ئەکات ئەوە بخاتە ڕوو کەمەسەلەی دریغۆس تاچی ڕادەیەك هەڵسووکەوتەکان دەگۆڕێ. کەسایەتی ورمز_ کلاڤولان بەتەوسەوە چالاکیەکی داکۆکیکار لەڕەگەزی سامی ئەنتیسێمیت دەنوێنێ مازوغی کۆماریخواز لەڕووی نیشتمان پەروەرییەوە دەچێتە ڕیزی نەتەوە خوازە شاهانەییەکان. لە سەرێکی دییەوە ئارەزووی ڕاستخوازیگەرایی لەبێغژوغێی ماتریالی و لێتغییەی فەیلەسووفی ڕۆحانی و غوپاغی دارتاش و سۆشیالیست نزیك دەبێتەوەو هەروەك تیادا ڕەچاوی ئەوە دەکەین کەمەسەلەی سەردەم لەسەر بناغەی پرەنسیپەکان بەڕێوەدەچێ. ئاخۆ ئەوە لەڕێگەی عەقڵی دەوڵەت یاستەمکاری یاخود ڕێزگرتن لەپێشبینیکراوەکان دەستەبەر ئەکرێ یان دەبێ ڕاستی و یەکسانی لەسەرووی هەموو شتەکانەوە جێگیر بکرێ؟ وەك لای نووسەر کە مسیۆ بێغژوغێ بەتایبەتی دەبێتە لایەنگری ئەو شتەی کەبێ فریو نابێتە بەربەست لەبەردەم تایبەتمەندی کۆماریخوازی. مسیۆ بێغژوغێ وەك پرۆفیسۆر لەزانکۆی سۆربۆن دادەمەزرێ و تێکەڵاوی کۆمەڵگەی پاریس دەبێت و مەسەلەی دریغۆس جۆش و خرۆشی دەداتێ. نووسەر بەدەنگێکی ڕەخنە ئامێزی تووند گاڵتە بەپیلانی نەتەوەخوازو خاوەنکارو دوژمنانی کۆماریخوازی دەکات. لەلاپەڕە نۆدا مسیۆ بێغژوغێ لەنیوەڕۆ خوانێکدا لەگەڵ مازیوغی ئەندازیار کۆدەبێتەوە کە بۆ ڕاگەیاندنی هەواڵەکانی شارێکی پرۆڤانسی دێتە لای و بەشێوەیەکی کەم تیادەمێنێتەوە. ناوچەکە کەلەلایەن حاکمێکی جولەکە بەڕێوەدەچوو دژی بڵاوبوونەوەی کرداره[2] هەرە جەختلێکراوەکان گەلێ پارێزراو بوو. مسیۆ ورمز کلاڤولان لەبەرئەوەی جولەکە بوو پێی وابوو پێویستە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەنتیسێمیتی حکومەتەکەی بەچالاکیەکی ئەوتۆ بکات کە نەیەڵێ لەبری خۆی حاکمێکی کاسۆلیکی دابنرێ. بەخێرایی و دڵنیایی لەناوچەکەدا بەشێوەیەکی نهێنی چاوی بەمەسەلەکەدا[3] گێڕایەوە. لەوێ بەهۆی هاندانی کۆمەڵەی بڕواداران و مێشك شۆران[4] بەشێوەیەکی گەلێ دڵگیر سەرکەوتوو بوو لەوەی کە هاووڵاتیانی وەك فرانسیس دوپغوسنی و ژان سیشاغی و ئۆکتاف میغابۆ و پیەغ کۆیاغ کە لە ناوەندی قەزاوە هاتبوون وەك کەسانی ئازاد قسەبکەن و وابزانن چوونەتە نێو شارێکی سەدەی شانزەهەمەوە کە تیادا تەنها پاپاکان بۆیان هەیە بانگەواز بۆ مەرگ و لەناوبردن بکەن. مسیۆ ورمز... کلاڤلان لە دادگایکردنەکەی 1894 گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دریغۆس بێتاوانە, ئەم ڕاستیەی نەشاردەوە, پاش نیوەڕۆ سیغارێکی کێشاو نەتەوەخوازەکان کە لەخزمەتی مەسەلەکەدا بوون ڕوویدا پەنا بەرنە بەر پشتگیرییەکی یاسایی و بەهیچ جۆرێك نەبنە پابەندی ویژدانێکی تایبەت. ئەم دانیشتنە بەهێزەی هەرێمەکە کە خودی خۆی ئەرشیفەکانی دەپارێزێ بەشێوەیەکی بەرفراوان خرایە ئەستۆی مسیۆ مۆزاغ کە یەعقوبیەکی بەتینووتاو خاوەن توانایەکی پاڵەوانانە بوو بەڵام وەك تیپی پاڵەوانان بەبێ زەبری تەپڵ هەنگاونانێ

لەگەڵ ئەوەش مۆزاغ کەسێکی دڕندە نەبوو بەڵکو بڕوای بەوە بوو کە خەڵکی و خودی خۆی پێویستە بیروڕاکانیان ئاشکراکەن. لەپاش سوپخواردنەوە بەدەم چاوەڕوانکردنی ماسی تغویت خۆی دەهاوێتە سەر مێزەکە دەڵێ:_ بێغژوغێی ئازیز من نیشتمان پەروەرو کۆماریخوازم. دریغۆس بێتاوان یان تاوانبار بێت من هیچی لەبارەوە نازانم. ناشمەوێ بزانم چونکە کاری من نییە بەڵام دڵنیام کە لایەنگرانی دریغۆس تاوانبارن بەدانانی بیروڕای تایبەت لەبری بڕیارێکی یەکسانی کۆماریخوازان. ئەوان[5] لاسارییەکی گەورەیان ئەنجامداوە کە وولاتە کۆماریخوازەکانی هەژاند و بازرگانیش بەدەستیەوە نالاّندی. ئەو سەرزەنشتییەی کە لە لایەنگرانی دریغۆسی دەکەم کە داکۆکی نیشتمانیان لاوازکرد و پلەوپایەی ئێمەشیان لە دەرەوە کەمکردەوە. ڕۆژی دووایین تیشکی ئەرخەوانی خۆی هاویشتە نێو قەدی تاریکی درەختەکان.

مسیۆ بێغژوغێ هەستی شەرەفی وەلاّمدانەوە دایگرت:_ مازوغی ئازیز بزانە گەر مەسەلەی کاپتنێکی پەنهان بکرێتە مەسەلەیەکی نیشتمانی کارێکی هەڵەیە کە هەرگیز بۆ ئێمە ناگەڕێتەوە بەڵکو لەو وەزیرانەوە سەرچاوە دەگرێ کە سیستەمی حکومەت لە بۆتەی بڕیار گەلێکی هەڵەو ناڕەوادا دەپارێزن. گەر وەزیری داد لە ڕێگەی دەسپێکردنی چاوپێخشاندنەکان ئەرکی خۆی ئەنجام دایە لەکاتی پێویست ئەوا تایبەتمەندییەکان بێدەنگیان ڕادەگرت. لەکاتی سەرهەڵدانی یەکسانیەکی پوچ و شێوە ناوی ئەوان دەنگیان لێهەڵدەستێ. ئەوەی وولات دەشێوێنێ ئەو دەسەلاّتە ستەمکارە سەر سەخت و دڕندانەیە یە کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەژێر پەردەی ئەو درۆو دەلەسانەی کە هەولی شاردنەوەیان[6] دەدەین بەرفراوانتر دەبێ.

_چیت دەوێ؟.. مسیۆ مۆزاغ وەلاّمی دایەوە، من نیشتمانپەروەرو کۆماریخوازم.

_مسیۆ بێغژوغێ ووتی، مادام تۆ کۆماریخوازی پێویستە هەست بە نامۆیی و تەنهایی بکەیت لەنێو هاوولاّتیەکانت. کۆماریخوازی ئەوتۆ لەفەرەنسادا نییە و لەوێ دانەمەزرێنراوە. حکومەتی ڕەها سیستەمی کۆماری[7] دادەمەزرێنێ. خۆشویستنی ئازادی لەسەر بەردەچەرخی پادشاو قەیسەرەکان تیژ دەکرێ. لەوولاّتێکی ئازاد یان وولاّتێك پێی وایە ئازادە لاواز دەبێت و ئەمەش بریتییە لە پەیڕەوکردنی ئەو خۆشەویستیە کەمەی کە هەمانە وێڕای ئەوەی کە واقیع گەلێ خۆشەویست نییە پێویستە دانابین لە چۆنیەتی دەستەبەرکردنی. ئەتوانین ئاماژەش بەوە بدەین کە ئەو فەرەنسیانەی ئەمڕۆ تەمەنیان لە خوار پەنجا ساڵیەوەیە کۆماریخواز نین.

_ئەی مۆنارشیست نین.

_نەخێر مۆنارشیست نین. چونکە مرۆڤ گەلێ جار ئەو شتانەی کە هەیەتی حەزی لێناکات. لەگۆڕانکاری دەترسێ چونکە نادیاری لەخۆدەگرێ کە ترسێکی گەورەی لەدڵدا دەچەسپێنێ. هەر ئەویش حەوزو سەرچاوەی هەموو ترسێك دروست دەکات. شتێکی هەستیارە لە دەنگ و ڕەزامەندێتی گەردوون کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هێزو کردارێکی بێ سنوور بەبێ ئەو مەترسیە سامناکە نادیارەی کە لەناوی دەبات. هێزێکی تیایە دەبێ موعجیزەی چاکەو خراپە بەڕێوەبات بەلاّم مەترسی لەنادیارێتی گۆڕانکارییەکان دەوەستێ و دڕندەکەش مل بۆ جڵەو دادەنوێنێ.

مسیۆ بێغـژوغیّ لـە پـاریس، بەشـی نۆیـەم (کالمان لێڤی، بڵاوکەرەوە)

## خێرخوایی (یەکسانی سۆزداری)

لە کاتێـکەوە بۆ کاتێـکی دی لە ساتـیرکردنی ڕووداوە هەنووکەییـەکان دوور دەکەوێتـەوە. مسیۆ بێغژوغیّ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بیری ڕامیاری و کۆمەڵایـەتی نووسـەر دەردەخات. ئەم گفتووگۆیـەی نێـوان پرۆفیسـۆری دانـاو پـۆڵێنی کچـی کـارێکی سەرنجڕاکێش و گەواهیدەرەو ڕاستیش بووتریّ کەم بابەتیـە لـە ڕووی گاڵتـە کـاری بـەخێر خـواهێتی و بـەکارهێنانی شـێوازێکی کارکاتێرییانـە دژ بـە ڕیاکارو بەناو پیاوانی ئایین کە چاکە کارییەکانیان لەپێناو خۆشەویستی ئایندە و خۆشەویستی خوا نییـە بـەڵکو خیانەتـە بەرامبـەر خـودی بیروبـاوەڕی کریسچیانی. نووسـەر بەپێی توانای ئاسایی خۆی هەوڵدەدات ڕووداوەکە وەك دەروازەیەك بەکاربهێنیّ لـە گەشـتێکدا بـەنێو زنجیرەیـەك دەربڕینـی بـەتام و گاڵتـەجاڕی و قسـەی نەسـتەق شـێوازێکی کارامانـە دەگرێتـە بـەر کـە دەیکاتـە دەرهاویشـتەی خـاڵی بیرکردنەوەیـەکی فـرە گەشـە سـەندووی قـووڵ بـە مەبەسـتی تێڕامـان لـە پـەیڕەوکردنی مەرجـەکانی خێرخـواهی و دادپـەروەری کـە لـە سـۆنگەی سروشـی کۆمەڵایـەتی بـەرەو ڕاسـتیگەلێکی گشـتی ڕامان دەپێچیّ.

مسـیۆ بێغـژوغیّ، بـەدەم بەخشـینی دوو سـوو _دراوێکـی ووردەی فەرەنسـیە_ بـە کلۆپینـەڵ بەکچـەکەی دەڵـیّ:_مـن کـاری خێـر خـواهی دەکـەم، خەریکـە کـارێکی خـراپ ئـەنجام دەدەم. مـن بـۆ سـوکایەتیکردنی هاوڕەگـەزم چـێژ لـەم خۆشـیە شەرمەزارە وەردەگرم. قایلم بەم ڕێکەوتنە قێزەونەی کـە لاوازی ئـەوم بـۆ دەردەخـات. مـن بـەم کـارە سـتەمێکی دێـرینم لـەناو بـردو بەشـداریم لەیارمەتیدانی ئەم کەسە نیوەگیانە کرد.

پـۆلین بەگوومانـەوە پرسـی:_باوکـە تـۆ ئـەم هـەموو کـارەت کـردووە؟ مسـیۆ بێغـژوغیّ وەڵامـی دایەوە:_ من نزیکەی تەواوی هەموویم کردووە. من برایەتییەکی ساختەکارم بە کلۆپینەڵی برام فرۆشت. بەسووککردنی ئەو خۆشم سووککرد چونکە کاری خێر لە نرخی ئەو کەسەی پارەکە دەدات و ئەوەش کە وەریدەگریّ کەمدەکاتـەوە. من هەڵسووکەوتێکی خـراپم کـرد. پـۆلێن ووتـی_لـەوە ناچـیّ. مسـیۆ بێغـژوغیّ ووتـی:_تـۆ بـڕوام پێناکـەی چـونکە لـە فەلسـەفە ناگـەیت. تـۆ نـاتوانی لـە کردەوەیـەکی ڕوواڵـەت پـاك ئاکامـە پەنهانـە بـیّ سـنوورەکانی هـەڵێنجی. ئـەم کلۆپینەلـە هـانی خێـر کردنـی دام. بەرگـەی دەنگـە سکاڵاوییەکەیم نـەگرت. دڵم بە ملە لاوازو ئـەژنۆکانی دەسـووتا کـە لـە پانتۆڵـە دڕاوەکەیەوە دەرچووبوون و زۆر خەماوییانە لەهی حوشـتر دەچـوون و هـەروەها پێیـەکانی کـە سـەری پەنجـە گـەورەکانی چەشـنی دەنـووکی دوو کـەناری کرابوونـەوە. ئـای کلۆپینـەڵی خەتـەرناك و فریـودەر، بەتامو بۆ! بە بۆنەی تۆ پارەکەم بووە مایەی شەرم و سووکایەتی. بەهۆی تۆ و سوویەك کۆمەڵیّ خەراپەو دزێـویم دەسـکەوت. بـەدەم پەیوەنـدی کردنـت بـە هێمـای بچـووکی دەوڵەمەنـدی و دەسـەڵات بـە گاڵتەجارییـەوە دەتکەمـە سـەرمایەدار و بـەبیّ ڕێزییـەوە بانگهێشـتی خـوانی گـەورەی کۆمـەڵ و جەژنـەکانی شارستانیەتت دەکـەم. کـە هەسـتم کـرد بوومەتە دەسەڵاتدارێکی ئەم جیهانە سەبارەت خۆت و دەوڵەمەنـدێکی نزیکیشـت کلۆپینـەڵی بەسـۆز و سـواڵکەری دڵـڕفێن و ماستاوچـی! مـن گووشـادو لووتبەرز ئەم، لـەکاتی دەسڕۆییوی و گەورەییدا بە حاڵی خۆم ڕازی دەبم. بڕوانـە، کلۆپینـەل ئەمـە وەك

مەرجی هەتا هەتایی هەژاری سرووددێکی خۆشی دەوڵەمەندییە. جێبەجێکردنی خێرێکی قێزەونە! بەربەرییەتی سۆزاوی ئیلیمۆسینە[8]! هەڵەی دێرینی بۆرژواکانە کاتێکە سوویەك دەبەخشێ وائەزانێ چاکە دەکات و هەموو براکانی تێدەپەڕێنێ بەهۆی کلۆڵترین و گەمژەترین و بێ مێشکترین و کەمدەرامەتترین کردارێك بۆ هەموو ئەوانەی کە دەتوانن جێبەجێبکرێن لە ڕێگەی دابەشکردنی زۆرترین بڕی سامان. خودی ئەم خێر بەخشینە پێچەوانەی چاکەخوازی و مەترسیەکی گەورەی خێرخواهیە. کچەکە بە پەرۆشەوە ووتی:_بە ڕاستە؟ مسیۆ بێغژوغێ بەردەوام بوو:_خێرخواهی لەگەڵ چاکەخوازی زۆر بەراورد ناکرێت وەك چۆن رووگرژی و مۆنی مەیموونێك لە بزەخەنەی جۆکۆندا ناچێت. چاکەخوازی کارامەیە مادام خێرخواهی ووریایی و چەتوونکارییە و بەپێی پێویست هەوڵەکانی دەگوونجێنێ. ئەمە تەواو لەوە دەچێ من هەرگیز لەبری کلۆپینەلی برام نایکەم. لە سەدەی فەیلەسووفاندا تەنها ناوی چاکەخوازی هێدیترین بیرۆکەی گیانە هەستیارەکان بەئاگادێنێ... دانبەوە دەنێم من جوانی ڕەسەن بۆ ووشەی چاکەخوازی نابینمەوە, پیاوە بەناو ئایینیەکان لەبەر زۆر بەکارهێنانی ئەم ووشەیەیان لێشێواندم. لە کۆمەڵگەکەماندا دەزگایەکی زۆری چاکەخوازی هەیە لەوانە رووگاکانی لەخوا ترسی و کۆمپانیای هاوکاری و دابین کردنی ژیان. هەندێکیان سوودبەخشن و خزمەت پێشکەش خەڵکی دەکەن. نەنگی و گووتاهی هاوبەشیان ئەوەیە لەبری ئەوەی چاکسازی لەنێو کۆمەڵدا سازبکەن, ستەمکاری دروست دەکەن و دەرمانی پیسی تیا بڵاودەکەن. چاکەخوازی جیهانی بریتییە لەوەی کە هەر کەسێك لە ڕێگەی کاری خۆی بژی نە وەك بەکاری خەڵکی دی. هەموو شتێك بەدەر لەهاوکاری و گۆڕان بێنرخ و شەرمەزارو نەزۆکە. خێر خوایی مرۆیی بریتییە لە پێشبڕکێی سەراپای شتەکان لەبواری بەرهەمهێنان و دابەشکردنی بەروبوومەکان.

مسیۆ بێغژوغێ لەپاریس, 17 (کالمان لێڤی, بڵاوکەرەوە)

## کغانکۆبیل

چیرۆکی کغانکۆبیل لەڕاستیدا چیرۆکێکی بەناوبانگە. یەکەمجار بریتی بوو لە سەرگوزەشتەیەکی کەمبایەخی نێو دادگاییە گاڵتە ئامێزەکان کە کەسایەتیەکانی بووکەڵە ئاساو کەسانێك بوون متمانەیان بە خۆیان نەبوو و نووسەر بۆ خاتری ڕاکێشانی سەرنجی کوڕوکاڵ چێژی لە بەکارهێنانیان دەبینی. کێشە دادوەرییەکە پێچەوانەی ڕەوشی ئەم کەسایەتییە کلۆڵە داڕێژرابوو کەبێ توانابوو لەبەردەم ئەو دادوەرانە بەرگری لەخۆی بکات کە زۆر کەم پەرۆشی ڕاستی و تەواو گوێڕایەڵی شایەتی ناماقووڵ بوون کە لە شایەتیەکی ژیرانەو لێکدژی دەسەڵاتدا خۆی دەنوێنێ. هاوکات دەتوانرێ بووترێ ئەم کێشەیە _مەسەلەیەکی دریفۆسی_ بچکۆلە بوو. ئەم هوونەری گەمە کارییە بەبیرۆکە مەترسیدارەکان لە بۆتەی چیرۆکی تەنزئامێز, چیرۆك و تانەو تەشەرە هەرە سەرکەوتووەکانی ڤۆڵتێر دەهێنێتە یاد. کغانکۆبیل, بازرگانێکی هەر چوار وەرزەکەی ساڵ بوو, چاوەڕێی گەڕانەوەی مەدام بەیاردی کڕیار بوو کە دەچێتەوە ماڵ بۆ ئەوەی پارەی شمەکەکانی بهێنێ. لەولاوە پۆلیسێك فەرمانی پێدەدات جێگەکە بەجێبێڵێ. کابرای پیرەمێرد بۆ دەسکەوتنی کات بەقسەوە خەریکی دەکات. پۆلیسەکەش پێیوایە

سووکایەتی پێدەکات بۆیە دەسگیری دەکات ئەمە وێنەی کغانکۆبیلە لەبەردەم دادوەرەکان:

بۆغیشی سەرەك دادگا شەش خولەکی خشت بۆ لێپرسینەوەی کغانکۆبیل تەرخان دەکات. ئەم لێکۆڵینەوەیە زیاتر ڕوون دەبوو گەر تاوانبار وەڵامی پرسیارەکانی بدایەتەوە. بەڵام کغانکۆبیل کەم دووبوو, لەم جۆرە دانیشتنانەدا ڕێزوترس بواری قسەکردنی نەدەداو بێدەنگی ڕادەگرت و سەرۆك خۆی وەڵامە[9] وەرزکارەکانی دەدایەوەو ئاکام دەیگووت: کەوا بوو دانیپیادەنێی کە ووتووتە _مۆغ ئاڤاش, مردن بۆ مانگاکان:_

_من ووتم (مردن بۆ مانگاکان!) نەخێر, کاکی پۆلیس ووتی (مردن بۆ مانگاکان!) پاشان منیش ئەو قسەیەم کردەوە. ویستی وا بگەیەنێ سەری لەم تاوانبارکردنە ناکاوە سوڕماوە. لەسەرسامیا ووشە سەیرەکانی کە بە درۆ دەدرانە گوێی و بە هیچ شێوەیەك دەرینەبڕیبوون دەووتەوە:_ ئەو ووتی"مردن بۆ مانگاکان!" و هەروەها ووتی:_ ئێوە چۆن بڕوا دەکەن من قسەی ناشرینم کردووە؟. بە هەرحاڵ سەرەك دادگا پۆغیش بڕوای نەکردو ووتی:_ دەڵێی گوایە پۆلیس یەکەمجار ئەم قسەیەی کردووە؟ کغانکۆبیل نەیتوانی بۆی ڕوونکاتەوە چونکە بۆ ئەو کارێکی گەلێ ستەم بوو.

_پێداگری ناکەیت. هەقی خۆتە, سەرۆك ووتی و شایەتەکانی داواکرد. پۆلیسی ژمارە شەست و چوار کە ناوی باستیان ماترایە سوێندی خوارد ڕاستیی بڵێ و لەڕاستی بەولا چیتر نەدرکێنێ. پاشان ئەم قسانەی کرد: لە نیوەڕۆی بیستی ئۆکتۆبەر لەکاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانمدا لەشەقامی مۆنماغتغ کەسێکم بینی پێم وابوو فرۆشیارێکی گەڕۆکەو عارەبانەکەی بەنایاسایی لەبەرزایی ژمارە $328$ ڕاگرتبوو و بووە هۆی ڕوودانی قەرەباڵغی ئۆتۆمبیلەکان. سێ کەڕەت فەرمانی ڕەسمیم دایێ لە شوێنەکەی بجوڵێتەوەو ئەویش[10] داواکەی ڕەتکردم. جا لەبەرئەوە ئاگادارم کرد کەمەحزەری لەسەر دەنووسم. ئەو بەڕوومدا هاواری کرد: "مردن بۆ مانگاکان!" کە بەلامەوە سووکایەتی کردن بوو.

ئەم شایەتییە یەکلاییکەرەوەیە بەچاکی لەلایەن دادگاوە بیسترا. بەرگری مەدام بەیاغی پینەچی و مسیۆ دیڤید ماسیۆی سەرەك پزیشکانی خەستەخانەی ئەمبغواز پاغێ و سەربازی مەدالیای شەرەفی بەشایەت گرت. مەدام بەیاغ نەهیچی دیبوو نەهیچیشی بیستبوو. دوکتۆر ماسیۆ خۆی لەنێو کۆمەڵە کەسانێکدا دۆزییەوە کە دەوری پۆلیسەکەیان دابوو و ئەویش بەشێوەیەکی ڕەسمی فرۆشیارە گەڕۆکەکەی ئاگادارکردەوە. شایەتیەکەی کێشەی نایەوە کە ووتی: من ئاگام لەڕووداوەکەیە, تێبینیم کرد پۆلیسەکە جنێوی پێنەدرا بەڵکو بەدحاڵ بوو. چوومە پێشەوەو ڕووانیم دەستی بەسەر فرۆشیارەکە داگرتووەو داوای لێکردم لەگەڵیا بچمە فەرمانگەی پۆلیس. منیش لەوێ ڕووبەرووی بەڕێوبەری پۆلیس قسەکانم دووبارە کردەوە, سەرۆك پێی گووت: دەتوانی دانیشتنی. ویسیێ, ماتغای شایەت بانگ بکە.

_ ماتغا, تۆ کە دەست بەسەر تاوانبارەکە گرت جەنابی دوکتۆر پێینەوتی دووچاری بەدحاڵی بوون بوویت؟

_جەنابی سەرۆك مەبەستت ئەوەیە کە چی جنێوێکی پێدام؟

_چی پێووتی؟

_پێی ووتم "مردن بۆ مانگاکان!" دەنگە دەنگ و قاقای پێکەنین لە ئامادەبووانەوە بەرز بوو.

سەرۆك دادگا بەپەلە ووتی: دەتوانی بڕۆی. دانیشتوانی ئاگادار کرد گەر ئەم ڕەفتارە نابەجێیە دووبارکرێ ئەوا هۆڵەکە جێدەهێڵێ. لەو کاتەدا داکۆکیکار سەرکەوتووانە چمکی ڕۆبەکەی بەری بزواندو هاوکات هەمووان هەستیان بە بێتاوانی کغانکۆبیل کرد. بێدەنگی هۆڵەکەی داپۆشی, سەرۆك دادگا هەستاو کرداری داکۆکیکردنەکەی بەپیا هەڵدانی پۆلیسەکانی هەرێمەکەی دەسپێکرد: (ئەم پارێزەرە لێبردووانەی کۆمەڵ بە موچەیەکی کەم ماندوویێتی زۆر دەچێژن و دووچاری مەترسی بێئەندازە دەبن و ڕۆژانە کرداری پاڵەوانانە ئەنجام دەدەن. ئەمانە سەربازی دێرینن و هەر سەربازش دەمێننەوە. ووشەی سەرباز واتای هەموو شتێك دەگەیەنێ) سەرۆك دادگا لە ڕێگەی ستایشکردنی بەرزی چاکەکانی سووپا بەسانایی گەورەیی خۆی نواندو ووتی: "خودی خۆی یەکێکە لەوانەی ڕێگە نادات بە هیچ کەسێك سووکایەتی بەم سووپا نیشتمانیەی کە شانازی پێوەدەکات و خۆی ئەندامیەتی بکات". سەرۆکی دادوەران سەری دانەواند. ئەوەی ڕاستی بێت خودی سەرۆکی دادگا ئەفسەری پلەیەکی یەدەك و نەتەوە خوازێکی کاندید کراوی ناوچەی ڤیەی_ هۆدغیەت بوو. بەردەوام دەبێت لە قسەکردن: بێگوومان نەخێر, من حاشا لەو خزمەتکارییە خاکی و بە نرخانەی پارێزەرانی ئاسایش ناکەم کە ڕۆژانە پێشکەش بەدانیشتوانی چاو نەترسی پاریسی دەکەن. بەڕێزان من ڕازینیم بە بەرگریکردن لە کغانکۆبیل گەر وەك سووکایەتیکەرێك بە سەربازێکی دێرین لێی بڕوانم. ئەوان ماتغای پۆلیس بەوە تاوانبار دەکەن کە ووتوویە: "مردن بۆ مانگاکان!" مانای ئەم ڕستەیە جێگەی گومان نییە. گەر فەرهەنگی زمانی سەوز بکەنەوە ئەمەی تیا دەخوێننەوە: ڤاشاغ واتە تەمەڵ, تەوەزەل: ئەو کەسەیە کە لە تەمەڵیا وەك مانگا درێژ ئەبێت لە جیاتی ئەوەی کار بکات. ئەو کەسەی گۆشت وەك بەرتیل دەداتە پۆلیس, سیخوڕە" ئەم قسەیە لە هەندێ شوێنی تریشدا بەکاردەهێنرێ. بەڵام تەواوی پرسیارەکە ئەوەیە: کغانکۆبیل چۆن شتی وا دەڵێ؟ ئاخۆ قسەی وای کردووە؟ ڕێگەم بەن بەڕێزان گومان لەوە بکەم گەرچی من هیچ گومانێکم لە ماتغای پۆلیس نیە بەوەی کە قسەی خراپی لێبوەشێتەوە بەڵام ئەو وەك ووتمان ئەرکێکی ماندووکەری جێبەجێکردووە. هەندێ جار ماندو شەکەت و بێ هێز دەبێ بۆیە لەم بارودۆخانەدا دەبێتە قوربانی جۆرێك لە وڕێنەی بیستن. کاتێکە بەڕێزان دوکتۆر دیڤید ماسیۆی ئەفسەری خاوەن مەدالیای شەرەف و سەرۆك پزیشکانی نەخۆشخانەی ئەمپخواز پاغێ و میری زانست و کەسایەتی جیهانی دەڵێ ماتغا ووتوویە "مۆغ ئاڤاش!, مردن بۆ مانگاکان!" ناچاربن دانبەوەنێن ماتغا تووشی نەخۆشی وەسواسی بووە گەر تووشی نەخۆشی "وڕێنەی چەوسانەوە"ی لەوەش بەهێزتر نەبووبێت. لەکاتێکدا کغانکۆبیل هاواریکردووە: "مردن بۆ مانگاکان!" ئەوە زانیوویە کە ئەم قسەیە مەبەستێکی ناشرین هەڵدەگرێ. کغانکۆبیل کوڕی یاسایی فرۆشیارێکی گەڕۆکە و ونبووی دەستی بێئابڕوویی و خواردنەوەیە. بەسەرخۆشی لەدایکبووەو وەك دەڕوانن بە دەس شەش ساڵ نەهامەتی دەناڵێنێ. بەڕێزان ئێوەش دەڵێن تاوانبار نییە. میغلی و مسیۆ بۆغیشی سەرۆك دادگا لەژێر لێوەوە حوکمی پانزە ڕۆژ بەندکردن و قەرەبووی پەنجا فرەنکیان بەسەر ژیغۆم کغانکۆبیل خوێندەوە. دادگا ئەم بڕیارەی لەسەر بنچینەی شایەتیەکەی ماتغای پۆلیس دارشت.

کفانکۆبیل، بەشی سێهەم (کلامان لێڤی، بلاوکەرەوە).

ئیتر لەو ساوە نەگبەتی دادەبارێتە سەر کفانکۆبیل، کە لە بەندیخانە دەردەچێ دەڕوانێ کرێیارەکەی ڕووی لێوەردەچەرخێنێ. بۆ لە بیر بردنەوەی بەدبەختیەکەی، خۆی نووقمی مەی خواردنەوە دەکات. ئاکام. نەهامەتی زۆری بۆ دەهێنێ تاڕادەیەك خوازیار دەبێ بۆ بەندیخانە بگەڕێتەوە چونکە تیادا ژیان و جلوبەرگ دابین دەکات. بۆ گەیشتن بەو مەبەستە ئەمجارەیان بە ئەنقەست جنێو بە پۆلیسێك دەدات بەلام ئەمەیان قسەکانی بەجدی وەرناگرێ و داوای لێدەکات ملی ڕێگەی بگرێتە بەر.

## خواوەندەکان تینوویانە

ئەم ڕۆمانە بە یەکێك لە شاکارە بەرزەکانی ئەناتۆل فرانس دادەنرێ و چیرۆکێکی خۆشەویستی ئاسایی پێکدەهێنێ گەر سەرکێشی نێوی لەسایەی تیرۆر ڕوونەدا لە زەمەنێك کە بەگوێرەی ووتەیەکی کامیل دیمولان تووند ڕەوانی ئاییینی نوێ خوازیاری قوربانیگەلێکن چەشی ئەو خوشکە قەشانەی مەکسیك کە لە مونتیزۆما تینوویەتی خواوەندەکان دووبارە دەکەنەوە. هەر لەسەردەمی کتێبخانەی باوکەوە دیکۆمینتەکانی شۆڕشی دەوڵەمەند دەبنە جێگەی سەرنجی ئەناتۆل فرانس. کتێبەکە دەتوانرێ گازندەی ئەوەی لێبکرێ کە ڕووداوە داستان ئامێزە گەورەکان و تینووتاوی نەتەوە خوازی و سەرکەوتنە سنوورییەکانی فەرامۆش کردووە، بەلام تیادا پەیدەبرێ بە ژیاننامەی کەسایەتییە مێژووییەکانی وەك ماراو ڕۆبسپیرو هێمای دی وەك دادوەر گامیلان و تیغۆبێغی نیشتمانپەروەر و بغێوتۆ دبزیلێتی ئەریستۆکراتی و گومانکار و هانغی هەلپەرست و ژنە هاوولاتی پیلانگێر غوشموغ. چێژ لە دووبارە ژیاندنەوەی دانیشتنی دادگاکان و بزوتنەوە جەماوەرییەکان و دەستگیرکردنی کەسان و ژیانی زیندانیان دەبینێ و هەروەها لە ئاقاریا شانبەشانی برسیەکان لەبەردەم نانەواخانەکاندا ڕیزدەگرین و تاکوو شوێنی مەقسەلەکان بەدوای عارەبانەی حوکمدراوەکان دەکەوین. زنجیرە ڕووداوەکانی نێوی پێگە گەلێکی مێژووین کە بەبەشی دواوەی دیمەنەکان و ئامادەییەکی کەمی دڵە ڕاوکێی خەڵك و جەماوەر تەنراون. بەهەر حاڵ نیگارکێشی لاو ئیڤاریست گامولانی قازی دادگای شۆڕش یەکەمجار بەشێوەیەکی سروشتی هەستیارو بەخشندەیە، بەلام دەخزێنرێتە نێو گێژاوی تیرۆرەوە. یەعقوبی چاکە خواز ڕایگەیاند، شۆڕش بۆ ماوەی سەدەیەك ئاسوودەیی بۆ ڕەگەزی مرۆڤ دابین دەکات، بەلام بەر لە سێدارەدانی دوایین دوژمنی کۆماریخوازی ناتوانین بەو مەبەستە بگەین. دەکەوێتە پاراستنی تراویلکەی باکێتیە بێگەردەکەی کە لە سۆنگەیەوە دەگاتە قبووڵکردنی خەمخۆرانی دادپەروەری وەدیهێنراو و حوکمدانی هاوڕێ دێرینەکان و تێکەلاوکردنی دوژمنە تایبەتیەکان و دوژمنانی وولات. دیمەنەکان لە ڕووی سادەییانەوە بەجۆرێك کاریگەرن کە هەناسەی مەترسیەکانی دەمارگیری و حەماسی ئاییینی وەردەگرن. نووسەر کە لە سەرەتادا بیر لە وەسفکردنی لێکۆڵەرێکی دادگایی دەکات پێئەچێ خوازیاری ئەوە بووبێ پاڵەوانەکەی بکاتە یادەوەرییەکی زیندووی ئەو فۆرمەلەیەی کە لەوەوبەر بۆ ژیغۆم کوانیاغی ئامادەکردووە: "کاتێکە ئارەزوو دەکەین مرۆڤەکان بکەینە چاکەخوازو ژیرو ئازادو میانرەوو بەخشندە ئەوا

بەشێوەیەکی ڕەشبین ڕوودەکەینە ئەو خواستەی کە هـــەموویان لەناوبـــەرین". ســـەرکاری چـــاکەخواز بـــەهۆی هیومانیزمیەکەیـــەوە دەســـئەکات بـــەخۆ نووسـین لـە ڕیـزی پارتـە پێشـکەوتووەکان, بـەڵام ڕەشـبینی بـە سـەریا زاڵ دەبێـت و بـەمجۆرە هـێڵ بـــەژێر لەمپـــەڕی هەڵوێســـتە باڵاکـــان دەهێنـــێ و بـــەردەوام گاڵتـــە بـــە گـــەوجی و دادپەروەرییـــە تایبەتـــەکانی مـــرۆڤ دەکـات, بـەڵام تـەنز ئـامێزی فەیلەسـووف لــە جـاران پـتر جـوودا کارییـەکانی ســـۆزو بـــەزەیی و هاوبەشـــیە ویژدانیـــەکانی مرۆڤ دەردەخات.

## لە دادگای شۆڕش

سادەیی سروشهێنی ئەم لاپەڕەیە ئینتباعێکی واقیعیمـان پێدەبەخشـێ لـە کـاتی ئامـادەبوون لـە یەکێ لە دانیشتنە وە ڕزکارەکانی دادگای شۆڕش کـە دەبێتـە جێگـەی سـەرنج بـە تایبـەتی لـە ڕێگـەی بوونیاتنانـەوەی ڕەوشـی هـزری دەسـتەی دادوەران کە بە پەرۆشەوە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی نەتـەوە تەرخان دەکرێن و دەخرێنە ژێر باری داسەپاندن و پشتگیری ناوخۆ و لـەژێر فشاری کۆمـەڵانی خـەڵکی تێکشـکاو بەدەسـت بەرپرسـیارێتیە تایبەتیـەکان هەموو نەرمیـەك لـە ڕوانگەیانـەوە بـە تـاوان دەدرێتـە قەڵەم. وێڕای ئەوەش نووسەر بە جۆرێك هەوڵدەدات پـەردە لـە ڕووی بڕیـارە نادروسـتەکانیان دامـاڵێ بـەوە قایـل نابێـت ئـەم دادوەرانـە وەك پاڵـەوانانی سـەردەمی کـۆن بخاتـە ڕوو. لێـرەدا تـەنز ئـامێزی بریتییـە لـە شـێوەیەك بابەتگـەرایی کـە هەڵچوونی مشـتوومڕ و ڕووکەشـکاری بیرۆکـە و توونـدڕەوی هەڕەمـەکی نابنـە هـۆی حەشـاردانی جـەماوەر. ئیڤاغیسـت گـامولان بـۆ جـاری دووەم لـە دادگـا دادەنیشـێ و لـە مـەڕ ڕووداوە تازەکـانی سـەر لـە بـەیانی لەگـەڵ دادوەرە هاوەڵـەکانی گفتووگـۆ سازدەکات. هـەواڵی درۆینـە و گومانـاوی دەکەوێتـە بەردەست بەڵام لە هەموو کاریگەرتر و مەترسیدارتر ئـەوە بـوو کـە سـووپا هاوپەیمانـەکان، خانمـانی سـەرجەم ڕێگاکـان لـە ڕۆیشـتنیاندا وشـاند پـێ سـەرکەوتوو و لیـۆنی ڕاپـەڕیوو و تولـونی خـۆ بـە دەسـتەوەدەری ئینگلیـز چـواردە هـەزار سـەرباز هەڵدەڕێـژن. ئـەم ڕووداوە ناوخۆییانـە چـەنێ لـە ڕوانگـەی دادوەرەکانـەوە گرنگبـوون لـە هـەموو دوونیاش ئەوەندە جێگای بایەخ بوو. گەر نیشتمان لەناوچـێ دڵنیـان خۆشـیان لـە ناودەچـن. کـاری تایبەتیان لە پێناو ڕزگاری جەماوەر و بەرژەوەندی نەتـەوەش ئاوێتـەی بەرژەوەندیان بوو کـە سـەراپای هەسـت و ویـژدان و هەڵسـووکەوتی داگیرکردبـوون. گـامولان لـە جێگـەی خۆیـەوە نامەیـەکی لـە تغیۆبێغ سـکرتێری کۆمیـدی بـەرگری پێدەگات کـە بـاس لـە چۆنیەتی بیروڕای دەکـات لـە مـەڕ دامەزراندنییـەوە وەك بەڕێوەبەری دەزگای چەك و تەقەمەنی. تێگڕای ژێرخانەکان دەپشکنێ لەپێناو جیاکردنـەوەی مـادە پێویسـتەکانی دروسـتکردنی بـاروود. دوژمنـان لەوانەیـە سـبەی بگەنـە پـاریس. پێویسـتە خـاکی نیشـتمان بـۆ لێـدانیان تۆپخانـە ئامادەکـات. لەگـەڵ ئەوەش لەم کاتانەدا زانیاریـت لـە بـارەی گرێبەسـتی تایبـەت بە بـەکارهێنانی خـوێی باروود بـۆ دەنێـرم. تاوانبـار کـە یـەکێك بـوو لـە دوایـین جەنەڕاڵـە دۆڕاوەکـان و هـەرە لاوازترینیـان گرێبەسـتەکە دەیداتـە دەس دادگـا و بەنـدی دەکـات. گـامولان کـە دەیبینێ ڕادەچڵەکێ. پێـی وایـە دووەمین جارە ئـەم سـەربازە لـە نێـو جـەماوەر دەبـینێ. سـێ هەفتـە لەمەوبـەر بـینی کـە حـوکمی بەسـەر سـەپێنراو ڕەوانـەی مەقسـەلەکرا. هـەمان ئـەو پیـاوەی کـە ڕوواڵـەتێکی سەرسـەخت و بـێ فـڕوفێڵاوی هـەبوو.

هەر هەمان داوانامە بەشێوەیەکی ڕیاکار و تووڕە وەڵامی دەداتەوە و چاکترین وەڵامەکانی دەشێوێنێ. ناکۆکی و مشتومڕی پڕوپووچ و تۆمەتبارکردنی گەورە پیاوان لەلایەن دادوەرەکانەوە ئەوەی لە بیردەباتەوە کە گوایە لە پێناوی داکۆکیکردن لە شەرەف و ژیانی تاوانی ئەنجامداوە. لەم مەسەلەیەدا هەموو شتێك جێگەی گوومان و مقۆمقۆیە، بارودۆخی سووپاکان، ژمارەی سەربازەکان، ئازووقە، فەرمانە پێدراوەکان و وەرگیراوەکان، جموجۆڵی تیپە سەربازییەکان هیچیان لە بارەوە نەدەزانرا. کەس هیچی لە بارەی ئەم کردەوە سەربازییە شڵەژاو بێهودە و بێ ئامانجانە نەدەزانی کە دەگەیشتنە ڕادەی کارەسات، هیچ کەس تەنانەت خودی تۆمەتبار وەك تۆمەتدەر و حاکم و دادوەرەکانیش، شتێکی سەیر بوو کەس بۆ کەس و تەنانەت بۆ خۆیشی دانینەدەنا بەوەی کە لە هیچ نەگەیشتووە. دادوەرەکان دڵخۆشبوون بە دانانی پلان و تاوتوێکردنی تەکنیك و ستراتیجەکان. تۆمەتبار سەبارەت مشتومڕەکە خیانەت لە یاسا سروشتیەکان دەکات. مشتوومڕ بەردەوام لە ئارادا بوو. گامولان لە ماوەی لێکۆڵینەوەکاندا تێبینی ڕێگە سەختەکانی باکوور دەکات کە تیادا سەنووقی گەورە و قوڕاوی و دەبابە لنگاو قوچکەوتووەکانی سەرخەرەند کە لە هەموو ڕێگاکانەوە بەشێوەیەکی نارێك ڕەتلە دۆڕاوەکان دەشارنەوە و لە کاتێکدا سووپای ئەسپسوارانی دوژمن لە هەموو لایەکی ڕەتلە بەجێماوەکان دەردەکەون. لەم سووپا دۆڕاوە گوێی لە بانگەوازێکی گەورە بوو کە تۆمەتی دەدایە پاڵ جەنەڕاڵەوە. لەکۆتایی گفتووگۆیەکان، تارمایی هۆڵەکەی داپۆشی و وێنەی ئاشکرای مارا وەك تارماییەك لەسەرسەری سەرۆك دەرکەوت. دەستەی دادوەران کە داوایان لێکرا ڕای خۆیان دەربڕن، بڵاوبوونەوە. گامولان بە دەنگێکی خنکاو و ڕیتمێکی یەکلاکەرەوە ڕایگەیاند کە تۆمەتبار تاوانبارە بە خیانەت بەرامبەر کۆمار. چرپەی ڕەزامەندی کە لە خەڵکەکەوە بەرزبوو کەوتە ڕاموسانی چاکەخوازییەوە ڕزکارەکەی بڕیارەکە لە ژێر ڕۆشنایی چراکاندا خوێندرایەوە کە تروسکاییە ڕەشباوەکەی لەسەر گۆنا چاڵ و تەڕەکانی تاوانباردا دەلەرزایەوە. لە دەرچوونیا و لەسەر پێپلیکانەکان کۆمەڵی خەڵکە زۆر بڵێ و خۆهەڵقورتێنەرە کە بە دەوریا کۆبوونەوە لە کاتێکدا گوێی لێبوو کە میوانە ڕاهاتووەکانی دادگاکە بەدەم چپاندنی ناوەکەیەوە کەوتبوونە ناساندنی و گامولانیش لەلایەن چەند قسەکەرێکەوە هێرشی کرایەسەر و بەدەم هەڕەشە و گووڕەشەوە داوای سەری شاژنە نەمساوییەکەیان لێکرد. خواوەندەکان تینوویانە، بەشی هەشتەم (کلامان لێڤی، بڵاوکەرەوە).

## مردنی ئیڤاغیست گامولان

لە دوای – تێرمیدۆر، مانگی یانزەهەمین لەساڵی کۆماری فەرەنسی – ڕۆڵەکان ئاوەژووکران. بەڵام ئەناتۆل فرانس لێرە دووبارە لە گۆشە نیگایەکی گوومانکارییانەدا گەشت بە نێو تراژیدیای شۆڕش دەکات. گەر دادوەرە دڵرەقەکان ئێستا لەسەر مێزی تاوانبارەکاندابن ئەوا دادپەروەری بەشێوەیەکی هەمیشەیی بەهۆی شێوە گاڵتەجاڕییەکەی و شایەتە بێویژدان و بینەرە خوێناوییەکانی کەموکوڕی تیادەمێنێ. گامولانی زیندانی تا ئەوپەڕی تینووتاو گازندەی خۆی دەکات بەوەی کە خوێنی باشی نەڕشتووە و ئەمەش بەڵگەیەکی دوولایەنەی ئەم سەردەمە ناوازەیەیە کە

تیادا دەبێ یان بە جەللاد یاخود قوربانی قایل بیت. لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ تەنها خۆشەویستی دەتوانێ هێماکانی ئاسوودەیی پڕ لەژان بخاتە ڕوو. بەڵام نووسەر لە خەیاڵپلاوی دووردەکەوێتەوەو لە دوواپین بەش پاڵ بە دۆستەکەی گامولان دەنێ کە بەخێرایی بکەوێتە ڕیسواکردنی ئاسەوارە خەماوییەکانی خۆشەویستی نێوانیان. ئیڤاغیست کە کەمێك گوڕی[12] دابووە خۆو خەریکبوو لەسەر پێیەکانی ڕاوەستێ لەزیندان دەرهێنراو ڕاپێچی دادگاکرا. لەسەر ئەو تەختە دانرا کە چەندین جار چەندەها تۆمەتباری لێبینیبوو و ناوبەناو قوربانیگەلێکی ناودارو پەنهانی لەسەر دانیشتبوو. ئێستا لەژێر قورسایی حەفتا کەس دەناڵێنی کە زۆربەیان ئەندامی ئەنجوومەنی گشتی. و هەندێکیان سەر بەدەستەی دادوەرانن و وەك گامولان لە دەرەوەی یاسا دانراون. ڕوانییە مێزەکە ئەو دۆسیەیەی لێبوو کە ڕاهاتبوو ئانیشکەکانی لەسەر ڕاگیرکات, ئەو شوێنەی دەبوو تیادا بەرگەی ڕوانینەکانی جاك مۆییل[13] دوفۆرتونێ شاسان[14] و دومۆغیس[15]بغۆتۆو چاوە پاڕاوەکانی ژنە هاوولاتی غۆسمۆغی بگرێ کە وەك یەکێك لە دەستەی دادوەران کاندیدیان کردو پاداشتەکەی بە بڕیاری مردن وەرگرت. ڕوانیە ئەو تەختە دادگایەی کە دەیڕوانیە سەر ئەو شوێنەی دادوەرەکان تیادا لەسەر کورسی دار ئەکاژوی قاوەیی و سووورباوی ڕازاوە بە مەخمەڵی ئۆتغیش دانیشتبوون کە نیوە پەیکەری شاڵی و ماراو نیوە پەیکەرەکەی بغوتوس ڕۆژێ لە ڕۆژان شایەتی ئەوە بوون[16]. هیچ شتێك نەگۆڕا بوو, نە تەورو پایەگەلە چکۆلەو کلاو سوورە پەرداە ڕەشەکان و نەش جوێنی ووتراوی سەر زاری گێڕەری دادگا بەوانەی لەسەرە مەرگدا بوون و نەش ڕۆحیانەتی فوکێ تینڤیل[17]ی کەللە ڕەق و

ماندوو نەناس کە چالاکانە کاغەزە بکوژەکانی دەبزواندو لەگەڵ نزیکبوونی کاتی سێدارەدان دادوەرە هاوڕێو کارامەکانی بۆ ڕەوانە دەکردن. هاوولاتیانی غوماکل لە دەرگاوان و بەرگدروو و دیۆنی نۆبەرەو دارتاشی تیۆنۆڤیل و ئەندامی کۆمیتەی چاودێری بەشی پۆنت_ نۆف دەیانزانی گامولان (ئیڤاغیست) نیگارکێش و هوونەرمەندو دادوەری پێشووی دادگای شۆڕش و ئەندامی پێشووی ئەنجوومەنی گشتییە. شایەتیان لەسەر بردنی حەواڵەیەکی میری بەبڕی سەد پارچە زەوی و بردنی خەرجی هەرێمەکەدا چوونکە ڕاپۆرتیان لەمەڕ بوونی پەیوەندی هاوسێتی و هاوڕێیەتی لەگەڵ یاساغدا هەبوو. لە پێشوازیکردنی ڕوانینەکانی وەڕزبوون وێڕای ئەوەش ئاو هەوا گەرم و تینوویان بوو بۆیە بۆ خواردنەوەی کوپێك مەی بەپەلە بوون. گامولان بۆ ئەوەی بچێتە نێو عارەبانەکەوە تینی بەخۆیدا, خوێنی تیا نەمابوو و برینەکەی ئازارێکی زۆری دەدا. تریشقە ئاژووەکە ئەسپە لاوازەکەی دابووە بەرقامچی. کاژاوەکە لەنێو ژاوەژاوی هۆ هۆ دەستی بەڕۆیشتن کرد. ئەو ژنانەی گامولانیان دەناسی بەڕوویدا قیژاندیان: "دەبڕۆ دەی, خوێن مژ! بکوژی خاوەن ڕۆژانەی هەژدە فرەنك! پێشناکەنێ: بڕوانن چەند زەرد هەڵگەڕاو و ترسنۆکە!" هەمان ئەو ئافرەتانە بوون کە بەدەگمەن جنێویان بە پیلانگێڕان و ئەریستۆکراتەکان دەدا و لەخۆبایی و لێبردووەکان لەلایەن گامولانەوە ڕەوانەی مەقسەلە دەکران. عارەبانەکە بە دەوری وێستگەی مۆرفۆندوس سوڕایەوەو هێدی هێدی گەیشتە لۆپۆنت نۆف و شەقامی لامۆنی و خەڵکەکەش گەیشتە گۆڕەپانی شۆڕش و شوێنی لە سێدارەدانی ڕۆپسپیر. ئەسپەکە بەشەلیەوە دەڕۆیشت: تریشقە ئاژووەکە بەردەوام گوێکانی بەر

قامچـی دەدا. کۆمـەڵی بینـەران خۆشـحاڵ و بـەگوڕ بـوون و هـەوڵی خاوکردنـەوەی کاڵاوەکـەیان دەدا. جەماوەر پیرۆزباییان لەو جەندرمانە کرد کە جڵەوی ئەسـپەکانیان بـە دەسـتەوە بـوو. لـە سوچـێکی شەقامی ئۆغونێ جنێوەکانیان زیادی کرد. لاوان لە بالکۆنـەو ئەوانـەی لـە هـۆڵی چێشـتخانە تازەکـان دانیشـتبوون بـەدەم بەرزکردنـەوەی خاولیـەکانی دەستیان هاواریان دەکرد: دڕندەکان، مرۆڤخۆران، خوێنمژەکان! عارەبانەکە خۆی بە کۆمەڵێك قسـەی نـاخۆش کێشـا کـە بەدرێـژایی دوو ڕۆژی پێشـوو بەردەوام دەوترانەوە، ڕۆڵەی خانەدانەکان خۆشحاڵ دیـاربوون کـە دەیـانگووت: "عارەبانەکـە لـە قـوڕا چـەقیوە! لـە چـڵپاودایە، ئـەی یەعقوبیـەکان، jacobans![18]" گـامولان بـیری کـردەوەو تێگەیشـت "من بەشێوەیەکی ڕەوا دەمرم، بیریکردەوە، ڕەوایە کـە ئێمـە گوێمـان لـەم سـووکایەتی پێکردنانـەی کۆمـاریخوازی دەبێـت کـە دەبـوو بـەرگری لێبکـەین. ئێمـە لاواز بـووین و لێبردووانـە تاوانبـارکراین. خیانـەتمان لـە کۆمارەکـە کـرد بۆیـە شایسـتەی چارەنووسێن تەنانـەت خـودی ڕۆبسـبیری بێگـەردو قەشەش نەرمی و هەڵەی لەسەرەخۆی ئەنجامدا. بە شەهیدبوونی هەڵەکانی کوژانەوە. منیش وەك ئەو خیانەتم لەو کۆمارە کرد کە لەناو چوو. ڕەوای هەقە منـیش لەگـەڵ ئـەودا بمـرم. ئـەو خوێنـەی کۆمکردبـووەوە بـابڕژێ! شایسـتەی ئـەوەم بـا لەناوچـم!" لـە کاتێکـدا بـەمجۆرە خـەونی دەبـینی ناونیشانی وێنەی ئەویندارەکەی[19] بەرچاو کەوت و شالاوێك لە تالاوی نائومێدی و نەرمی بە دەنگەوە لـەنێو دڵیـدا کەوتنـە تـەپاوتل خواردنـەوە. کۆگاکـە داخرابـوو، غیرەکـاری سێ پەنجـەرەی بالکۆنێك بـە تەواوی کەمبووەوە. کاتێکە عارەبانەکە بە بەردەوام پەنجـەرەی دەسەچـەپی خـانووە شینەکەدا گـوزەری کـرد، دەسـتی ژنێـك کـە ئەڵقەیـەکی[20] زیـوینی لـە پەنجە براتووتە دانابوو لە گۆشەی غیرە دوورکەوت و گوڵـە مێخـەکێکی سـووری بـە ئاراسـتەی گـامولان هەڵدا کە دەستە بەستراوەکانی نەیانتوانی بیگرنەوە بـەڵام وەك سـیمبول و وێنـەی لێـوە سـوور و بۆندارەکانی کە دەمی تەڕدەکرد هۆگری بوو. گشت ئەمانـەو هەڵئاوسـانی دیـدە فرمێسـکاوییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ماڵئاوایی کاتێکە ڕووانی چـەقۆی خوێنـاوی مەیـدانی شـۆڕش بەرزدەبێتـەوە. خواوەنـدەکان تینوویانـە، بەشـی هەژدەیـەم (کالمان لێڤی، بلاوکەرەوە).

## پەراوێزەکان

1–سێپتیسیزم، *scepticisme*، گومانکـاری: دۆکترینێکـی گومانکارییـە کـە گومـان لـە پرەنسـیپە بنچـینەییەکانی ئایین لە نەمری و سروش دەکات.

2–مەبەست لە بەڵگەی بێتاوانی دریفۆسە.

3–لـە داوانامەکـە دریفـۆس لـە سـاڵی 1906 مـافی بێتاوانی پێدەدرێتەوە.

4–زۆربـەی لاپـەڕەکانی کتێبەکـە بـۆ گێـڕە شـێوێن و جـەنگاوەرە کـەهنووتی و نەتـەوە خـوازو مۆنارشیسـتەکان تـەرخانکراوە کـە هـانی خـراپ مامەڵـەکردنی جولەکـەیان دەداو گـەلێ جـار لـە ڕێگـەی دەمەقاڵـەو مشـتوومڕ بـەرەنگارییان دەبوونـەوەو هـەوڵی شـۆردنەوەی مێشـکی لایـەنگرانی دریفـۆس و کۆماریخوازەکانیان دەدا.

5–لە _*Lanneau Amethyste*_ مازۆغی یـەعقوبی لەگـەڵ مسـیۆدو تێغیمۆنـدغی ئەرسـتۆکرات ڕێکـەوت بـۆ ئاشـکراکردنی ئـەوەی کـە دادگایـەکی پێکهـاتوو لـە چـواردە ئەفسـەری فەرەنسـایی نـەیتوانی دووچـاری بەدحاڵیبوون بێت.

6–ئاماژە بەو فرۆفێلانەیە کە ڕێخۆشکەربوون بۆ تاوانبارکردنی دریفۆس. ئەناتۆڵ فرانس لە دوورگەی بەتریقەکاندا, 1908_ گاڵتە بە کەفوکوڵی چەتوونی ئەنتیمیست دەکات لە زۆرکردنی بەڵگەکانی تاوانەکە. یەکێکیان بەتین و تاوێکی گاڵتە جارەوە هاوار دەکات: مـن لـەوێوە چـاوەنواڕی چـەتوونیەکانی بغـێم و باروبارگەکانی میلبۆغن دەکەم کە وەك بەڵگە نامەو قەواڵە ساختەکان بەشێوەیەکی گشتی باشتر جێگەی ڕاستیەکان دەگرێتەوە. سەرەتا بۆ پێویستی مەسەلەکە بە ئەنقەست و لەسەر داخوازی و بەپێی توانا ئەنجام دران و لە ئاکامدا بوونە ڕاستی.

7–ئاماژە بەسوودو زیانی حکوومەتی کۆماری دەدات.

8–ووشەی خێرخـواهی لـە بنچـینەدا بـۆ ووشـەی ئـەغریقی ئێلێۆسـونا دەگەڕێتـەوە کـە واتـای بـەزەیی پیاهاتنەوە دەبەخشێ.

9–لـە مسـیۆ تۆمـاس نووسـەر خـۆی ئـەو هەڵسـوو کەوتانـەی ڕادەگەیانـد کـە بـریتی بـوون لـە بیرۆکـەی بەرجەسـتەکردنی شـایەتەکان و گەیانـدنیان بـۆ ئاسـتی شێواندنی ڕاستیەکان.

10–ئـەم ڕاپۆرتـە نادروسـتە چـوونکە لـە ڕاسـتیدا کفانکۆبیل لە وەڵامدا ووتی جارێ چاوەڕێی پارەکەی دەکـات کەچـی پۆلیسـەکە ئـەم ڕەتکردنـەوە ڕۆتینیـەی بـەجنێو دایـە قەڵـەم بـەمجۆرە لـە ڕوانگەیـەوە هـەر جنێوێك بە گوێرەی پێویست شێوەیەکی باو و بەربڵاو بگرێتـە خـۆ ئـەوا نزیکـە مانـای ووتـەی _مـردن بـۆ مانگاکان_ دەداتە دەست.

11–سـەرۆك دادگـا کارامانـە بـەرگری لـە لایەنگرەکـەی دەکـات. نووسـەر لێـرەدا هـەل دەقۆزێتـەوە بـۆ گاڵتـەکردن بـە نەتـەوە خـوازە لـەخۆ بـاییو سەرسـامە تووندڕەوەکانی سووپا.

12–هەوڵدەدات خۆ بداتە بەرچەقۆ.

13–گامولان بە هەڵە وەك دوژمنی خۆی سەیری دەکرد.

14–کابرایـەکی ئەرسـتۆکراتیەو دۆسـتی خوشـکی ئیڤاغیستە.

15–بغۆتـۆ دبزیلێـت ئەریسـتۆکراتیەکی ڕووخـاو ئەبیقۆرییـە کـە گـەلێ جـار حوکمـە گومانکارییـەکانی بیروڕای نووسەر دەخەنە ڕوو.

16–لەکاتی سەپاندنی حوکم بەسەر شاساندا.

17–داواکاری گشتییە.

18–ژاکۆبـا, یەعقوبیـەکان: ئەنـدامانی یانـەی کۆماریخوازەکانن کە لە ڕۆژگارەکانی شۆڕشی فەرەنسی دانیشتنەکانیان لە دێری قەشە یەعقوبیەکان سازدەکرد. (وەرگێر, فەرهەنگی مەنهەل)

19–ئەو شوێنەیە کە ئەویندارەکەی تیادا دەژیا.

20–مەبەسـت لـەو ئەڵقـەی نیشـانکردنەیە کـە گـامولان خستبوویە پەنجەی.

## سەرچاوە

*xx e siecle, collection litteraire lagarde et michard anatole france, humanisme et scepticisme page 87-98*

# ئەرستۆ
# گفتوگۆ لەگەڵ مارتا نوس باوم-دا

برایان ماگی
لە فارسییەوە: محمد کریم

## پێشەکی

**مـــاگی:** بـیرو بۆچـوونی ئێمـە سـەبارەت بـە فەلسـەفەی جیهانی کۆن لـە ژێـر کاریگـەریی تونـدی دوو فەیلەسوفدایە: ئەفلاتون و ئەرستۆ.

ئـەفلاتون یەکـەم فەیلەسـوفە کـە بەرهەمـەکانی بەو شێوەیەی کە لـە قەڵەمەکەی خۆی چۆڕاوەتەوە بـە ئێمـە گەیشـتووە. ئەرسـتۆ دیـارترین قوتـابی ئـەفلاتون بـوو. ئـەو زنجیرەیـەی کـە لێـرەدا ڕووبەڕوومان بۆتـەوە، نـاوازە و نائاساییە. ئەرستۆ قوتابی ئەفلاتون بوو، ئەفلاتونیش قوتابی سوکرات. گومـان هەیـە سـەبارەت بـەوەی کـە هـەتا ئـەمڕۆ فەیلەسوفێ هەبووبێ کە نفوز و کاریگـەریی لـە هـەر کام لەم سێ فەیلەسوفە زیاتر بری کردبێ.

ئەرسـتۆ کـوڕی پزیشـکی دەربـاری پاشـای مەکدۆنیا بوو. ساڵی (384 پ.ز) لە "ستاگیرا" هاتە دنیاوە و بۆ خوێندن نێردرا بۆ ئەسینا و لـە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا چووە ریزی قوتابییەکانی ئەفلاتونەوە لە ئەکادیمیاکەی و هەتا کاتی مردنی مامۆستاکەی لە ساڵی (347 پ.ز)دا، بیست ساڵ لـەوێ مایـەوە. پاشان ئاوارە بوو و لەبەر هۆکاری سیاسی دوانزە ساڵ دوور لە نیشتمانەکەی ژیا.

لەم ماوەیەدا زیاتر سەرقاڵی بایۆلۆجی بوو و "ماوەیەکی کەمیش مامۆستای ئەسکەندەری گەورە بوو". پاشان گەڕایەوە بۆ ئەسینا و قوتابخانەیەکی بە ناوی (لوکیڤن)ەوە دامەزراند و دوانزە ساڵ لـەوێ مایـەوە. بـەڵام دیسـان ناچـار بـوو بارگـەو بنـەی سـەفەر بپێچـێتەوە دوای ئـەوە بـە سـاڵێك لـە ساڵی (322 پ.ز)دا، لە تەمەنی (62) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

تـــەنها (2/5)ی بەرهەمــــەکانی ئەرســــتۆ ماونەتەوە، بەڵام ئەم بڕەش دوانزە بەرگ دەبێت و هـەموو زانیارییـەکانی سـەردەمی ئەرسـتۆ لـە خـۆی دەگرێ. بۆ بەدبەختی هەموو ئەو بەرهەمانەی کە ئەرستۆ خۆی بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەی کردبوون لە

سەراپای ڕۆژگاری کۆندا بەهۆی جوانی ستایلی نووسینیەوە مایەی ستایش بوون، لەناوچوون. ئەوەی ئەمڕۆ لەبەردەستماندایە کۆمەڵێ یاداشتە کە ئەرستۆ بۆ وانەکانی ئامادەکردووە و بە گشتیی ئەو هونەرە ئەدەبییەی تیا نییە کە لە نووسینەکانی ئەفلاتوندا بەدیدەکرێ کە لەبەردەستدان. بەم حاڵەوە، گومانێك سەبارەت بە چۆنێتی ناوەڕۆك و کاریگەریی ئەم نووسینانە لە ئارادا نییە. ئەو کەسەی کە بۆ قسە و باس لەم بوارەدا لێرە ئامادەیە، خانمی پرۆفیسۆر مارتا نوس باوم (*Martha Nussbam*)ە کە مامۆستای زانکۆی براونە لە ئەمریکا کە زۆر زوو لە ژیانیدا ناوبانگێکی پتەوی سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی ئەرستۆیی بەدەست هێنا.

## کرۆکی باسەکە

**ماگی:** ڕەنگە باشترین ڕێگە بۆ دەستپێکردنی باسەکە ئەوە بێت کە تۆ بە خێرایی نەخشەیەکی ئەو بوارانەمان بۆ ڕەسم بکەی کە بەشێوەیەکی گشتی بەرهەمەکانی ئەرستۆ دەیانگرێتەوە.

**نوس باوم:** مامەڵەی ئێمە لەگەڵ ئەرستۆدا لەگەڵ دەسکەوتێکی فەلسەفی زۆر بەرفراوان و ئاڵۆزدایە — واتە کارە بنچینەییەکان لە لۆژیك و گشت زانستەکانی ئەو سەردەمەدا، وەکو بایۆلۆجیا کە تا هەزار ساڵ لە بەرهەمەکانی دوای ئەودا بێوێنە بوو. پاشان کۆمەڵێ کارمان لەبەردەستدایە دەربارەی بنەما گشتییەکانی دۆزینەوەی هۆی زانستی، کۆمەڵێ کاریتر دەربارەی شتە گشتییەکانی زانستی سروشتی، کۆمەڵێ کار لە میتافیزیکدا وەکو مەسەلەکانی گەوهەر و چییەتی و بەردەوامیی، کۆمەڵێ کار سەبارەت بە ژیان و هێزە دەروونییەکان، دواجار کۆمەڵێ کاری ناوازە و بۆ یەکەم جار لە ئاکار و سیاسەت و هونەری گوتاربێژی و ناساندنی مەسەلە ئەدەبییەکان.

**ماگی:** ڕاستی سەرسوڕهێنەر ئەوەیە کە بەدرێژایی سەدان ساڵ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و لە سەراپای بابەتە بەرفراوان و بێوێنەکاندا قسەی ئەرستۆ وەکو بەڵگە حسابی بۆ دەکرا. تۆماس ئەکوینی، گەورەترین فەیلەسوفی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، لە هەر جێگەیەکدا بیویستایە ئەرستۆ بەیاد بهێنێتەوە، تەنها دەینووسی "فەیلەسوف".

**نوس باوم:** بەڵێ، ڕاستە" هەر بۆیە من پێموایە بۆ پەیبردن بە بیری ئەرستۆ تووشی کێشەی لەمجۆرە دەبین. هەروەکو وتت، وەکو عادەت ئەرستۆ لە مێشکی ئێمەدا بووە بە بەرزترین سەرچاوە و گەورەترین فەیلەسوف، یان دانتی گوتەنی "مامۆستای هەموو زانایان" و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشتووە.

من پێموایە ئەمە دەبێتە ڕێگر لەبەرئەوەدا کە ڕوو لەوە بکەین ئەرستۆ لەڕاستیدا یەکێك بووە لە نەرمونیانترین و بێلایەنترین فەیلەسوفەکان کە فەلسەفەی وەکو کۆششێکی لە وەستان نەهاتوو و بەردەوام لێکداوەتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی هەموو ئاڵۆزییەکانی ئەزموونەکانی مرۆڤ و هەرگیز نەوەستاوە و هەمیشە لە لێکۆڵینەوەی ئەوەدا بووە کە بەڵکو دیسان ڕێگەی باشتر بۆ گونجاندنی ئەو ئاڵۆزیانە لە بیری خۆیدا بدۆزێتەوە.

**ماگی:** بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە سنوورێکی زۆر بەرفراواندان. ئایا لەم پانتاییە گەورەیەدا هیچ فاکتەرێ هەیە کە بەشەکان یەکبخات یان شێوە مامەڵەیەکی یەکسان هەیە کە بکرێ باسی بکەی؟

**نوس باوم:** بەڵێ، پێموایە هەیە. ئەرستۆ دەڵێ کە "لە هەر بوارێکدا" دەبێت فەیلەسوف، بە قسەی ئەو، یەکەم "ئاماژەکان" تۆمار بکات و پاش پشوودان لە ئەمدیو و ئەودیوکردنی ئەو نهێنیانەی کە "ئاماژەکان" پێکیان هێناوە، دوبارە بگەڕێتەوە سەر "ئاماژەکان" و ئەم جارە، دیسان بە قسەی ئەو، ئەو "ئاماژانە" بپارێزێ کە "ژمارەیان لە هەموویان زیاترە و بنچینەییترن". بۆ ئەوەی مەعنای ئەم قسەیە روون بێتەوە، نموونەیەك دەهێنمەوە. با وایدابنێین تۆ فەیلەسوفێکیت و لەسەر مەسەلەی "کات" ئیش دەکەی. بە باوەڕی ئەرستۆ، یەکەم شتێ کە دەبێ بیکەی ئەوەیە کە دەبێ "ئامـاژەکان"ی کات تۆمار بکەی، واتە ئەوەی ئێمە دەیبینین حەقیقەتی مەسەلەی کاتە. خودی ئەرستۆ نەك تەنها ئەزموونی هەستکردنی ئێمە سەبارەت بە بەدوای یەکداهاتن و ڕیزبەندی و بەردەوامیی کات، بەڵکو باوەڕ و قسە ئاساییەکانیشمان سەبارەت بە کات دەخاتە ژێر هەمان ناونیشانەوە. بێگومان دەمەوێ جەخت لەم بابەتە بکەمەوە لەبەرئەوەی چەمکی "ئامـاژە" هەندێ جار بە مانایەکی زۆر سنووردار بە خراپ گوزارشتی لێکراوە و هەندێ بە هەڵە وا بیریان لێکردۆتەوە کە مەبەستی ئەرستۆ تەنها دەرك پێکردنی هەستیی یان "بینین"ە. بەداخەوە ئەم بەدحاڵیبوونە چۆتە ناو زۆر لە وەرگێڕانە ئینگلیزییە کامڵەکانیشەوە بە جۆرێ کە خوێنەر ڕاست لە حەزی لە ڕادەبەدەری ئەرستۆ بۆ زمان و بیر و باوەڕی باو تێناگات. باشە، ئێستا هەموو ئەمانە تۆمار دەکەی بۆ ئەوەی ببینی ئایا ناکۆکیان لە نێواندا هەیە یان نا. ئەگەر ناکۆکیەکت بینی، دەبێ دەست بکەی بە یەکسانکردن و ڕێکخستن. ئەگەر ناکۆکیەکە چارەسەر نەکرا، دەبێ بزانی کامانە لە بیرو باوەڕەکانت لە باقی ئەوانی دی بنچینەییتر و بنەڕەتیترن. ئەوانە هەڵدەگریت و باقی ئەوانی دی کە لەگەڵ ئەمانەدا ناکۆك بوون دەخەیتە لاوە و بەم پێیە دیسان دەگەڕێیتەوە بۆ لای زمان دەربڕینی سادە و ئاسایی، بە کورتی بە تێگەیشتن و بینایەکی باشتر.

**ماگی:** کات، یان هەر شتێکی دیکە، لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە لە بارەیەوە قسە دەکەین جیاوازە. ئایا ئەرستۆ لە نێوان جیهان و دەربڕین و گوزارشتکردنی ئێمەدا بۆ دنیا جیاکردنەوەیەکی روون و ئاشکرا دەکات؟

**نوس باوم:** هەروەکو وتم چەمکی ئەرستۆ سەبارەت بە "ئامـاژە" چەمکێکی زۆر فراوان و گشتییە“ چەمکێکە سەبارەت بەوەی جیهان چۆن لە ئێمەوە دیارە و هەم ئەزموونە هەستیەکانی ئێمە و هەم گوتە و بیروباوەڕی ئاسایی ئێمە لە خۆی دەگرێ. مامەڵەیەکی فراوانە کە دەکرێ دابەش بکرێ بۆ بەشی لابەلا و ئەرستۆ بە تەواوی ئەوە پەسەند دەکات کە ئێمە هەندێ جار زیاتر پشت بە هەستەکانی خۆمان دەبەستین و هەندێ جاریش زیاتر پشت بە قسەو تیۆری ئاسایی دەبەستین. بەڕای من ئەرستۆ لەسەر حەقە کە پێی وایە ئەم مامەڵەیە گشتێتی تێدایەو فاکتەری یەکخەرە. بۆچوونی ئەرستۆ –کە بەباوەڕی من بۆچوونێکی زۆر ژیرانەیە– ئەوەیە کە هەستیش وەکو باوەڕ, خاسیەتی دەربڕین و هەڵبژاردنی هەیە. شێوەی تێگەیشتنی ئێمە لە هەر شتێ, بەشێکە لە تێگەیشتنی عەقڵیی ئێمەو کار لەوە دەکات, کە چ مانایەك لە جیهان بەرهەم دەهێنین.

**ماگی:** ئایا ئەو مەترسیە لە ئارادا نییە کە ئەم شێوە مامەڵەیە کەمێ سووك و چروك بکەوێتەوە؟ ئەگەر ئەرستۆ هەمیشە لە شتی ئاسایی و ئاشناوە

دەســت پێــدەکاتو دیســان هەمیشــە دواجــار دەگەڕێتەوە سەر هەمان ئەو شتانە, ئایا ناکرێ بگوترێ فەلسەفەکەی لەسەر ئاستی مەسەلەکان سنووردارە – واتە هەم لەسەر ئاستی جیهان و هەم لەسەر ئاستی ئەزموونەکانی ئێمە – لەکاتێکدا ئەوەی لای ئێمە پێویستە, شتێکە زیاتر لەوە دەچێ کە ئەفلاتوون دەمانداتێ, واتە فەلسەفەیەک کە بچێتە ئەودیوی (یان قوڵایی)مەسەلەکانەوە لەسەر ئاستێکی قوڵترو بنەڕەتیتر کە لە ڕاستیدا ئاستی مەسەلەکان هاوڕێکی ئەو ئاستەیە؟

**نوس باوم:** پێم وایە تۆ ڕاست دەکەی کە باسی ئەفلاتون دەهێنیتە ئاراوە. بێگومان وایە کە بەپێی وێنایەک کە ئەفلاتونو ژمارەیەکی زۆر لە خاوەنی ڕێبازی فەلسەفی یونان بەر لە ئەفلاتون مەبەستیان بووە, فەلسەفە دەبێ بچێتە (پشت پەردە) وەو هەتا "ئەوسەری سنوور"بڕوات. بەپێی وێناکردنی ئەفلاتون, زەینی فەیلەسوف دەبێ بگاتە کەناری گەردوونو لەوێوە بە ڕاستیەکی بالاو بەرزو فراوانترەوە لە ئەزموونەکانی ئێمە بڕوانێ. بەڵام پێموایە ڕەنگە ئەرستۆ لەم بارەیەوە دوو تێبینی هەبێ. یەکەمیان ئەوەیە کە دەیگوت ئەزموونە ئاساییەکانی ئێمە بۆ خۆیان ئەوەندە سەرسوڕهێنەرو سەیرو دەوڵەمەندو جوانن کە پێویستمان بەوەیە کە بۆ ئەوەی بابەتێکی شایستەی فەلسەفە پەیدا بکەین, بچینە ئەودیویەوە. دووەمیان ئەوەیە دەیگوت بە کردەوە تێپەڕبوون لە سنووری شتە ئەزموونکراوەکان بە شێوەیەک کە مانایەکی لێدەستکەوێ لە توانای ئێمەدا نییەو تەنها کارێ کە بەڕاستی لە دەستمان دێت لێکۆڵینەوەیە لەو شتانەی تاقیمان کردوونەتەوە لەگەڵ دیاریکردنی سنورو تایبەتمەندییەکانیان. بۆ ئەوەی لەم بوارەدا پەی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەرستۆ بەریت, نمونەیەک باس دەکەم. یەکێک لە پرانسیپە بنەڕەتیەکانی بیری ئەرستۆ پرانسیپێکە کە ئەو ناوی ناوە پرانسیپی ڕێگرتن لە ناکۆکی. بەپێی ئەم پرانسیپە, هیچ بابەتێ ناتوانێ لەیەک کاتداو لەیەک ڕووەوە, سیفەتی ناکۆکی هەبێ. بۆ نموونە, جلەکانی من لە یەک کات و شوێنو لەیەک ڕووەوە ناتوانێ هەم شین بێو هەم شین نەبێ. ئەو قسە ماقوڵەی ئەرستۆ کە لەم بارەیەوە دەیکات ئەوەیە کە ئەم پرانسیپە, پرانسیپێکی زۆر بنەڕەتییەو "دڵنیاترین پرانسیپە"– بەڕادەیەک بنەڕەتیە کە دیارە هەمیشە لە بیرو قسەکانماندا بەکاردێ. باشە, بەڵام ئێمە چۆن ئەم پرانسیپە بنەڕەتیە کە بە قسەی ئەرستۆ, بنەڕەتیترین پرانسیپە، ئاراستە بکەین؟ ئەگەر سەرنج بدەین کە ئەو چۆن لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا مامەڵە دەکات, ڕەنگە باشتر لە بانگەشەکەی ئەو بگەین کە دەبێ فەلسەفە لە سنووری ئەزموونەکانی ئێمەدا بێ. لە بەشی چوارەمی کتێبی "میتافیزیک" دا دەڵێت:"ئێمە ناتوانین پرانسیپی ڕێگرتن لە ناکۆکی لەسەر بنەمای شتێک لە دەرەوەی مەیدانی ئەزموونەکان ئاراستە بکەین چونکە ناچارین لە بەدەستهێنانی هەر ئەزموونێکو بۆ ڕێکخستنو مشتومالّ کردنی شتە ئەزموون کراوەکان ئەم پرانسیپە بەکاربێنین. پاشان دەڵێت:" وایدابنێ بەرامبەر مل بۆ قبوڵکردنی ئەم پرانسیپە نادات. بەڵام کێشەیەک نییە" دیسان وەڵامێکمان هەیە کە بەوی بدەینەوە. دەڵێت: یەکەم دەبێ ببینی ئایا بەرامبەر ئامادەیە شتێکت پێبڵێ و بیروبۆچوونێکی بێچەندوچۆن دەربڕێ؟ ئەگەر ئامادە نەبوو شتێ بڵێ, دەتوانیت بیخەیتە لاوە چونکە بە قسەی ئەرستۆ, "کەسێک کە شتێ نەڵێ, لەو ڕووەوە کە هیچ نالێ, وەکو گیایەک وایە" بەڵام وایدابنێ شتێ

دەڵێ‌و شتێکی بێچەند و چونیش دەڵێ. بە باوەڕی ئەرستۆ, لەم حاڵەتەدا دەتوانی بۆی بسەلمێنی کە خودی ئەو کەسە– بەدەر لەوەی ژن بێ یان پیاو — کاتێ شتێکی ئامادەو بێچەندو چوون دەڵێ, لەڕاستیدا هەمان ئەو پرانسیپە بەکاردەهێنێ کە قبوڵی نییە, چونکە لە هەموو قسەیەکی بێچەندو چوندا, تۆ بە ناچاری شتێ ڕەت دەکەیتەوە, واتە بەلای کەمەوە دژی ئەو شتە ڕەت دەکەیتەوە کە پێی قایلی.

**ماگی:** زۆر باشە, بەئاسانی دەکرێ ئەوە بەدیبکرێ کە ئەم جۆرە پرانسیپە لۆژیکیانە چۆن لە گەوهەرەکانی گوتەکانی ئێمەن, بەڵام ئەوە ڕوون نییە چۆن دەتوانن بۆ ئەو بەشەی زانینی ئەو جیهانەی کە ئەرستۆ خوازیارێتی, بنەمایەك فەراهەم بکەن.

**نوس باوم:** ئەو شتەی کە ئەرستۆ دەیەوێ بیڵێ ئەوەیە کە ئێمە بۆ هیچ پرانسیپێ ناتوانین یەکڕاست لە دەرەوەی سیستمی پەسەندکردن و وێناکردنەکانمان بنەمایەك فەراهەم بکەین. ئەگەر تەنانەت بنەڕەتیترین پرانسیپیش بەو چەمکە لە خودو لە ناخی ئەزموونەکانی ئێمەدابێ, نەخێر, بەو جۆرەی ئەفلاتوون باوەڕی پێیەتی, "لەو دیوی سنوور" ئەو حوکمە دەبێ وەکو یەکەمجاری سەبارەت بەو پرانسیپانەش ڕاستبێ کە بنەمایان بە پێچەوانەی پرانسیپە بنەڕەتیەکانەوە هێندە تۆکمە نییە. پرانسیپەکان بەپێی پێگەو شوێنیان لە تێگەیشتنی ئێمەداو ئەو ڕۆڵەی کە لە تێگەیشتنەکانی ئێمەدا هەیانە ئاراستە دەکرێن, نەك لەسەر بنەمای شتێکی تەواو دەرەکی. شتێك کە تەواو لە دەرەوە بێ مەحاڵە بچێتە ناو بیرو گوفتاری ئێمەوەو بەم پێیە لە تێڕوانینی ئێمەوە لە بنچینەدا شتێ بێ. ئەرستۆ کاتێ دەربارەی گوفتارو پەسەندکردن قسە دەکات, ڕاڤەیەکی زیاتر لەو بارەیەوە دەدات. بە باوەڕی ئەو, ئێمە تەنها دەتوانین بۆ شتێ بە بەڵگە قایل بین کە لە بازنەی ئەزموونی بەلای کەمەوە یەکێکماندا بێ‌و بەلای کەمەوە چووبێتە ناو بەشێ لە نەریتی هاوبەشی زمانمانەوە. دەڵێت تەنها کاتێ بۆ نمونە دەتوانین بۆ هەورە گرمە بە بەڵگەی گوتراو قایل بین کە یەکێك گرمەیەکی لە هەور بیستبێ. لەو حاڵەتەدا, لەسەر بنەمای ئەو ئەزموونەی بە دەست هاتووە, دەتوانین زاراوەی "هەورە گرمە" بە ئەنجامی ئەو گرمەیە بزانین هەتا ئەگەر هێشتا نەزانین کە ئەو گرمەیە چۆن دەنگێکەو چ شتێ هۆی ئەوە بووە. پاشان لەسەر ئەو بنەمایە دەشێ بپرسین:" ئەو دەنگەی کە بەرگوێمان کەوتووە چییە؟ و هۆکەی چییە؟" و بەهەمان شێوە درێژە بە لێکۆڵینەوە بدەین تا بزانین لە ڕاستیدا هەورە گرمە چییە. بەڵام ئێستا وایدابنێ بمانەوێ بە تەواوی لە دەرەوەی ئەزموونەکانمانەوە بوەستین‌و گەوهەرێ یان چەند گەوهەرێ بکەینە بنەمای قسەو لێکۆڵینەوەو بەڵگە هێنانەوەکانمان کە هەرگیز لەلایەن هیچ مرۆڤێکەوە تاقی نەکراونەتەوە. بە باوەڕی ئەرستۆ، لەو کاتەدا مەسەلەکە بەو شێوەیەی لێدێ لەبەرئەوەی ئەو گەوهەرانەی هیچ پەیوەندییەکیان بە ئەزموونەوە نییە، ناتوانین بە بەڵگەیەك قایل بین بۆیان یان بە جۆرێ لە بارەیانەوە قسە بکەین کە قسەکەمان مانایەکی هەبێ. با نموونەیەکی ئەفلاتونی لەبەرچاو بگرین — واتە ئەو گەوهەرانەی کە بوونیان یەکسەر لەسەرخۆیان وەستاوە و لەم ڕووەوە، لە گەوهەری پەتی خۆیاندا، هەرگیز بۆمان تاقینەکراونەتەوە و، لەگەڵ ئەوەشدا، گریمان وایە کە هەموو تێگەیشتنێکی ڕاستەقینە سەبارەت بە جیهان دەبێ لەسەر بنەمای ئەو گەوهەرانە بەرهەم

بێت. ئەرستۆ لە پێناوی رەخنەدا، نموونەی سپێتی دەکاتە بەڵگە کە دەوترێ سپێتی پەتی و بێغەشە — واتە سپێتی شتێك یان رەنگی هیچ تەنێ نییە، بەڵکو سپییە بەبێ هیچ پەیوەستیەك و هەروا "خۆی لە خودی خۆیدا" لەوێدایە. ئەرستۆ دەڵێت درێژەدان بە قسەیەکی ئاوا نەك هەر سوودێکی نییە و هۆیەك نیشان نادات، بەڵکو بێ مەعناو بێبایەخە. ئێمە ناتوانین بە هۆیەك بۆ سپێتی پەتی و بیغەش بەبێ هیچ پەیوەستییەك قایل بین لەبەرئەوەی هەتا ئەو شوێنەی کە تاقیمان کردۆتەوە، سپێتی هەمیشە رەنگی تەنێ بووە و پەیوەست بووە بەو تەنەوە. لێرەدا ئەرستۆ بە ریتمێکی بێئەدەبانەو تاڕادەیەك توندەوە دەڵێت: "کەواتە دەبێت ماڵئاوایی لە نموونەی ئەفلاتونی بکرێ، لەبەرئەوەی نمونەکەش وەکو ئەوەی کە یەکێك تێهەڵکاتە گۆرانی و بڵێ زەریا، زەریا، ئەمانە شتی بێبایەخن و بە هیچ جۆرێ پەیوەندیان بە گوفتار و قسەی ئێمەوە نییە."

**ماگی:** کەواتە ئەگەر ئەرستۆ پێی وایە کە لێکۆڵینەوەی سوودمەند دەبێ لە سنووری جیهانی ئەو ئەزموونانەدابێ کە هەن و دەکرێ بەدەستبهێنرێن، چ لایەنێکی "فەلسەفی" تایبەتی بۆ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە دەمێنێتەوە؟ ئایا، بەم پێیە، هەموو ئەو بەرنامەیەی کە رێکخراوە لەو گوتەزایەوە نابێ کە ئێمە ئەمڕۆ ناوی لێدەنێین زانست؟

**نوس باوم:** بڕوانە، ڕاستیی ئەوەیە کە ئەرستۆ جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان زانست و فەلسەفەدا ناکات. باوەڕی وایە کە بە گشتی توێژینەوەیەك بۆ دۆزینەوەی هۆ هەیە و ئەم هۆ دۆزینەوەیە ملکەچی بنەمایەکی تایبەتییە کە هاوبەشە لە نێوان هەموو توێژینەوە تیۆریەکاندا (بەلام بە ئاشکرا زانستی ئاکار و زانستی سیاسەت لە شمولکردنی ئەم باسە دەردەهێنێ چونکە بەڕای ئەو، ئەم زانستانە بنەماکەیان لەسەر ریزبەندی بنیات نەنراوە). لە یەکێك لە نووسراوەکانیدا کە ناوی ئانالوتیکای دووەم – *Posterior Analytics* —ە، ئەوە باس دەکات کە فەیلەسوف چۆن دەبێ لەهەر بوارێکدا بەدوای تێگەیشتنی زانستی — یان بە قسەی خۆی بە دوای —*episteme*—دا بڕوات. لە هەر لێکۆڵینەوەیەکی تیۆریدا، فەیلەسوف دەبێ ئەو پرانسیپانە بدۆزێتەوە کە لە پێش پرانسیپەکانی ترەوەن و لەوان بنەڕەتیترن و بەبێ چەند و چۆنیەکی زیاترەوە ئاشکرا دەبن. هەروەکو لە پێوانەدا، ئەنجام لە پێشەوە بە پێویست دەزانرێ. ئەنجامەکانی ئەو زانستەش لە هەمان پرانسیپ یان سەرەتا بە پێویست دەزانرێن. بە باوەڕی ئەرستۆ، هێزێك لە ئێمەدا هەیە کە بە شێوەی بینین لە پرانسیپە سەرەتاییەکان دەگەین. دەمەوێ لێرەدا هەڵوێستەیەك بکەم، چونکە بەرای من، ئەمەش خاڵێکی دیکەیە لە ئەرستۆدا کە بە زۆری دوچاری بەدحاڵیبوون بووە. ئەو هێزەی کە گوتمان، بە یۆنانی پێی دەوترێ " نۆس — *Nous*" نۆس یەکێکە لەو چەند واژەیەی کە لە یۆنانیدا بە مانای عەقڵ یان دەروون دێت بەشێوەیەکی ئاسایی بانگەشەی جۆرێك بینینی راستەوخۆ و دەرککردنی بەرچاو دەکات لە بەرامبەر هێزی باس و بەڵگەهێنانەوەدا. ئەرستۆ دەڵێ ئێمە لە ڕێگەی ئەم هێزی دەروونەوە لە پرانسیپە سەرەتاییەکان تێدەگەین. چەندین سەدە وادەزانرا کە "نۆس" هێزێکی تایبەتە بۆ بینینی عەقڵی بێغەش کە توانای ئەوەمان دەداتێ لە دنیای ئەزموون بچینە دەرەوە و بە کورتی بەر لە تاقیکردنەوە لە شت تێبگەین.

بەلام بە حسابكردن بۆ ئەوەی تا ئێستا وتوومە، پێموایە پەی بەوە ببەی كە بۆچی مـن باوەڕم وایە كە ئەرستۆ دژی بنەمایەكی لەمجۆرەیە بۆ زانست. هەتا لەم دواییانەدا ئەو كەسانەی كە سەرقالی راڤە و لێكدانەوەی كتێبی "ئانالۆتیكای دووەم" بوون، بەڵگەی تەواو سەلمێنەریان هێنایەوە كە بنەمای ئەو گوزارشتە كۆنە، بە هەڵە خوێندنەوەی تێكستی دەستنووسی ئەرستۆ بووەو، لە ڕاستیدا "نۆس" بەشێكی بینینە كە ئێمە بە یارمەتی ئەزمون، سەبارەت بە ڕۆڵی پرانسیپەكان لە دۆزینەوەی هۆدا بە دەستی دەهێنین بۆ ئەوەی بتوانین لە رووی زانستیەوە كاروبارەكان ئاراستە بكەین.

**مـاگی:** ئەرستۆ یەكەم بیریاری سەرەكی خۆرئاوایی بوو كە هەوڵیدا بە پۆلین كردنی زانستەكان ناونیشانی هەریەكەیان دیاری بكات. لە ڕاستیدا هەندێ لە ناوی زانستەكان كە هێشتا بەكاردێن، لە ئەرستۆوە بۆمان ماوەتەوە.

**نوس باوم:** بەڵێ، پێموایە ڕاستە و پێشموایە لێكۆڵینەوەكانی ئەرستۆ هێشتا بۆ ئەو كەسانەی لەو زانستانەدا كاردەكەن گرنگە، بە تایبەتی لە بایۆلۆجیادا كە لەم دواییەدا ئەوە ئاشكرابووە لێكۆڵینەوەكانی لە رووی دۆزینەوەی هۆ و هۆكاردا، زۆر مایەی سەرنجن و گرنگن.

**مـاگی:** دەكرێ باسی نموونەیەك بكەی سەبارەت بەوەی كە ئەرستۆ چۆن بواری هەر بابەتێ بەشێوەی لقێكی لێكۆڵینەوە یان زانست دیاری دەكات؟

**نـوس بـاوم:** ئەو نموونەیەی كە دەمەوێ باسی بكەم لە نێو زانستەكاندا، بەو مانایەی كە ئێمە مەبەستمانە، هەڵنەبـژێردراوە" بەڵكو لە لێكۆڵینەوەیەكی گشتیی ئەرستۆوە دەربارەی "دوای سروشت" یان میتافیزیك وەرگیراوە سەبارەت بەوەی ئەو ناوی لێدەنێ "گەوهەر".

**مـاگی:** تكا دەكەم سەرەتا روونكردنەوەیەك دەربارەی زاراوەی "دوای سروشت" یان "میتافیزیك" بدەیت چونكە بێگومان دیسان لەم باسەدا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە.

**نـوس بـاوم:** عەرزت كەم، رەگی زاراوەكە بە ڕادەیەك فراوانبووە كە مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان دەكا، یەكێك لەو كەسانەی كە لە ڕۆژگاری كۆندا بەرهەمەكانی ئەرستۆی ڕێكدەخست، ئەو كتێبەی كە ئەمڕۆ بە "دوای سروشت" یان "میتافیزیك" ناسراوە، خستە دوای كتێبی "سروشت" یان "فیزیك"ەوە و بەو شێوەیە ناوینا "میتافیزیك" كە بەیونانی ئەم زاراوەیە یەعنی "ئەوەی دوای فیزیك دێت.

**مـاگی:** كەواتە میتافیزیك یەعنی "كتێبەكەی دوای كتێبی فیزیك" بەلام بەهۆی ناوەڕۆكی كتێبەكەوە، زاراوەی "دوای سروشت" یان "میتافیزیك" لەو كاتەوە تا ئێستا لە فەلسەفەدا مانایەكی تایبەتی پەیدا كردووە، وانییە؟

**نـوس بـاوم:** باسكردنی تەنها هۆیەك بۆ ئەم بابەتە دژوارە. پێموایە، تاڕادەیەك بەم جۆرە بتوانرێ بگوترێ كە ئامانجی دوای سروشت تەنها ئەوە نییە كە كۆمەڵێ مەسەلە دیاری بكات و بە تەنیا باس لەو مەسەلانەدا بكات، بەڵكو ئامانجی بە دواداچوونی كۆمەڵێ مەسەلەی تەواو گشتی "یان سەراپاگیرە" كە سەبارەت بە هەموو شتێ ڕەنگە تەرح بكرێن. كۆمەڵێ مەسەلەی گشتێتی و بەردەوامی و فۆرمی لۆجیكی و لەم بابەتە.

**مـــاگی:** هـەروەها کۆمـەڵێ مەسـەلە دەربـارەی ڕاستیە بنەڕەتیەکانی ئەزموونەکانی ئێمە وەکو کات و شوێن و مادە و هۆ و هتد...

**نوس باوم:** بەڵێ.. کۆمەڵێ مەسەلە سەبارەت بە هەرشتێ لە هەر بارەیەکەوە واتە هەر شتێ کە هەیە. هەڵبەتە تەوەری مەسەلەکە، مەسەلەیەکە کە ئەرستۆ پێی دەڵێت مەسەلەی گەوهەر.

دەمـەوێ لێرەوە دەست پێبکەم و بپرسم ئەم مەسەلەیە یەعنی چی، چونکە پێموایە لە خۆوە و بە شێوەیەکی سروشتی تێگەیشتنێك لای ئێمە هەبێ کە پرسـیارکردن سـەبارەت بـە "گەوهـەر" بـە چ مانایەکـە. ئەگـەر نووسـینەکەی خـودی ئەرسـتۆ بخوێنینەوە و هەوڵبدەین لای خۆمانەوە سەرلەنوێ ئەوە تەرح بکەین کە ئەو پرسیارانەی ئەو هەیەتی چین، پێم وایە بگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە راستیدا لە باسی گەوهەردا دوو مەسەلە هەن کە ئەو نایەڵێ لە یەك جیا ببنەوە. یەکەمیان، مەسەلەی گۆڕان و ئـــاڵوگۆڕە" دووەمیـــان، مەســـەلەی شـــوناس (چـیەتی)یە. مەسـەلەی گـۆڕان ئەوەیـە کـە لـەو ئەزموونانەدا کە دەیکەین، هەمیشە رووبەرووی ئەو شتانە دەبینەوە کە لە گۆڕاندان. گەڵا دەکرێتەوە و سەوزە، پاشان زەرد و پەژموردە دەبێ. ساوا دێتە دنیاوە، پێدەگات و پیر دەبێت و دواجار دەمرێ. باشـە، ئێسـتا مەسـەلە ئەوەیـە کـە ئەگـەر بڕیـارە دەربارەی هەموو ئەم شتانەی کە لە گۆڕاندان قسە بکـەین، دواجـار "ئێسـتایەك" یـان بابـەتێك دەبـێ هەبێ کە دەبێ وەکو خۆی بمێنێتەوە لە کاتێکدا کە سیفەتەکانی دەگۆڕێ، دەنا لـە بنەڕەتدا قسـەکردن دەربـارەی گـۆڕان زۆر دژوار دەبـێ. مەسـەلەکە لـە رووکەشدا لەگەڵ ئەوەدا ناکۆکە کە گۆڕان پێویستی بە جێگیریی هەیە. بەم پێیە، ئەرستۆ دەپرسێ ئەو شــتە جـێگیر و پایــەدارەی کــە بنــەمای هــەموو قسەکانی ئێمەیە دەربارەی گۆڕان، چییە؟ واتە ئەو شتەی کە خۆی جێگیرە لە کاتێکدا کە خاسیەت و سیفەتەکانی دەگۆڕێن؟

پرسـیاری دووەمـی ئەرسـتۆ، بـە قسـەی خـۆی پرسیارە سەبارەت بە "چی بوون – *What it is to be*" یان "چییەتی"، یان بە قسەی من، مەسەلەی شوناس یـان "هـەمان ئـەوەی کـە هەیـە". پرسـیار ئەوەیـە: وایدابنێ من لە بازنەی ئەزموونەکانمدا ئاماژە بۆ کەسێ بۆ نموونـە ئاماژە بۆ برایـان مـاگی بکـەم و بپرسـم: "لـە راسـتیدا ئەمـە چییە؟" لـە ڕاسـتیدا پرسـیارەکەی مـن ئەوەیـە کـە لـە نێـو ئـەو هـەموو خاسیەت و سیفەتەی تۆدا کە من بە هەستەکانی خــۆم دەرکــی پێدەکــەم، کامیــان لــە هــەموویان بنـەڕەتیترن کـە ئەگـەر ئـەو خاسـیەتانە لـە دەسـت بـدەیت، چیدی خـۆت خـۆت نابیـت؟ ئاشـکرایە کـە رەنگـــە چـــاکەتەکەت بگـۆڕیـــت و جلوبـــەرگێ لەبەرکـەی کـە رەنگێکـی تربـێ و هـەر هـەمان برایـان ماگی بیت. بەڵام ئەوە ئاشکرا نییە کە ئەگەر مرۆڤ نەبیت یان لە گۆشت و ئێسقان دروست نـەبوو بیت، دیسان خۆت بیت و لە راستیدا نـەمریت. بـەم پێیـە، کاتـێ ئەرسـتۆ سـەبارەت بـە شـوناس یـان چییەتی پرسـیار دەکـات، دەیـەوێ ئـەوە بزانـێ لـە هـەر شتێکدا کـام بەشـانە یـان کـام ڕەگەزانـە ڕۆڵـی زۆر بنەڕەتیان هەیە، بە دەربڕینێکی دیکە "چی بوون"ی ئەو شتەن.

**مـاگی:** هـەمان ئـەو بەشانە یـان ئـەو ڕەگەزانـە دوو ڕۆڵـــی جیاوازیـــان هەیـــە، وانییـــە؟ بیەڵـــە بـــا ڕێکخســـتنی دوو پرســـیارەکەی تـــۆ پێچەوانە بکەمەوە.

پرسیاری یەکەم ئەوەیە کە کام تایبەتمەندیانە بۆ هەرشتێ لایـەنی بنـەڕەتی و چاو لێنەپۆشراو و پێویسـتیان هەیـە، بـەو مانایـەی کـە شـت دەکـەن

بەوەی کە هەیە؟ پرسیاری دووەم ئەوەیە کە ئەو تایبەتمەندییانە کامانەن لە شتێکدا هەن کە بە درێژایی گۆڕانکارییەکان بە جێگیریی دەمێننەوە، بەجۆرێ ئەو شتە لەگەڵ ئەوەدا کە دەگۆڕێ بە هەمان شت دەمێنێتەوە؟

**نوس باوم:** بەڵێ، ڕاستە. ئەرستۆ دەیەوێت ئەم دوو پرسیارە لە یەك جیا نەبنەوە و بەرای من، بەڵگەیەکی قایمی هەیە بۆ ئەم کارە. بەڕای ئەرستۆ، بۆ دیاریکردنی ئەو شتەی کە گۆڕانکاریی لەسەر بنەمای ئەو رووداوات و بەدرێژایی هەموو گۆڕانکارییەکان بە جێگیریی دەمێنێتەوە، دەبێ شتێك دیاری بکەیت کە شوناسێکی بێ چەند و چونی هەیە — واتە ئەو شتەی کە بە پرسیارکردن لە (چی‌بوون)ی دەتوانیت وەڵام بدەیتەوە و هێندە بناغەی پەیدا کردووە و سەقامگیرە کە دەتوانێت بابەتی مەسەلەیەك بێت دەربارەی گۆڕانکاریی. بەم پێیە، کاتێ دەمانەوێ سەبارەت بە پرسیارکردن لە (چی بوون) قسە بکەین، دەبێ وەڵامەکەمان شتێکی جێگیر بێ، نەك شتێ کە هێشتا قسەمان دەربارەی (چی بوون)ی تەواو نەبووە، لەناو بچێ و نەمێنێ. فەیلەسوفەکانی بەر لە ئەرستۆ هەمیشە ئەم دوو پرسیارەیان لەگەڵ یەکداو پێکەوە نەدەکرد و زۆر جار هەستیان تەنها لای یەکێ لەم دوو پرسیارە بوو، ئەنجامیش، وەڵامی سەیر و سەمەرەیان سەبارەت بە پرسیارەکەی دی دەدایەوە. بوار بدە با دوو نموونە بهێنمەوە. هەندێ لە زانا سەرقافڵەکانی سروشت لەبەرئەوەی پێیان وابوو کە مادە لە هەموو شتێ پایەدارترە، دەیانوت لە ڕاستیدا هەموو شتێ بریتییە لە مادە. چونکە دەیانبینی کە درەخت و منداڵ و گیانەوەر لە یەك بنەمای مادی لەدایك دەبن و کاتێکیش دەمرن دیسان بنەما مادییەکان دەمێنێتەوە، لەمەوە دەگەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە مادە سەرەتای بنەڕەتیی گۆڕانە و دیسان دەگەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە هەموو شتێ لە بنەڕەتدا مادەیە ئەمە وەڵامی پرسیاری یەکەم بوو. پاشان هەمان وەڵامیان وەردەگرت و بەبێ ئەوەی زیاتر بیری لێبکەنەوە، دەیانلکاند بە پرسیاری دووەمەوە. لەولاوە روونکردنەوەیەکی دیکە بوو کە لە هەندێ تیۆری ئەفلاتونیدا بەدی دەکرا. (ناڵێم تیۆرەکانی خودی ئەفلاتون" مەبەست لە تیۆرێکە کە ئەرستۆ لە قوتابخانەکەی ئەفلاتوندا رووبەڕووی ببۆوە). لەم تیۆرانە، پرسیار سەبارەت بە چیەتی یان شوناس لەئارادایە و هەوڵ دەدرێ شوناسی هەرشتێ بەپێی نزیکی لە شتی نامادی تایبەتەوە — واتە بەپێی هەمان وێنە یان نموونەی ئەفلاتونی — بەیان بکرێ. بۆ نموونە دەگوترێ برایان ماگی رەنگی قاوەییە لەبەر نزیکیت لە وێنە یان لە نموونەی قاوەییەوە" مرۆڤی لەبەر ئەو نزیکیەی کە لەگەڵ وێنە یان نموونەی مرۆڤدا هەتە، بەمشێوەیە هەتا کۆتایی. وێنە یان نموونەی ئەفلاتونی ئەو شتانەن کە گشتیی و ئەبستراکتن و بونیان بە جیا لە کەسان و ئەو بەشانەیە کە دەبێ بەهۆیانەوە بەیان بکرێن. بۆچوونی ئەرستۆ ئەوەیە کاتێ ئێمە دەمانەوێ وەڵامی کەسی دووەم بدەینەوە واتە ئەو کەسەی پەیڕەویکەری ئەفلاتونە کە یەکەمجار سەبارەت بە ئەو قسە دەکەین و پاشان سەبارەت بە پەیڕەوانی ڕێبازی مادی قسە دەکەین — دەبێ یەکەم دوو جۆر سیفەت لە یەك جیابکەینەوە: یەکێکیان ئەو سیفەتانەی کە تۆ هەتە و ئەوی تریان ئەو سیفەتانەی کە بنەمای "چی بوون"ی تۆیە. ئەو سیفەتەی کە بەرگی قاوەییت پۆشیوە، ڕێك ئەو سیفەتەیە کە هەتە. تۆ بەرگی قاوەییت لەبەرکردووە و ئەم ڕەنگە لەگەڵ تۆدایە، خودی خۆت نییە. بە دەربڕینێکی دیکە، یەکێکە لەو سیفەتانەی کە

دەتوانی بە ئاسانی لە دەستی بدەی بەبێ ئەوەی خۆت نەبیت. بەڵام سیفەتی مرۆڤ بوون بەو جۆرە نییە. شتێك نییە كە لە دەستی بدەیت و دیسان خۆت بیت. تۆ ناتوانی ببی بە مەیمون و دیسان خۆت بیت. بەم پێیە ئەرستۆ لە یەكێك لە بەرهەمەكانی سەرەتایدا بە ناوی گوتەزاكان یان كاتیگۆریەكان (*Categories*) دوو جۆر خاسیەت لەیەك جیا دەكاتەوە: یەكێكیان ئەوەیە كە (لەناو) بابەتەكەدایە و ئەوی تریان بە قسەی ئەو خود یان "چییەتی" بابەت نیشاندەدات.

**ماگی:** دەكرێ من لێرەدا شتێ زیاد بكەم؟ پێموایە بەهای هەبێ قسەكەمان ببڕین بۆ ئەوەی روون بێتەوە كە شێوەی ئەو مامەڵەیەی قسەی لێدەكەین بە ئاشكرا ئەگەری وەسفكردنی هەموو بوونەوەرێكی تێدایە. یەكەم شتێ هەڵدەبژێری — هەرچیەك بێ: سەگ یان مێز یان كەسێك یان هەر شتێكی دیكە" پاشان ئەو شتە دیاری دەكەیت و شتێكی لەبارەوە دەڵێی — واتە یان سیفەتێكی دەدەیتە پاڵ یان وەسفی دەكەی كە چیدەكات یان چیكردووە. زۆر كەس لەو زەمانەوە تا ئێستا باوەڕیان وابووە كە ئەم مامەڵەیە لە ڕێگەی بابەت و دانە پاڵ–ەوە، وەسف كردنی هەموو شتێك دەكات بە كاری كردە –واتە یەكەمجار شتێ دیاری دەكەیت و پاشان سیفەتێكی دەدەیتە پاڵ– ماوەیەكی زۆر وا دەهاتە بەرچاو كە ئەم شێوەیە لە پێكهاتەی زمان و لۆجیكی ئێمەدا خەملێوە. دەزانم كە ئەو خاڵەی دەربارەی قسەت دەكرد ئەوە نەبوو" تەنها ویستم ئەوە بەیادبهێنمەوە چونكە ئەم بابەتە هەمیشە لەو كاتەوە هەتا ئەمڕۆ لە فەلسەفەدا گرنگی هەیە.

**نوس باوم:** بەڵێ، بەڵام من پێموایە ئەرستۆ دەیەوێ لێرەدا جەخت بكاتەوە كە هەموو دانەپاڵەكان لە سنوورێكدا نین. تەنها هەندێ لە دانەپاڵەكان دەدەینە پاڵ بابەتێ كە پێشان هەڵمانبژاردووە و دیاریمان كردووە، هەروەكو من تۆم هەڵبژاردو سیفەتی "قاوەیی"م دایە پاڵت. بەڵام سیفەتی تریش هەن — وەكو "مرۆڤ" یان "سەگ" یان "درەخت" — كە بۆ دیاریكردنی بابەت لە هەنگاوی یەكەمدا بایەخێكی بنەڕەتیان هەیە. بە باوەڕی ئەرستۆ، ئێمە ناتوانین هەروا دەست بدەینە بابەتێ كە خاڵی بێ لە هەر وەسفێك و سیفەتی پێوە بلكێنین. خودی بابەتەكەش دەبێ دیاریكراوبێ و لە ژێر ناونیشانێكی دیاریكراودا هەڵبژێردرێ، كە بەناو نیشانی بدات ئەو شتە چییە. رۆڵی سەرەكی لێرەدا بە وشە سروشتییە. یەكەم دەبێ لە ژێر ناونیشانی مرۆڤدا تۆ هەڵبژێرم و پاشان بڵێم ئەو شتانە چین كە دەربارەی تۆ ڕاستن. بۆ نموونە جلی قاوەییت لەبەركردووە، لەسەر قەنەفە دانیشتوویت و لەم بابەتە. نابێ لە خۆمانەوە سیفەتی قاوەیی یان دانیشتوو بە تەنیا و بەبێ گرێدانەوەی بە شتێكەوە لە بەشێكی دیاریكراوی وەكو مرۆڤ، لەبەرچاو بگرین.

باشە، بەڵام ئێمە هێشتا وەڵامی ئەو كەسانەمان نەداوەتەوە كە مادە بە بنەڕەتی دەزانن و هێشتا نەمانوتووە كە كام ڕاڤەی بنچینەیی وێناكردنی مرۆڤ، بەڕاستی "چیەتی" بابەتمان بۆ ئاشكرا دەكات. هێشتا ئەو ئەگەرەمان ڕەتنەكردۆتەوە كە ڕاڤەی ڕاستی "چیەتی" مرۆڤ دەبێ لەگەڵ ئەو میتۆدەدا هاوڕێكبێ كە ماتریالیستەكان بەدڵیانە كە دەڵێن مرۆڤ بوون بە مەعنای دروستبوونە لە فلان مادە. بە كورتی، هەتا ئێستا هیچمان دەربارەی مادە و نزیكی لەگەڵ باقی لایەنەكانی مرۆڤایەتی، وەكو بەرهەم و چالاكی، نەوتووە. ئەستۆ ئێستا بایەخ بەم مەسەلەیە دەدات.

**ماگی:** هەڵبەتە پرسیار لە (چیەتی) سەبارەت بە هەموو شتێ ڕاستە، وا نییە؟ ئەرستۆ دەیەوێ بەم پرسیارە سروشتی شوناسی شتەکان و خودی خۆمان، ئاشکرا بکات.

**نوس باوم:** بەڵێ، ڕاستە. بەڕای من، ڕۆڵی زۆر بنەڕەتی لێرەدا ڕۆڵی بوونەوەرە زیندووەکان و تاڕادەیەك هی شتە دروستکراوەکانە کە بنەڕەتیترین و دیاریکراوترین و یەکگرتووترین و پایەدارترین بابەتن وێڕای ئەوەی لە هەر شتێکی دیکە زیاتر قابیلی دیاریکردنن و شوناسیان دیاریکراوترە. ئەرستۆ دەیەوێ ئەو پرسیارە بخاتە ڕوو: زۆر باشە، تێگەیشتین کە ئەو چەمکانەی کە ئێمە ناومان ناون چەمکی سروشتی، وەکو چەمکی مرۆڤ یان سەگ یان درەخت، بۆ دیاریکردنی بابەتەکان لە دنیادا ڕۆڵی بنەڕەتیان هەیە. ئێستا دەبێ بە وردی بپرسین ئەمانە چین. مرۆڤبوون چییە؟ ئایا ئەوەیە کە مرۆڤ فلان جۆر مادەیە؟ یان فلان شێوەی هەیە؟ لە دوای سروشتدا، ئەرستۆ بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە کە گەوهەر لە بنچینەدا بنەما یان ڕەگەزی مادی نییە، جۆرێك نەزم یان شێوە یان، خۆی وتەنی، جۆرێ وێنەیە، و مەبەستی لە وێنە تەنها شێوە یان ئەندام نییە“ بەڵکو، بۆ نموونە سەبارەت بە برایان ماگی، مەبەست لەوەیە کە ئەو بۆ ئەوەی کار بکات، بە چ شێوەیەك دروست بووە یان پێکهاتووە. وێنەی تۆ، کۆمەڵێ پێکهاتەی تواناکانی تۆیە هەتا ئەو کاتەی لە ژیاندایت.

ئەرستۆ سێ بەڵگە دەهێنێتەوە کە بۆچی پێی وایە ئەو مادانەی کە بە تۆوەیە، ناکرێ "چیەتی" تۆ بێت.

یەکەم بەڵگە ئەوەیە کە سەبارەت بە تۆ و هەموو بوونێکی زیندووی دیکە، مادە هەمیشە لە حاڵەتی هاتن و ڕۆیشتن و گۆڕاندایە. ئەو بەشە مادیانەی تۆیان پێکهێناوە بە زۆری دەگۆڕێن بەبێ ئەوەی تۆ چیتر خۆت نەبیت. دووەم ئەوەیە، بەو گریمانەی واشنەبێ – بۆ نموونە سەبارەت بە شتێکی دروستکراو یان دەستکرد – وێناکردنی ئێمە ئەوەیە کە تا ئەو کاتەی دروستکردنی شتەکە بۆ ئەوەی فلان کاری هەبێ، هەر ئەو شتە بێ کە پێشان بووە، دەتوانین چەند پارچەیەك لە بەدەنی مادی ئەو شتە بگۆڕین بەبێ ئەوەی ببێ بە شتێکی دیکە لەبەردەستماندا. دەتوانین بۆ نموونە تەختەکانی کەشتیەك بگۆڕین. هەتا ئەو کاتەی کەشتیەکە هەمان پێکهاتەی خۆی بهێڵێتەوە بۆ درێژەدان بە کاری پێشووی و بۆ هەمان کار بەکاربێ، بە هەمان شێوە ئەوەی لەبەردەستماندایە هێشتا هەمان شتە. دواجار سێیەم بەڵگە ئەوەیە مادەی ئەو شتە دیاری کردنی پێویستی نییە کە بەڕاستی ببێتە شتێکی دیاریکراو. مادە، گەرد یان کۆمەڵێ پێکهاتەیە بەمپێیە، ناتوانین بڵێین تۆ فلان پێکهاتەی. هەتا ئەو کاتەی دروستکراوێکمان دیاری نەکردبێ کە پێکهاتە بە دەست دێنێ، ناتوانین دەربارەی پێکهاتە شتێك بڵێین کە لەگەڵ عەقڵ بێتەوە.

**ماگی:** بەڵگەکانی ئەرستۆ لێرەدا ئەوەندە گرنگی بنچینەیی و پایەداریان هەیە کە من حەزدەکەم جارێکی تر بە گوتەکانیدا بچمەوە. یەکەم بەڵگەی پەیوەندی بە تاکەوە هەیە وەکو تاك و وەکو مرۆڤ سوکرات دەکات بە نموونە و دەڵێت ناکرێ سوکرات هەمان مادە بێ کە بەدەنی لێ دروست بووە چونکە ئەو مادەیە هەمیشە لە گۆڕاندایە و لە ڕاستیدا بەدرێژایی ژیانی، سوکرات، چەند جارێ بە تەواویی دەگۆڕێ، لە کاتێکدا سوکرات لە تەواوی تەمەنیدا هەمان ئەو سوکراتە بووە، کە هەیە. بەم پێیە، ناشێ سوکرات هەمان ئەو مادەیە بێ کە لێی

دروست بووە. بەڵگەی دووەمی ئەرستۆ ئەوەیە کە وەکو تاکەکانی جۆرێك لە تاکەکەس دەڕوانێ. ناشێ سەگێك لەبەر ئەو مادەیەی کە لێی پێکهاتووە، سەگ بێ لەبەرئەوەی سەگە جیاوازەکان لە مادەی جیاواز پێکهاتوون. سەگە جیاوازەکان، کێش و شێوە و قەبارە و ڕەنگی جیاوازیان هەیە و گەرچی هەریەکە لەم تایبەتمەندییانە بنەمای مادییان هەیە، بەڵام هەموو سەگەکان، سەگن. بەم پێیە، ناشێ سەگ بە هۆی ئەو مادەیەوە کە لێی دروست بووە، سەگ بێ. بەڵگەی سێیەمی ئەرستۆ ئەوەیە کە تۆپەڵێ مادە، بەبێ هەندێ چۆنێتی شێوەی وەکو پێکهاتە یان دروستبوون، بە هیچ جۆرێ نە مرۆڤە نە سەگ و نە هیچ شتێکی دیاریکراوی ترە، تەنها تۆپەڵێکە. هەر شتێ بە هۆی پێکهاتەی جیاوازی خۆیەوە، ئەو شتەیە. ئەرستۆ ناوی ئەو پێکهاتەیە دەنێ جۆر.

**نوس باوم:** دووەم خاڵ کە تۆ باستکرد، بەڵگەیەکی تریش دەخاتە سەر ئەوەی کە وتمان و من باسم نەکرد بەڵام بێگومان دەکرێ بۆ پەسەند کردنی بیر و بۆچوونی ئەرستۆ سوودی لێوەربگیرێ، هەروەکو چۆن چەند بەڵگەیەکیش لەبەردەستدایە کە خودی ئەرستۆش هەمان بەڵگەی هێناوەتەوە. بەڵێ، ڕاستە، تاکە جیاوازەکانی جۆرێك هەموویان لە ڕووی مادییەوە بە جۆرێکی دیکە دروست بوون. خودی ئەرستۆ لە جێگایەکدا دەڵێت دەتوانرێ گۆ لە فلز یان لە تەختە یان لە زۆر مادەی تر دروست بکرێ. شتە دروستکراوەکان زیاتر بە هەمان شێوەن: هەتا کاتێ مادەیەك کە بەکاردێ لە ڕووی ئەو کارەوە کە فلان بەرهەم دەبێ بیکات گونجاوبێ، جۆرەکەی گرنگ نییە. دیسان بە قسەی خودی ئەرستۆ، تەختە بوون کار لە "چییەتی" سیستەم ناکات. ئەم حوکمە سەبارەت بە بوونەوەرە زیندووەکانیش بە ڕووکەش ڕاستە، دواجار بە مانای زۆر سنوردارتر. پێکهاتەی مادیی بوونەوەرە زیندووەکان، لە تاکە جیاوازەکاندا، جیاوازە. قەت لە دوو سەگی جیاوازدا، بڕی مادە جیاوازەکان هەمان شت نییە. بەم پێیە، هیچ فەهرەستێکی مادە ڕێك پێمان ناڵێت سەگ بوون چییە. سەبارەت بە کارە تایبەتیەکانی بوونەوەرە زیندووەکانیش دەتوانین هەمان حوکم بدەین. (چییەتی) تووڕە بوون یان بیرکردنەوە دەربارەی میتافیزیکی ئەرستۆ یان ئارەزووی سوورکردنەوەی گۆشتی گا، هەرکاتێ کە لە بوونەوەرێکی زیندوودا بەدی بێت، بنەمای مادی هەیە" بەڵام فۆرمۆڵی وردی مادی هەموو جارێ گۆڕانی بەسەردا دێت بەشێوەیەك کە هیچ فەهرەستێکی دیاریکراو لە مادە پێمان ناڵێت کە لە هەموو جارەکاندا بە وردیی تووڕەبوون چییە، بیرکردنەوە دەربارەی میتافیزیکی ئەرستۆ چییە، ئارەزووی سوورکردنەوەی گۆشتی گا چییە. هەموو ئەمانە بە ڕووکەش ئەوە نیشانی ئەرستۆ دەدەن کە فلز بوون یان تەختە بوون یان هەر شتێکی دیکە بوون ناشێ بەشی خودی (چییەتی) فلان شت بێت. ئەوەی کە هەموو شتێ چییە، جۆر یان پێکهاتەی ئەو شتەیە. مادە تەنها شتەکان پێکدەهێنێ یان دروستیان دەکات.

بەڵام ئێستا دەمەوێ خاڵێکی تر بخەمە سەر دووەم بەڵگەی خۆم نەك دووەم بەڵگەی ئەرستۆ – ئەویش ئەوەیە کە هەتا کاتێ مادەی شتێکی دیاریکراو بە درێژایی تەمەنی گۆڕانی بەسەردا نەیەت – یان هەتا کاتێ هەموو تاکەکانی جۆرێکی دیاریکراو لە راستیدا لە جۆرێکی دیاریکراوی مادەیەك پێکهاتبن – دیسان ئێمە بە پێی ئەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ "چییەتی" شتێکی دیاریکراودا دەیکەین (بۆ نموونە کەشتیەك)، ئەو

شته و مادەکەی بەیەك شت دانانێین. ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت کە پارچە مادیەکانی فلأن شت بەرەبەرە گەرد گەرد بگۆڕین بەلأم لە هەمان کاتدا توانای ئەو شتە بۆ ئەو کارەی کە دەبێ بیکات، هەروا لە شوێنی خۆی بهێلینەوە. پێموایە ئەوەت قبولّ بێ کە دیسان بە هەمان شت دەمێنێتەوە.

**ماگی:** ئایا ئەوەی تۆ دەیلێیت بەشێوەیەکی ترسناك ئەرستۆ لە تیۆری جۆر یان نموونەی ئەفلاتون نزیك ناکاتەوە، لە کاتێکدا کە ئەرستۆ ئەو تیۆرەی ڕەتکردۆتەوە؟ بۆ ئەفلاتون نالێت کە سەگ بە هۆی سوود وەرگرتنەوە لە "جۆری سەگی" دەبێ بە سەگ؟ بۆ ئەفلاتون نالێت کە ئەو "جۆری سەگیە" هەمان شتە کە لە نێو هەموو سەگەکاندا هاوبەشە — واتە ئەو خودەی کە هەموو سەگەکان بە هۆیەوە بوون بە سەگ؟

**نوس باوم:** بڕوانە، ئەو مەسەلەیەی کە "جۆر" ڕێك چییە، مەسەلەیەکی زۆر قورسە و پێموانییە هیچ دوو فەیلەسوفێك لە دەربڕینیاندا سەبارەت بە تیۆرەکەی ئەرستۆ، ڕێك یەکدەنگ بن. ئەو تێکستەی کە ئەرستۆ نووسیوویەتی گێرمەو کێشەی زۆر دەهێنێتە ئاراوە. من تەنها دەتوانم بلێم بیروڕای خۆم چییە. بەڕای من تەواو ڕوون و ئاشکرایە کە ئەرستۆ، بە پێچەوانەی ئەفلاتونەوە باوەڕی وایە کە جۆر لە هەر شتێکدا وەکو بەشێك شیدەبێتەوەو لەناوەوەی ئەو شتەدایە، نەك ئەوەی بۆ نموونە جودا لەهەر سەگێکی تایبەتی لە قەلەمڕەوێك و لە ئاسمانی (سەگێتی) بوونی هەبێ. هەمان جۆر لە هەمان شوێندایەو لەڕاستیدا هەمان خودی سەگەکەیە" لە سەگەکە جودا نییە. پێموایە ئەگەر خالێك لەم بابەتەدا مشتومڕ هەلنەگرێ، ئەوەیە.

**ماگی:** باشە، کەواتە جۆری سەگ لە ڕەهەندێکی ئاسمانیدا نییە کە جێگەی باقی جۆرەکانی تریش بێت.

**نوس باوم:** ڕاستە. لەهەمان شوێندایە" لەڕاستیدا هەمان خودی سەگەکەیە. بەلأم خالی دووەم کە زیاتر جێگەی مشتو مڕە ئەوەیە کە، بەباوەڕی من، جۆرە ئەرستۆییەکان تاکن، بەرجەستەن" بەواتایەکی دی بەشن نەك هەموو— واتە لەگەل ئەوەشدا پێناسەی جۆری سەگێ بۆ هەر سەگێکی تایبەتی لەگەلّ هەر سەگێکی دیکەدا یەك شتە، بە شێوەیەك کە بۆ نموونە ئەگەر پێنج سەگ لەبەرچاو بگرین پێناسەی "چییەتی"هەر پێنج سەگەکە یەك شت دەبێ، بەلأم ئەگەر بپرسین چەند "بەلگەمان" سەبارەت بەجۆری سەگ هەیە، وەلأمەکەی ئەوەیە پێنج دانە، واتە بەپێی ژمارەی سەگەکان. بەقسەی ئەرستۆ، ئەگەرچی هەریەکەیان لەچۆنێتی زاتیدا یان لە ڕووی جۆرەوە وەك ئەوانی ترە، "لەڕووی ژمارەوە" تایبەتە. ژمارەی جۆرەکان یەکسانە بە ژمارەی گەوهەرەکان.

**ماگی:** بەڕای من، هەتا دوای زیاتر لە دوو هەزار سال، بەلگە بەهێزەکانی ئەرستۆ لە ڕەتکردنەوەی ڕێبازی مادیدا زۆر کاریگەرن. ئایا، بەڕای تۆ، مادییەکان توانیوویانە وەلأمی کاریگەری ئەم بەلگانە بدەنەوە؟

**نوس باوم:** نەخێر، پێموانییە. بەڕای من ئەوەی، هێزێکی ئەوتۆ بەو بەلگانە دەبەخشێ ئەوەیە کە ئەرستۆ بۆ ڕەتکردنەوەی ڕێبازی مادی، لەلایەکەوە، بنەمای بەلگەکە دەخاتە ناو فەلسەفەی دەروونەوەو هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی کاروباری دەروونی لەبەرچاو دەگرێ کە ئەم کاروبارانە لەهەر شتێکی دیکە جیا دەکەنەوەو، لەلایەکی ترەوە، لەبواری میتافیزیك یان کاروباری گشتیدا چەند

تیۆرێـك وەك ئـەوەی دیمـان دەربـارەی چـییەتیو گەوهـەر دەخاتـە ڕوو کـە ئـەوە دەسـەلمێنێ چـۆن گەڕاندنـەوەی هـەموو شـتێ بـۆ مـادە سـەبارەت بـە شتەکان بەشێوەیەکی گشتیی و هـەتا سەبارەت بە شتە دروستکراوەکانیش، میتۆدێکی ڕاست نییە.

**نـــوس بـــاوم:** پـێم وایـە خـراپ نییـە ئەگـەر بگەڕێینـەوە بۆ یـەکێك لـەو زەمینانـەی کـە نزیکـە لـە میتـافیزیکی ئەرسـتۆوە چـونکە، هـەروەکو دیمـان، تەوەری بیری ئەرستۆ لە میتافیزیکدا چەند شتێکی وەکـــو مـــرۆڤ و ســـەگ و بـــاقی بوونـــەوەرە سروشـــتیەکانە، واتـــە زۆر نزیکـــە لـــە زانســـتی سروشـتی-یـەوە . لـە زانسـتی سروشـتیدا، بـیری ئەرســتۆ ئاراســتەی زۆر شــتی جیــاواز کــراوە. کتێبێکـی هەیـە دەربـارەی سروشـت بـەناوی فیزیـك یـان (گوێڕایـەڵی سروشـت) کۆمـەڵێ شـیکردنەوەی بـەهێزی لـەخۆگرتووە سـەبارەت بـە کـاتو شـوێن و ماهیــەتی جوڵــە، باســەکە بەشــێوەیەکی گشــتیی دەربــارەی مەســەلەی هۆکــار یــان ڕوونکردنــەوەو ڕاڤەکردنە لە سروشـتدا- واتـە سـەبارەت بەوەیـە کە زانـای سروشـتی دەتوانـێ کـام بەشـە لـە هۆکـار دەستنیشــان بکــاتو ســوودو بایــەخی نیســبی هەریەکـە لـەم بەشـە جیاوازانـەی هۆکـار چییە. لـە میتافیزیکدا ئەرستۆ دەڵێت لەڕاستیدا فەلسـەفە بـە هەســتێکی سەرســوڕهێنەر لــە بەرامبــەر جیهــانی سروشــتدا دەســتپێدەکات. کاتــێ تەماشــای دنیــا دەکەین، تووشی سەرسوڕمانو سەراسیمەیی دەبین لەبەر ئەوەی ئەو مەسەلە سەرسوڕهێنەرانە دەبینین بەڵام سەر لـەوە دەرناکـەین بۆچـی هـەموو شـتێ بـەو شــێوەیە بــەڕێوە دەچــێت. دەڵــێ ئــەم مەســەلەیە تاڕادەیـەك لـە تەماشـاکردنی شـانۆی بووکەڵـە یـان نوانـدنی بووکەڵـە دەچـێت کـە دەبینیـت شـتەکان بەڕووکەش لە خۆیانەوە دەجولێنو لـە هـەمان کاتـدا دەزانیت کە دەبێ میکانیزمێ هـەبێ کە ببێتـە هـۆی ئەو جوڵانە، بەکورتی هێشتا نازانیت ئەو میکانیزمە چییە. دەتەوێ لێکۆڵینەوە بکـەیتو پـەی پێبـەریت. ئەو مەسەلەیەی کە دێتە ئاراوە ئەوەیە کاتێ تۆ ئەو (بۆچـی)یە تـەرح دەکـەیت، بـە شـوێن چ هۆکارێکـدا دەگەڕێی. پرسیاری تۆ ئەوەیە کە بۆچی مەسەلەکان بەو شێوەیە بەڕێوە دەچن. ئەرستۆ دەڵێت زاناکانی ڕابـردوو بـە شـێوەیەکی سـادە بیریـان کردۆتـەوە چـونکە لـەوە تێنەگەیشـتوون کـە پرسـیاری بۆچـی دەکـرێ بەچـەند شـێوەی جیـاواز ئاراسـتە بکـرێ و وەڵامــی بدرێتــەوە. لــە فیزیــك و میتافیزیکــدا بەدڵنیاییـەوە دەڵێت وانییـە کـە تـەنها هەنـدێ ڕاڤـە کـردن یـان هۆکـار سـودمەند بـێ چـونکە ڕەنگـە فەهرەســتی ڕاڤەکردنــەکان بێســنوور بــێ. بـەڕای ئەرستۆ، بەلای کەمـەوە چوار جۆر هۆکار گرنگن و ئەمـەش هـەمان ئـەو (چوار هۆکـار)ە دیارەی ئـەون . بــەڕای مــن ئــەوەی گرنگــە ئەوەیــە کــە ئاگامــان لـەوەبێ کـە ئـەو چـوار هۆکـارە لەڕاسـتیدا چـوار جۆر ڕاڤەکردنن.

**ماگی:** یەعنی چوار جۆر"لەبەر ئەوەی".

**نوس بـاوم:** بـەڵێ، زۆر باشت وت: چوار جۆر "لەبـەر ئـەوەی"، چـوار جـۆر وەڵام بـۆ پرسـیاری (بۆچی)- واتە، هۆکاری مادی، هۆکاری ڕووکـەش، هۆکاری بکەری، هۆکاری مەبەست. وایدابنێ بپرسم بۆچـی درەخـت بـەو شـێوەیە دەڕوێ؟ ڕاڤـەی مـادی (هۆکاری مـادی) پێمـان دەڵێت لەبەرئـەوەی درەخت لە فلان مادەو لەهەمان مادە دروست بووە. هەڵبەتـە ئـەم شـێوە ڕاڤەکردنـە زۆر بەسـوودەو زۆر مایـەی سـەرنجە، بـەلام دەکرێ والێکبدرێتـەوە کـە ئەرسـتۆ دەڵێــت ئەمــە بەتــەنیا بــەس نییــە چــونکە هــیچ فەهرەستێ لە مادەکانی خۆبەخۆ بە ئێمە ناڵێت ئەو شتەی دەمانـەوێ گەشـەکردنی ڕاڤـە بکـەین، چییەو

ئەو مادانە چ بەرهەمێ دەهێننە ئاراوە. بەهەمان شێوە دەتوانیت وای لێکبدەیتەوە, ئەرستۆ باوەڕی وایە بۆ ئەم مەبەستە, ڕاڤەیەکی تریشمان پێویستە, کە ڕاڤەکردنی روکەش بێت (یان هۆکاری ڕووکەش). ڕاڤەکردنی ڕووکەش پێمان دەڵێت درەخت بەو شێوەیە دەڕوێ لەبەر ئەوەی فلاّن شێوە پێکهاتەی بەدەست هێناوە کە ڕووکەش بێت. کەواتە لێرەدا پەیوەندییەك دەبینین لەگەڵ بەڵگەکانی پێشوودا لە میتافیزیکدا . پاشان جۆری سێیەمی ڕاڤە دێت بەناوی هۆکاری بکەری یان ڕاڤەی بکەری کە دەڵێت درەخت بەو شێوەیە دەڕوێت لەبەرئەوەی ئەو شتە جیاوازانەی پەیوەستن بە دەوروبەرییەوە– وەکو ئەو مادانەی دەچنە ناویەوە یان خاك یان شتی تر– لەدەرەوە بەشێوەیەکی دیاریکراو فشاری دەخەنە سەر. دواجار دوا شێوەی ڕاڤە کردن بەقسەی ئەرستۆ هۆکاری مەبەست, بەڕای من, لە هەموویان زیاتر ڕووبەڕووی خراپ حاڵیبوون‌و بەد گوزارشت لێکردن بۆتەوەو لەسەر بنەمای مەبەست ناسی *teleological exlanation* بەم ڕاڤەیە دەڵێین ڕاڤەی مەبەست لەبەرئەوەی گوزارشت لەو *telos* (مەبەست یان نیان)ە دەکات کە ئەو شتەی بەردەستمان بەرەو ئەو مەبەستە ملدەنێ . ئەم ڕاڤەیە پێمان دەڵێ درەخت بەو شێوەیە دەڕوێ لەبەرئەوەی کاتێ گەشەکردنی تەواو بوو, ببێ بە فلاّن جۆر درەخت. بە دەربڕینێکی دیکە, هەموو شتێ لە سروشتدا هەمیشە بەرەو باری کرانەوەی قۆناغی پێگەیشتن ملدەنێ.

**ماگی:** بە ڕووکەش وا دێتە بەرچاو کە لەم ڕاڤە کردنە یان هۆکار دەستنیشان کردنەی دواییدا, ڕەگەزێکی ڕەمزیی یان ڕەنگە جادو ئامێز هەبێ کە لە بەشەکانی دیکەدا بەدی نەدەکرا.

**نوس باوم:** بەڕووکەش وا دێتە بەرچاو, بەلاّم, بەڕای من, ئەمە تەنها لە بەهەڵە تێگەیشتنەوە سەرچاوە دەگرێ. یەکەم ئەرستۆ ناڵێت لە سروشتدا شتێکی جادو ئامێز هەیە کە دەست درێژ دەکات‌و درەخت بەرەو شێوەی داهاتووی بە کێش دەکات, بە کوردی, لە ئاسۆی ئایندەدا جۆرێ بە کێش کردنی سەبەبی بەکاردەهێنێ. بەهیچ جۆرێ وانییە. هەموو شتێ تەواو سروشتییەو لەناو خودی درەختەکەدا ڕوودەدات. مەبەست لە ڕەفتاری کارقبوڵکەرو پێچاوپێچی چارەسازی خودی بوونەوەرەکانە. دەربڕینێکە یەکسەرو گشتی سەبارەت بەوەی چەند شتێکی وەکو درەخت لە هەل‌و مەرجی جۆراوجۆری سروشتیدا هەمیشە بەشێوەیەك جوڵە دەکەن کە یارمەتی بەردەوامی ژیان‌و گەشەکردن‌و کامڵ بوونیان بدات بەرەو کامڵبوون و پێگەیشتنیان. دەربڕینێکە سەبارەت بەوەی درەخت لە ناوچەو ئاووهەوای جیاوازدا هەمیشە ڕوو لە هەتاو دەڕوێ و ڕەگەکانی هەمیشە مەیلیان بەرەو ئاوو سەرچاوەکانی ئاودا هەیە لەهەر بەشێکدا بێت. ئەمە ڕاڤەکردنێکی تەواو گشتییە بۆ ئەوەی ئەو کارە جۆراوجۆرانەی لە درەخت دەوەشێتەوە لە ئێمە بگەیەنێ و بێگومان سادەترو گشتیتری زنجیرەیەك وەسفە کە لە هەموو بارەیەکەوە "دوای ڕوودان"بیەوێ شتێ ڕاڤە بکات. ئەگەر بەڕاستی لەم ڕاڤەکردنەیان لەم هۆکار دەست نیشانکردنە حاڵی بین, دەتوانین پێشبینی ئەوە بکەین کە لە سەرچاوەکانی ئایندەشدا کە هێشتا نەماندیووە, دیسان درەخت بەرەو ڕووناکی و خۆر دەجوڵێ, بە چاوپۆشی لەوەی ڕووناکیو خۆراك لەکوێ بن. ئەگەر ئامانج و مەبەستێکمان باس نەکردایە, ئەو توانای پێش بینیەمان نەدەبوو. کەواتە دەبینیت کە مەسەلەکە نە کاری سەروو

سروشتیو لەڕادە بەدەر لە ئارادایەو نە مەسەلەی هێزی ڕەمزیی ڕۆحی یان بوونی ئارەزوو لەخودی درەختەکەدا. درەخت بەو مەفهومە هیچ ئامانج و مەبەستێکی نییە. مەسەلەکە تەنها دەربڕینی ئێمە لە چارەساز بوونی جوڵەی سروشتیدایە.

**ماگی:** بەڵام زۆر لە زانایان ئەو وێناکردنەیان داوەتە پاڵ ئەرستۆ کە نەفس لە هەموو شتێکدا وجودی هەیە. ئایا پێت وایە بەڕاستو دروستی لە مەبەستی ئەرستۆ تێگەیشتبن؟

**نــوس بــاوم:** نەخێر. پێم وایە بە خراپی گوزارشتیان لە شێوازی ئەرستۆ کردووە لە ڕاڤەکردن یان دەست نیشانکردنی هۆکاردا لەسەر بنەمای مەبەست. ئەرستۆ چەندان جار بەڕاشکاوی نکۆڵی لەوە کردووە کە نەفس لەهەموو شتێکدایەو، بەڕای من، ڕاڤەکردن لەسەر بنەمای ئامانجو مەبەست تەنها سەبارەت بە بوونەوەرە زیندووەکان بەکار دەهێنرێ. پێموانییە ئەم جۆرەی هۆکار دەست نیشانکردن بەهیچ جۆرێ سەبارەت بە چەند شتێکی وەکو مانگ گیرانو خۆر گیران و هەورە بروسکەو هەورە گرمەو لەم بابەتە پەیڕەو بکات. هەتا ئەوەش رادەگەیەنێ کە مانگ گیران یان خۆر گیران (لەبەر) شتێ رووناداتو قابیلی ڕاڤەکردنی مەبەستی نییە. سەبارەت بە بوونەوەرە زیندووەکانیش مەسەلەی نەفس بەو مانای ئێمە دەمانەوێو پێویستی هێزی مێشکیو ڕۆحییە، لە ئارادا نییە" مەسەلەی خەسڵەتی گشتیی هەر شتێکە کە ژیانی تێدایە. بۆ ئەوەی بتوانین سەبارەت بەم مەسەلەیە زیاتر قسەبکەین، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ نووسینەکەی ئەرستۆ دەربارەی ژیان. ئەرستۆ کتێبێکی نووسیوە بەناوی "دەربارەی پسوخێ" کە لەڕاستیدا واتە دەربارەی ژیان یان بنەمای ژیانو ئاسایی لە زمانی ئینگلیزیدا بە (on the soul–دەربارەی نەفس) تەرجوومە دەکرێ. بەداخەوە زاراوەی (نەفس) بەڕادەیەك ملکەچی چەمکە گیانی و دەروونیەکانە کە ئەگەر لێرەدا بەکاربێ بە تەواوی گومڕاکەرە. باسەکەی ئەرستۆ دەبێت وەکو باسێك سەبارەت بە ژیان و بوونەوەرە زیندووەکان لێکبدرێتەوە. ئەو شتە خاوەنی (پسوخێ)یە کە زیندووبێت، بەڕای ئەرستۆ، سەراپای گیاو گیانلەبەران، لەوانیش ئەو گیانلەبەرانەی ناویان مرۆڤە، لەو بابەتەن. ئەو پرسیارەی کە ئەرستۆ دەیەوێت لەم نووسینەدا بیکات و وەڵامی بداتەوە ئەوەیە کە بنەمای گیان بەخش لە بوونەوەرە زیندووە جیاوازەکاندا، لەوانیش گیاو گیانلەبەرو ئینسانەکان، چییە؟ ئایا دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی ئەوە بەیان بکەین کە زیندوێتی چییە؟ ئەو وەڵامەی کە ئەرستۆ دەیداتەوە ئەوەیە کە ئەو بنەما گیان بەخشە بەشێوەیەکی گشتی فۆرمی هەموو بوونەوەرێکی زیندووە کە بە تۆکمەیی بەشێوەیەك ڕێکخراوە کە بتوانێ کاربکاتو لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی ژیاندا سەرکەوتووبێت. هەڵبەتە مەبەستی ئەرستۆ لە فۆرم، تەنها شێوە یان ڕوخساری دەرەوە نییە، بەڵکو، هەروەکو پێشانیش دیمان، بەشێکە لە بنەما یان پێکهاتەیەکی گونجاو بەکارکردنێکی دیاری کراوەوە. ئەرستۆ هەتا زاراوەیەکی تایبەتی بۆ دەربڕینی ئەم مانایە دادەنێ کە زاراوەی (*entelecheia*)[2] مەبەست لەم زاراوەیە بە ڕووکەش بەشێکی ڕێکخراو یان پێکهاتەیە کە هەموو بوونەوەرێکی زیندوو لەڕێگەیەوە دەتوانێ بەچەند شێوەیەکی ئاسایی لە جۆری چالاکیە ژیانیە تایبەتیەکانی خۆیدا کاربکات– واتە شێوەکارێ پەیدا بکات کە (*telos*)یان مەبەستی بوونی ئەوە. بۆ نموونە زیندوێتی بۆ تۆ (برایان ماگی)، بەو

مانایەیە کە بەشێوەیەك پێکهاتبێ کە بتوانی خواردن بخۆی بۆ ئەوەی توانای تێگەیشتن و بیرکردنەوەو جێبەجێکردنی هەموو ئەرکێکت هەبێ کە لە جۆری ژیانی تۆدا ئاساییە. مەبەستی ئەرستۆ لە رێکخراو یان پێکهاتەیەکە مادە یان بەدەن بەدەستی دەهێنێ و وەکو پێویست دەبێ هەنگاو بە هەنگاو لە کۆمەڵێ مادەدا بەدی بێت. لەگەڵ ئەوەشدا, ژیانی تۆ بریتییە لە هەمان پێکهاتە, نەك ئەو مادەیەی لێی پێکهاتووە. بەم پێیە, هەر کاتێ پێکهاتەی گونجاو لەگەڵ ئەنجامدانی ئەرکەکانتدا لە دەست بدەی, ئیدی زیندوو نیت.

**ماگی:** ئەرستۆ ئەم پرانسیپەی سەبارەت بە شتە نازیندووەکانیش بەکارهێناوە, وانییە؟ لەبیرمە لە جێگایەکدا لەیەکێ لە نووسینەکانیدا دەڵێت ئەگەر تەور گیانی تێدا بوایە گیانەکەی برینەوە دەبوو. مەبەستی لەوەیە کە هەتا ماهیەتی شتێکی وەکو تەوریش, کارێکە کە ئەم شتە ئەنجامی دەدات یان ئەو کارایییە کە هەیەتی, وانییە؟

**نووس باوم:** بەڵێ, هەڵبەتە ئەرستۆ ئەم نموونەیە بە حسابکردن بۆ پێچەوانەی رووداوانی دەهێنێتەوە. دەڵێت ئەگەر تەور گیانی تێدا بوایە, ئاوا دەبوو. ئەم نموونەیە بۆ باسکردنی شایەتی بۆ ئەوەی من وتم, دەهێنێتەوە– بەو مانایەی کە مەبەست لە روخسار یان فۆرم یان پێکهاتە, تەنها شێوەی تەور نییە یان ئەوەی لە فلان فلز دروست کراوە" مەبەست توانای کارایییە. ئەرستۆ بەم پێیە دەیەوێ روانینێکی قووڵتر سەبارەت بەلایەنی نهێنی ئامێزتری بوونەوەرە زیندووەکان بدات بە ئێمەو بەم وێناکردنە تێمانبگەیەنێ کە ئەوەی بوونەوەری زیندوو خاوەنی پرانسیپێکی گیانبەخش بێت بەو مەعنایە نییە کە بۆ نموونە جەنابت (برایان ماگی), رێك شێوەیەکی تایبەتیت هەبێ چونکە ئاشکرایە کە رەنگە تۆ بەزیندوویی بمێنیتەوە بەڵام روخسارو هەیکەلت بگۆڕێ....

**ماگی:** ....وەك ئەوەی بەداخەوە زۆر جاریش وایەو دەگۆڕێ....

**نوس باوم:** .... یا بەو مانایەی کە رێك هەمان گەردیلەکانی مادە بپارێزی چونکە دیسان ئاشکرایە کە هیچ کەسێ توانای کارێکی وای نییە. گرنگ ئەوەیە کە خاوەنی توانای عەمەلی بیت بەشێوەی جۆراوجۆر و ئەو توانایە بپارێزی و لەبەرئەوە ئەو توانایەت هەبێ کە بەو شێوە تایبەتیە دروست بوویت. تۆ کاتێ دەمریت کە پێکهاتەو سازبوونی پێویست بۆ بەردەوامبوونی کارایی لەدەست بدەیت.

**ماگی:** باشە, تا ئێرە لە زۆر بواردا قسەمان کرد بەڵام, لەگەڵ ئەوەشدا, تەنها چاومان بە بەشێك لە بەرهەمەکانی ئەرستۆدا خشاند. بەداخەوە لەو کاتە کەمەدا کە بەدەستمانەوەیە, لەمە زیاتر هیچ ناکرێ. تەنیا ئومێدەوارم تا ئێرە بە گشتی ئەوەمان نیشانی خەڵك دابێ کە دەتوانن چاوەڕوانی چ قسەو باسێ بکەن سەبارەت بەم فەیلەسوفە سەرسوڕهێنەرە. بەر لە کۆتایی قسەو باسەکە, پێموایە خراپ نییە کەمێك کات خەرج بکەین و کەمێك لەوە دوور بکەوینەوە کە تائێستا دەمانوت و ببینین چ ئەنجامێ لە قسەو باسەکەمان بۆ فەلسەفەی نوێ بەدەست دێت. بە باوەڕی تۆ, کام مەسەلە فەلسەفیانە کە جێگای بایەخی هاوچەرخەکانی ئێمەیە, راستەوخۆ کاریگەریی ئەرستۆیان لەسەرە؟

**نووس باوم:** پێموایە یەکێکیان هەمان ئەو مەسەلەیە بێ کە ئێستا قسەمان لەبارەیەوە دەکرد, واتە فەلسەفەی ژیان. لە فەلسەفەی هاوچەرخدا ئەم بوارەمان ناوناوە فەلسەفەی زیهن بەڵام جۆرێك

هێزی زیهنی دەرککردنی هەستیو بیرکردنەوەمان لە باقی ئەرکەکانی ژیان جیاکردەوە کە ئەرستۆ ئەگەر ئەمڕۆ لە ژیاندا بوایە، وای نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا گومان لەوەدا نییە کە ئەرستۆ لەو کارانەدا کە بەگشتی سەبارەت بە مەسەلەی ژیان ئەنجامی داوە، بەهەندێ ئەنجام گەیشتووە کە لە ڕوانگەی فەلسەفەی هاوچەرخی زیهنەوە زۆر گرنگن. لەوانەش هەوڵیداوە ئەوە نیشان بدات کە بۆچی بادانەوە یان گەڕانەوەی هەموو شتێ بۆ مادە- یەعنی باوەڕ بەوەی بۆ نموونە دەرککردنی حسی شتێك نییە جگە لە ڕەوتێکی مادیی- ناتوانێ بۆ ڕاڤەکردنی تایبەتمەندییە ئاڵۆزەکانی ئەرکەکانی ژیان مەبەست بەدی بێنێ. بەڵگەکانی ئەرستۆ لەم بەشەدا کە پێشان باسم کرد، هێشتا متمانەیان پێدەکرێ و وەڵام بەدەستەوە دەدەن. لە کاتێکدا، بیروبۆچوونەکانی ئەرستۆ لەم بارەیەوە ئەوەمان نیشان دەدات کە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەوەی کە هەموو شتێ دەگەڕێتەوە بۆ مادە، پێویست ناکات بە هەندێ شتی نهێنی ئامێزی نامادی قایل بین. دەبێ بڵێین ناکرێ دەرککردنی حسی ڕێك بگەڕێتەوە بۆ ڕەوتێکی مادیی یەکەم لەبەرئەوەی لە مادەیەکدا هەمیشە جیاواز بەدی دێتو دووەم لەبەرئەوەی کە چەمکی سەرنجدان *intentionality* و ڕاکێشانی ئیرادی هەست بۆ دەرەوە، لەڕووی دەست نیشانکردنی ڕاستو تایبەتمەندییەکانی ئاگاییەوە گرنگی بنەڕەتی هەیە چونکە دەرککردنی حسیش جۆرێکە لە ئاگاییو سەرنجدان. لەلایەکی ترەوە، دەرککردنی حسی نە شتێکی نهێنی ئامێزەو نە جیایە لەمادە. جۆرێ کاراییەکە، بەقسەی ئەرستۆ، بنەماکەی هەمیشە مادەیەو لەبەشە جیاوازەکانی مادەدا بەدی دێت.

**ماگی:** لێرەدا گەیشتووینەتە وێناکردنێ کە بایەخی بنەڕەتی هەیە بەڵام وا نایەتە بەرچاو هێشتا بە تەواوی دەرکی پێکرابێ- مەبەست لە وێناکردنی بەشە جیاوازەکانە، نەك بە ئیجباری وێناکردنێك دەربارەی دەرککردنی حسی. ئەوەی کە ڕووبەڕووی دەبینەوە ئەوە نییە کە ببینین ئایا مادە بە بنەڕەتی دابنێین یان باوەڕمان بە ڕووبەرێکی ڕۆحانی و ئەبستراکت هەبێ. ڕێگای سێیەمیش هەیە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو ئەزموونانەی بە دەستی دەهێنین کە، بەقسەی تۆ، ڕێگایەکە کە ئەرستۆ تیایدا پێشڕەو بووە.

**نوس باوم:** بەڵێ.

**ماگی:** بەرلەوەی بە تەواویی باسەکە تەواوبکەین، دەبێ دەربارەی ئاکاریش لە ڕوانگەی ئەرستۆوە شتێك بڵێین. پێم وانییە زیادەڕەوی بێت ئەگەر بڵێین کە هەتا ئەمڕۆ هیچ فەیلەسوفێکی ئاکار گەرا هەرگیز توانا و کاریگەریی ئەوی نەبووە. دەکرێ ئاماژەیەك بۆ ئەوە بکەیت کە توانای مەزن و بێسنوورو حسابی ئەرستۆ لەم بوارەدا لە چییەوە سەرچاوە دەگرێ؟

**نوس باوم:** بەڵێ، هەڵبەتە. زۆر بەداخەوەم کە کاتمان بۆ قسەوباس لەم بوارەدا کە جێگای بایەخی منە، ئەوەندە کەمە. بە هەرحاڵ، پێموایە توانای ئەرستۆ لە قۆناغی یەکەمدا لەو پرسیارەوە سەرچاوە دەگرێ، کە لێیەوە باسەکە دەست پێدەکات. زۆر لە فەیلەسوفانی ئاکار وەکو یەکەم جیاوازی دیار بەوە قایل دەبن لە نێوان بواری ئاکارو باقی ژیانی مرۆڤو زانستی ئاکاردا بەم پرسیارە دەست پێبکەن کە "چ شتێ بۆ من ئەرکە؟" یان "ئەرکی ئاکاریی من چییە؟" ئەرستۆ لە پرسیارێکی گشتی ترەوە دەست پێدەکات و دەپرسێ: بەلای مرۆڤی باشەوە ژیان یەعنی چی؟

ئەم پرسیارە ئەو توانایە بە ئەرستۆ دەدات کە لێکۆڵینەوە لەچەند بوارێکدا بکات کە ئێمە ئاسایی لە پاڵ باقی کاروبارەکانی ژیانی مرۆڤ و بە بۆنەی ئەو کاروبارانەوە پەیوەندییەك لەنێوان ئەوان و بواری ئاکاردا دەبینین, لە بابەتی پەیمانی فیکری, سۆزو خۆشەویستی بۆ کەسانی دی, خۆشەویستیو شتی دی. پاشان ئەرستۆ چەند پرسیارێکی جوان دەربارەی پەیوەندییە هاوبەشەکانی ئەم بوارانە لەگەڵ یەکدیدا دەخاتە ڕوو هەتا ببینێ بەم فاکتەرانە چۆن دەکرێ ژیانێکی باش بنیات بنرێ.

**ماگی:** بەم پێیە, دەبێ بگوترێ ئەرستۆ هەستێکی قووڵی هەیە سەبارەت بەوەی کە ئاکار بریتییە لەچی. خاڵی جیاوازی ئەویش لەگەڵ باقی فەیلەسوفانی ئاکاردا لەمەدایە. بۆ نموونە ئەو فەیلەسوفانەی کە سوودمەندییان بە بنەڕەت دادەنا. باوەڕیان وابوو کە بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو ڕەفتارەکان لە ڕوانگەی ئاکارەوە لەیەك پرانسیپ زیاتر وجودی نییەو ئەویش خۆشیو ناخۆشییەو دەتوانیت پەسەندیی یان ناپەسەندیی هەموو کارێکی ئەخلاقی بەم سیفەتە پێوانە بکەی. بەڵام ئەرستۆ بە باشی ئاگای لەوە بوو کە ئەمە کاری کردە نییە, وانییە؟

**نوس باوم:** بەڵێ, ئەو تەشبیهەی کە ئێستا تۆ بە بەکارهێنانی وشەی "سیفەت" بەکارت هێنا. بەلای ئەرستۆوە زۆر گرنگە. مەسەلەکە تەنها ئەوە نییە کە ئەرستۆ نایەوێ شتە جیاوازە بەبەهاکان بەیەك سیفەت بپێوێ. وێڕای ئەمە, دەیەوێ بڵێت کە لە هیچ بوارێکدا ناتوانیت کاروبارە ئاڵۆزەکان بەیەك دار لێبخوڕێ. وەکو لێکچواندن دەڵێت بەهەمان شێوە کە ئەندازیاری پایەیەکی رازاوەی قاش قاش بەراستەی ساف پایەکە ناپێوێ, کەسێکیش کە لە پلەی داوەری ئاکاردابێ ناتوانێ کۆمەڵێ پرانسیپی سادەو وشك لەبارێکی ئاکاریی پڕ پێچو پەنادا بەکار بێنێ. بەپێچەوانەوە, بەهەمان شێوە کە ئەندازیارەکە لە پێواندا تەلێکی نەرم بەکاردێنێ کە قابیلی چەمینەوە بێت کە, بەقسەی ئەرستۆ, ڕەق نییەو دەچەمێتەوەو بەپێی قەبارەی پایەکە دەچەمێتەوە, منو تۆش کاتێ دەکەوینە بارێکی ئاکاریی ئاڵۆزەوە, دەبێ خۆمان لە دەق بەستن بەدووربگرین و ئامادەی نیشاندانی کاردانەوەی گونجاو بین و خۆمان لەگەڵ ئەو پێداویستیانەدا بگونجێنین کە هەندێ جار تایبەتن بەو بارە تایبەتەو دووبارە نابنەوە. ئەرستۆ دەڵێت دەست نیشان کردنی پەیوەستە بە (دەرککردنی) ئەو بارەو مەبەستیشی لە "دەرککردن" جۆرێکە لە هاوسەنگی لەگەڵ بارەکەدا لەڕووی تیۆریو سۆزدارییەوە بۆ نیشاندانی کاردانەوە. بەڕای ئەرستۆ, ئەم "دەرککردن"ە لەهەموو پرانسیپەکاندا لەهەر جۆرێ بن, لە پێشەوەیە.

**ماگی:** شتێکی دیکە کە لە فەلسەفەی ئاکار–ی ئەرستۆدا بە توندی من دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە ئاگاداریی تەواوی ئەوە لەو ڕاستیەی کە هەڵبژاردنی چوارچێوەی ئاکار–ی ئێمە بەدەست خۆمان نییە, بەم پێیە, نەدەتوانین, بە پێچەوانەی بۆچوونی ڕەواقیەکانەوە, چەند بوونەوەرێکی لە خۆڕازیی بین نەك بەو شێوەیەی کە دەشێ ئەبیقۆریەکان چاوەڕێ بووبن, کۆمەڵێ بوونەوەری ئاکاریی تەواو بێلایەن بین. ئەرستۆ سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ژیانی ئێمە لە چوارچێوەیەکی ئاکاردا دەگوزەرێ کە لە هەموو لایەکەوە دەوری داوین.

**نوس باوم:** بەڵێ, پێموانییە هیچ فەیلەسوفێ کە لەم بوارەدا بەرهەمی نووسیوە, بەو باشیە لەو راستیە تێگەیشتبێ کە ژیانی باش بۆ مرۆڤ ئەگەر بڕیاربێ هێندە دەوڵەمەندو پڕ مایە بێ کە هەموو شتە پڕ بەهاکانی وەکو میهر و خۆشەویستی تایبەتی لەخۆ بگرێ, ناچار لە بەرامبەر زۆر فاکتەردا کە جڵەویان بەدەست ئێمەوە نییە, زیانی لێدەکەوێ و هەر هەوڵێك بۆ لابردنی ئەمجۆرە زەمینە زیان قبوڵکەرانە، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی مایەی ژیان.

**ماگی:** ئایا پێت وایە لە بیری ئەرستۆدا شتێك پەیدابێ لە چەمکی "پێکدادانی ئاکار" بچێت کە فەیلەسوفەکان لەم سالآنەی دواییدا لە بارەیەوە چەند شتێکیان نووسیووە؟

**نوس باوم:** بەڵێ، پێموایە پەیدا ببێ. ڕاست ئەوەیە کە ئەرستۆ دەپرسێ ئەو لایەنانەی ئەم ژیانە باشە کە بە دەست خۆمان نین کامانەن و چۆن دەکرێ نەك تەنها توانای ئێمە بۆ کرداری هاوشانی فەزیلەت، بەڵکو هەروەها سروشتی باش لە ئێمەدا لە قاڵبی ئەم جۆرە فاکتەرە جڵە و نەکراوانەدا فۆرمەڵە بێ یان بگۆڕێ. هەڵبەتە باوەڕی خودی خۆم ئەوەیە کە ئەرستۆ هێندە ئاگای لە وەسفی ژیانێکی باشی هاوشانی هاوئاهەنگی و هاوسەنگییە کە بە تەواوەتی لەم ئاقارەدا بەرەو پێشەوە ناچێت. ئەو وێنەیەی کە لە زەینی ئەرستۆدایە هەمیشە وێنەی ژیانێکە کە هەموو بەشە سازکەرە فراوانەکان لەخۆ دەگرێ کە زۆر لە بەها جیاوازەکان لە خۆ بگرێ، دواجار هەر شتێ لەم ژیانەدا دەبێ بەشێوەیەك داڕێژرابێ کە لەگەڵ شتەکانی دیکەدا هاوئاهەنگ و هاوسەنگ بێ. من پێموایە ئەمە دەبێتە ڕێگر لەبەردەمی ئەرستۆدا کە بەشێوەیەکی ڕاست بە دوای ئەم بابەتەدا بچێ کە هەندێ لە بەشە سازکەرەکانی ژیان ئەگەر تا ڕادەی شیاو تاقیب بکرێن، ڕەنگە لە بەرامبەر هەموو بەشەکانی دیکەدا خۆیان ئاشکرا بکەن و بیانخەنە بەردەم دوو دڵیەوە. بۆ نموونە عەشقی قووڵ هەندێ جار دەتوانێ لەگەڵ فەزیلەتدا لە دەرگای جیاوازیی بێتە دەرێ و بیخاتە مەترسیەوە. ئەرستۆ لەم بارەیەوە تەواو بێدەنگە، لە کاتێکدا کە ئەمە هەمان مەسەلەی "پێکدادانی ئەخلاقیە" کە، بەڕای من، زۆر بایەخی هەیە و ئەو هیچ لە بارەیەوە ناڵێ. ڕاستی ئەوەیە کە ئەرستۆ لە بنەڕەتدا دەربارەی عەشقی هەوەسبازی شتێ ناڵێ و هۆکەشی پێموایە، زۆر حسابکردنی ئەوە بۆ ڕەسمکردنی وێنەی ژیانێکی هاوئاهەنگ و هاوسەنگ.

**ماگی:** تا ئێرە لە باسەکەدا سەرنجمان لە قۆناغی یەکەمدا ڕوو لە بەیانکردنی هەندێ لە ئەندێشە بنەڕەتیەکانی ئەرستۆ بوو، هێشتا بۆ هەڵسەنگاندنی ئەندێشەکانی ئەرستۆ نەوەستاوین. بەڵام تۆ هەر ئێستا ڕاست پەنجەت خستە لایەنێك لە ئەندێشەکانی ئەرستۆ کە بەڕای تۆ لە کەموکورتیەکانی کاری ئەوە. دەکرێ تکا بکەم باسی یەك دوو لایەنی سەرەکیتریش لەو لایەنانە بکەی کە ڕووبەڕووی ڕەخنە بوونەتەوە؟

**نوس باوم:** پێموایە یەکێك لە سەرەکیترین بوارەکان، زانستی سیاسەت–ی ئەرستۆیە کە هەڵبەتە، بەڕای من، زۆر شتی باشی تێدایە و یەکێك لەوانەش شیکردنەوەیەکە کە ئەرستۆ لەو بارەیەوە دەیکات کە حکومەت یان سیاسەت کاتێ کردەوەی ڕاستی هەیە کە هەلومەرجی پێویست بۆ ژیانێکی ئینسانی باش و پڕمایە بخاتە بەردەستی هەموو هاووڵاتیەکەوە. لە دەربڕینی ئەم باسەدا، ئەرستۆ ژیانی باش لە قاڵبی کردەوە جیاوازەکاندا باس

دەکات کە بەشە پێکهێنەرەکانی ئەم جۆرە ژیانەن. من پێموایە هەتا ئەمڕۆش کە هەندێك باوەڕیان وایە حکومەت جگە لەوەی زۆرترین ڕادەی سوود بگەیەنێ ئیشێکی دیکەی نییە، تیۆرەکانی ئەرستۆ وەکو بەشێکی دیکە لە بەرامبەر ئەم جۆرە بیروبۆچوونانەدا شایانی سەرنجن. بەڵام کاتێ کێشە دێتە ئاراوە کە ئەرستۆ ئەوە باسدەکات چ کەسانێ دەبێ وەکو هاووڵاتی قبوڵ بکرێن و لێرەدا ئەوپەڕی کورت بینی سەبارەت بە بیانیەکان و ژنان نیشان دەدات و هیچ خەوشێك لەوەدا نابینێ کە جگە لە ژمارەیەکی کەمی سیفەتی پیاوی دڵ ئاسوودە، باقی خەڵکەکە لە هاووڵاتێتی بێبەش دەکات. هەتا جوتیاران و پیشەوەران و مەلەوانانیش دەخاتە لاوە. هەڵبەتە ئەرستۆ بۆ ئەم کارە بەڵگەیەکی بەدەستەوەیە چونکە پێی وایە تۆ بۆئەوەی بە باشی بژیت، دەبێ بتوانی دەربارەی بنەمای ئەم جۆرە ژیانە بیر بکەیتەوە و ئەگەر گیرۆدەی هەندێ ئیشی نزم بیت، دەرفەتی بیرکردنەوە و تێڕامانت نابێت. بەڵام من وەکو خۆم پێموایە کە کاتێ ئەرستۆ دەڵێت جوتیار یان پیشەوەری لادێ خەریکی ئیشێکی نزمە کە مەحاڵە وایلێبکات بۆ سوود وەرگرتن لە عەقڵی پراکتیکی و ژیانی باش ئامادەی بکات، بەڕاستی ئەرستۆ زیادەڕەویی دەکات.

**ماگی:** بەڵام ئایا ئەوە پەسەند ناکەی کە ڕەخنەگرتن لە ئەرستۆ بەو پێیە، لە بەرچاونەگرتنی هەلومەرجی سەردەمەکەیەتی، لەبەرئەوە بێویژدانانەیە؟ دەکرێ لە ڕوانگەی ئێمەوە لە سەدەی بیستەمدا وا بێتە بەرچاو کە ئەرستۆ بە تەواوی بەهای بۆ ژنان و توێژەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا و بیانیەکان دانەناوە" بەڵام ئایا لەو سەردەمەدا هەر کەسێ کەمتازۆر لە جێگەی ئەو بوایە بەهەمان شێوە بیری نەدەکردەوە؟

**نوس باوم:** نەخێر، پێموانییە. ڕاستی ئەوەیە کە ئەرستۆ دەربارەی مەسەلەی کۆیلایەتی دژی ئەو کەسانە بوو کە لایەنگریی گۆڕانکاریی بنەڕەتیان دەکرد و باوەڕیان وابوو کۆیلایەتی دژی دادپەروەرییە. ئەرستۆ بیروڕای ئەو کەسانەی دەزانی و لە دژیان بەڵگەی دەهێنایەوە. سەبارەت بە جوتیاران و مەلەوانان، قسەی ئەرستۆ کە دەیوت ئەم گروپە نابێ هاووڵاتی بن تەنانەت دژی ئەو شێوازە دیموکراسیە بوو کە لە ئەسینا هەبوو. سەبارەت بە ژنان، چەند تیۆرێ دەربارەی بایۆلۆژی ژن ڕەتدەکاتەوە کە لە تیۆرەکەی دەربارەی پشکی ژن زاوزێ ڕاستترن و زانیاری ڕاستتریان لە خۆگرتووە. بیروبۆچوونی خۆی ئەوەیە کە ژن تەنها مادەی بێ شێوە دەدات و هیچ کام لە سیفەت و تایبەتمەندییەکانی منداڵ کە روخسار بە (مادە) دەدات لە دایکەوە نییە. هەڵبەتە دەربارەی ڕۆڵی سیاسی و مەدەنی ژن، ئەفلاتون ئەوەی سەلماندبوو کە لە باسکردنی ئەم بابەتەدا ئازادە لە کۆت و نەریت و بڕیارە گشتیەکان و خۆی سەربەخۆ دەتوانێ دەربارەی پەروەردە و فێرکردنی ژنان سەرلەنوێ بیر بکاتەوە و گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە وا باشترە هەرکەسێ لە وڵاتدا بەپێی تواناکانی پەروەردە بکرێ، بەم پێیە، دەبێ ئەو بوارەش بە ژن بدرێ کە بە تایبەتی هەڵبەسەنگێنرێ و بەپێی هەمان بنەما سوود لە پەروەردە و فێرکردن وەربگرێ.

**ماگی:** بەڵام خودی خۆت، وێڕای هەموو ئەو ڕەخنانەی کە لە بیروباوەڕی ئەرستۆی دەگری، زۆر لە ساڵانی تەمەنی خۆتت بۆ خوێندنەوەی ئەرستۆ تەرخان کردووە و کتێبێکی پڕ بایەخیشت

دەربارەی بەرهەمەکانی بڵاوکردۆتەوە و تیۆرەکانی بە خوێندکاران دەڵێیتەوە و گومانی تێدا نییە کە هەست دەکەی کارێکی زۆر زۆر شایستە ئەنجام دەدەی. بۆچی؟ بۆ نموونە ئومێدەواریت خوێندکارەکانت کە تەقریبەن هیچ کامیان نایانەوێ لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەوە یان لە ڕێگەی فەلسەفەوە نان پەیدا بکەن، چ سوودێك لە خوێندنەوەی کارەکانی ئەرستۆ وەربگرن؟

**نەوس باوم:** پێموایە بنەڕەتیترین سوودێ کە دەتوانن وەریبگرن ئاشنابوونە بە مامەڵەی گشتی ئەرستۆ لەگەڵ فەلسەفەدا هەروەها ئاشنابوون بەوەی فەلسەفە چییە و بۆچوونی ئەرستۆ سەبارەت بەوەی فەیلەسوف کەسێکە لە بەرامبەر ئەو هەمەجۆریی و دەوڵەمەندییەدا کە لە ژیانی مرۆڤ هەیە، سەرنج و تەنانەت خاکیبوون نیشان بدات و لە هەمان کاتدا، خۆی بە ملتەزیم بزانێ بۆ بەڵگەهێنانەوە و ملکەچی ئەوە بێ کە ئەو هەمەجۆری و دەوڵەمەندییەی ژیان بەشێوەیەکی روون دەربڕێ کە قابیلی تێگەیشتن بێ. ئەرستۆ لە هەر بوارێکدا لە نێوان مەسەلەکاندا هاوسەنگیی دروستدەکات: بۆ نموونە لە نێوان سادەبینی لە تیۆریزەیشندا لەلایەکەوە کە فەلسەفە لە ئاڵۆزیی و دەوڵەمەندیی و تەنانەت لە بێسەر و بەریی و گوتاری ئاسایی و تێکەڵی و پێکەڵی ژیانی رۆژانە دوور دەخاتەوە، لەلایەکی ترەوە ئەو بەشەی فەلسەفاندنی نێگەتیڤ و دژی بەرزەفڕیی کە دەڵێت باسی تیۆریی خانوویەکە کە بناغەکەی لەسەر ئاوە و سەبەب خوازیی و بەڵگەهێنانەوە کارێکی بێ ئەنجامە. من باوەڕم وایە کە ئەرستۆ ڕاست خاڵی هاوسەنگی بەدەست هێناوە و ڕەنگە باشترین وێناکردنێ کە دەشێ بە خوێندکار بدرێ ئەوەبێ کە سەبارەت بە ئامانجی فەلسەفە بە دەستی هێناوە.

## پەراوێزەکان

1- Psuche On. زاراوەی "پسوخێ" لە یۆنانی کۆندا بە مانای "نەفەس" یا "فوو" بەکارهاتووە دوایی پەرەیسەندووە و بە مانای "گیان" و "ژیان" بەکارهاتووە. زاراوەی وەکو سایکۆلۆژی "دەروونزانی" لە زمانی ئەمڕۆی ئەوروپادا لە هەمان زاراوەوە پەرەی سەندووە. بەم پێیە ئەوەی زانایانی "مشاء"ی وەکو ئیبن سینا لە ئەرستۆیان وەرگرتووە و ناویان ناوە دەروونزانی، ڕەنگە بە فارسی پێی بوترێ "جان شناسی" واتە "گیان ناسی" وەرگێڕانێکی نوێی ئەم نامەیەی ئەرستۆ بەم ناونیشانەی خوارەوە بە فارسی بڵاوبۆتەوە: ارسطو، دربارهء نفس، ترجمه و تحشیه علی مراد داودی، انتشارات دانشگا تهران، 1349 "چاپ دوم انتشارات حکمت، تهران 1366"

2-ئەم زاراوەیە یونانییە. زاراوە ئینگلیزییەکەی کە لە بنەڕەتدا تۆمار کراوە "*entelechy*"ە. پێشینانی ئێمە بە "کەماڵی یەکەم" گوزارشتیان لێکردووە. ئەو مانایەی کە ئەرستۆ خۆی لێیدەویست، (پراکتیکی) و (بەدیهێنانی تەواوەتیە). و. فارسی.

## سەرچاوە

فلاسفهء بزرگ، اشنایی با فلسفهء غرب
نوشته بریان مگی، ترجمه عزت الله فولادوند، چاپ دوم 1377 ص 55-87.

# ژۆ بۆدریا:
# دەربارەی کێشە هاوچەرخەکانی کۆمەڵگای فەڕەنسی

**لە هەفتەنامەی دی تسایتی ئەڵمانی**

**لە ئەڵمانییەوە: کاوە جلال**

**دی تسایت:** جەنابی بودریا، ماوەی چەند ساڵێکە دەتانەوێ بمانخەنە بڕوایەکەوە کە گوایە ئێمە لە جیهانێکی دەسکرددا دەژین. ئێمە "لە هەقیقەتدا" چیدی نەماوین. ریالیتێ و مێژوو و کۆمەڵایەتی هەموویان بەسەرچوون. بەڵام ئێستا فەڕەنسا خۆی لەبەردەم هەڵبژاردنی نوێی پێشکاتخراودا دەبینێتەوە. ئایا هیچ گرنگییەك بە ڕووداوێکی بەم چەشنە دەدەن؟ یان ئەمەش بۆ جەنابتان تەنها دزێواندن (زیمولاسیۆن)ی سیاسەتە؟

**بودریا:** من سەرجەمی ئەم کێشانە وەك کەمێك وەڕس و مایەی هیلاکی دەبینم، چونکە هیچ نوێیەك لە ئارادا نییە. ئەم هەڵبژاردنانە سەرلەنوێ بریتین لە ستراتیژیی لە خشتەبری و هۆکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ لو پێن و فرۆن ناسیۆنال. جارێکی دی دەخوازرێ یەکێتی پیرۆز بهێنرێتەوە ئارا. ئەم شتانە سیاسی نین، بەڵکو ئەوپەڕی لە واتایەکی ناسیاسیدا گرنگییان هەیە و گرنگیەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە خودی ئەم شتانە ئاماژە دەکەن بۆ بزربوونی سیاسەتیەتی. من هەڵبژاردنەکانی فەڕەنسا لە ڕۆشنایی گاڵتەجاڕی و وازیەوە دەبینم، یان وەك ئەو فاڕسەیە (کۆمیدیایەکی مەهزەلەیی –و) کە مارکس لێی دوواوە. کێشەکە تەنها ڕوودەکاتە مێژوویەك کە بووە بە فاڕسە. ئێمە چیدی خۆمان لەبەردەم ڕووداوی ڕەسەندا نابینینەوە، بەڵکو تەنها لەبەردەم چەندپاتی و نواندنی بێپێز و ستێریۆتایپدا، لێرەشدا هێندە نەبێ کە هەر جارە کردارنوێنەکان جیاوازن. ئەمە بریتییە لە یاریی خێو، لە فانتۆمەڕووداو.

**دی تســـایت:** بـەڵام خـۆ لـو پـێن فێنـۆمێنێکی نوێیە؟

**بودریــا:** بـەڵێ ئەمـە ڕاسـتە. لـو پـێن نوێنـەری فاشیزمی ترادیسیۆنی نیە، بەڵکو نوێنـەری شتێکی دیکەیە، حاڵەتێکی زۆر تایبەتی لە فەڕەنسا هاتۆتە ئـاراوە. گـەر مـرۆ لـە بێدەسـەڵاتی و ناداهێنـەریی چـینی سیاسـی بڕوانـێ، ئەمـەش بێگومـان چـە لەبەرەی چەپ و چە لـە بەرەی ڕاست، ئـەوا ناچار دەبێ ببێژێ لو پێن بووە بە تاکە شیکارێکی دژی ئـەم کۆمەڵگەیـە، ئەمـەش تـەنها بـەهۆی ئێرەبوونی خۆیـەوە دەکـات. بـە داخـەوە چـەپەکان خـاوەنی شـیکارێکی دژ نـین، لـو پـێن بـەتاقی تـەنها بـە دیســـکورزێکی (ئاخـــاوتنێکی —و) سیاســـی هەڵدەستێ. ئەو تاکە یەکێکە کە بە ڕاشکاویی خۆی ڕادەگەیەنێ، کەچی سەرجەمی ئەوانی دیکە تەنها خەریکی خیانەتن (دێنونسیاسیۆن —و). سـەرجەمی چـەپ لەســـەر ئـــەم مەودایـــەی دێنونسیاســـیۆن دەبزوێ: لو پێن بە ووشە ڕوونەکانی ئەمە یان ئەوە دەبێژێ. ئەو تایبەتمەندێتییەکی لە نێو نیشتیمانی خراپـەدا پێدراوە، ئێسـتاش هـەر ئەوەنـدەی خـۆی دەردەبڕێ، ئـەوا خـاوەنی سـەرجەم دەسـەڵاتی ئـەم خراپەیەیـە. لـو پـێن خـاوەنی مۆنۆپۆلـە بـۆ بێـژینی خراپە، ئەمەش بریتیە لە دەسەڵاتێکی سیمبۆلی زۆر بەهێز. بەڵام چەپ بە پێچەوانەوە دەربڕینـی شـتی تایبەتیی لە خۆی یاساغکردووە. ئەمەش هەل بۆ لو پێن دەڕەخسێنێ کە لـە دەربڕینـدا زبر و ئارۆگـانس و بێئــــەدەب بـــێ. هـــەموو ئـــەم شـــێوازانەی دەربـــڕین لــــەلای باقیەکـــەی دیکـــەی چـــینی سیاســـی بـــەدی نـــاکرێن. ئەمـــەش فینـــۆمێنێکی زۆر ڕونیبەخشە.

هـیچ شـتێك نیـە کـە مـرۆ بـەرەنگاری لـو پێنـی بکاتەوە. ئەمەش بریتیە — گەر بۆم هەبێ مەسـەلەکە بـەم چەشـنە فۆرمولـە بکـەم — لـەم فیکـرە نەرمـە دیمۆکراسیە کـە ڕێ بـۆ لـو پـێن خـۆش دەکـات وەك جادووگــــــەرێکی خێوبانگکــــــەر یــــــان وەك خۆڕاگەیاندنێکی پارانۆیید بێتە پێشەوە. هـەروەها لـە لایـەکی دیکـەوە لـە لـو پێنـدا نەتوانسـتییەك، هەندێك جار بە تـەواوی گەمژەیەتییـەك، بەرجەسـتە دەبـێ. ئەمـە حاڵـەتێکی زۆر سەرنجڕاکێشـە. هـەتا چەند پتر هێرش بکرێتە سەر لو پێن، ئەو هێندەش پتر بەهێزتری دەکرێ. ئەمە بریتیـە لـە سیرکولوس ڤیسیۆزوسـی ڕاسـتەقینەی سیاسـەتی فەڕەنسـیی ئەمڕۆ. هەڵبژاردنەکان هێنراونەتە پێشەوە بۆ ئەوەی ئەم ئەڵقەیە بشاردرێتەوە.

**دی تسایت:** ئێمە هۆشمان بەوە ووڕدەمێنێ کە جەنابتان هێشتا هەر دەربارەی "چەپ" و "ڕاست" دەدوێـن. گـەر یـەکێك کتێبـە نوێکـەتان بـە نـاوی "جەریمـەی ئیروو" بخوێنێتـەوە، ئەوا تێڕوانینێکی لـەلا دێتـە ئـاراوە کـە مـرۆڤ هیچـی دیکـەی لـێ نەماوەتەوە جگە لـەوەی بووبێ بە ئۆپەراتۆری ئەو پرۆسـانەی کـە بـەبێ بەشـداریی ئـەویش هـەر ڕوودەدەن. باقیەکەی دی تەنها یاریە.

**بۆدریا:** لێرەدا دەبێ دوو شت جیا بکرێنەوە. دانیشتوان چیدی بڕوایان بە جیاوازیی نێوان چەپ و ڕاست نەماوە. شێوەیەکی بێموبالاتی لە ئارادایە و مرۆ بە هۆیەوە کەمێك شەرمی بەخۆی دێ. بەڵام مرۆ سەرەڕای ئەمە دەچێ لە هەڵبژاردندا بەشداری دەکات. مرۆ باوەڕی بە سیاسەت نەماوە، بەڵام لای خـۆی وێنـاوی (فیکسـیۆن —و) شـوێنێکی سیاسـی دەهێڵێتـەوە. بەرانبـەر ئەمـە شیکاریی ئـەم چـەپ —

ڕاســـت – دژ بەریـــە دەمێکـــە لەســـەر زەمینـــەی ئینتەلەکتوێلیی رادیکال کۆتایی هاتووە. لە ساڵی 1968 بەدووا وە دەزانرێ کە چەپ و ڕاست چیدی نـــەماون، کەچـــی هـــەرگیز ســـەرەنجامێك لەمـــە دەرنەکێشرا. تاکە کەسێك کە ئەمڕۆ چەپ و ڕاست دەخزێنێتـە نێـو توورەکەیەکـەوە، بـۆ بەدبـەختی برێتیـە لـە لـو پـێن. ئـەوە کـە هـەموویان پێکـەوە بـە کاستە (توێژی داخراو –و)ی سیاسی ناو دەبات و لـەم ڕووەشـەوە تـەواو لەسـەر هەقـە. ئێمـەی چـەپ هـەمان شـتمان پـێش سـی سـاڵ دەربڕی. سیاسـەت دەبوو خۆی ڕێکبخاتەوە، بەڵام ناچاری چی بوو بۆ ڕێکخسـتنەوەی سیاسـەت، ئاوهـا هـات کـە دەبـوو لەســـەر زەمینەیـــەك ببـــزوێ کـــە لەســـەری چـــیدی جیاوازییەك لە نێوان چەپ و ڕاستدا نەبێ.

**دی تسایت:** ئایا لو پێن پڕمەترسیە؟

**بودریـــا:** زۆر پڕمەترسـیە، چـونکە سـەرجەم فیکری سیاسی ئەو بەدەر دەکات و ئەم فیکرە بەم هەڵوێستەشی خۆی بە دەر دەکات. فیکری سیاسی بەم شێوازەی ڕۆڵێك دەگێڕێ بۆ تەنینەوەی لو پێن. لو پێن بە هۆی جیهانبینیەکەیەوە پڕ مەترسی نیە" لـە ڕاسـتیدا ئیدیۆلۆژیەکەی زۆر ترادیسیۆنیە و بە هیچ شێوەیەك رادیکال نیـە. بـەڵام هەقیقـەت ئەوەیـە کـە لـو پـێن بێهێزیـی چینی سیاسیی لـە جەسـتەی خۆیدا یەکخستووە. لە بنەڕەتدا ئەم بێهێزیە حاڵەتـە ئـــــەنجامێکی ڕووداوی سیاســـــیە و شـــــیاوی پشتگوێخستنە. بەڵام گـەر هاتوو بە ڕاستی جارێك ماکێکی ئاشـکرای ئـەم بێهێزیـە سـەرهەڵبدات، ئـەوا دیمۆکراســـی دەکەوێتـــە بـــەردەم نائەکزیستێنســـی خـودی خـۆی. چەپ چیدی هێزێکی سیاسـی نیـە، چـەپ بـە ڕەوشـتی لێدەرچـووە و وەك دادگـەر دێتـە پێشـەوە. چـەپ جیهـانێکی ڕەوشـت دادەمـەزرێنێ، بـــەڵام ئـــەم جیهانـــە هـــەمان کـــات جیهـــانی چاکییەکی ڕواڵەتیە.

**دی تســـایت:** بـەڵام لـەوە دەچـێ کـە سیاسـەت هێنـدە بێسـەرەنجام و شیمانەیی (ڤیرتووێل) نـەبێ. ئـەڵمانیا و فەڕەنسـا زۆر جـار دەکەونـە دەمەقاڵـەی سەرەنجامەکانی ئەوڕۆ، هێنی سیستەمی یەکگرتنی کیشوەری. ئایا ئەوڕۆ بۆ جەنابتان چیە؟ ئایا ئـەوڕۆ هەوڵێکـــە بـــۆ کۆتاییهێنـــان بـــە لێکخشـــاندنە نەتەوەییـــەکان، یـــان تـــەنها برێتیـــە لـــە مـــۆدوس ئۆپەرانـدی – یـەك بۆئـەوەی بـەرپێی یەکخسـتنی سیســـــتەمەکانی پـــــارەوە بـــــازارێکی پوخـــــت دابمەزرێنرێ؟

**بودریا:** مـن شیکارێکی سیاسی نیم لـە بـواری پرســـیارە ئەوروپیەکانـــدا، بـــەڵام مـــن دەبیـــنم ئەوروپایەك لە سەرهەڵداندایە. من نازانم مەسـەلەکە لـە ئـەڵمانیا چۆنـە، بـەڵام هـیچ کەسـێك لـە فەڕەنسـا بەڕاستی بڕوای پێ ناکات. کەچی سەرەڕای ئەمەش ئـــەم ئەوروپایـــە دروســـت دەکـــرێ، بێگومـــان وەك ریالیتێیەکی شیمانەیی (ڤیرتووێل). پـارە برێتیـە لـە ســـیمبۆڵی ئەبستراکســـیۆنێکی کۆسمۆپـــۆلیتی. هـەروەها مـرۆ دەتوانـێ ببێـژێ: ئـەوروپا برێتیـە لـە میکرۆمـــۆدێلی گشتتەشـــەنەییدان (گلۆبـــالکردن). ئـەوروپا شـتێکە کـە لـە هـەمان کاتـدا ڕوودەدات و ڕوونـادات، کەواتـە برێتیـە لـە سـەروێنە (نموونـە)ی دزێویگـەری (سیمولاسـیۆن). ئـەوروپای دزێـوکراو دروست دەبێ، بەڵام هیچ یەکێك نابێ بـە کـەرتێکی. ئەمـەش کـەمێك لـە دەسـتووری سۆسیالیزاسـیۆن دەچـێ، لـەو شـێوەیەدا کـە مـرۆ لـە هـەموو جێیـەك دەیبینـــێ. سۆســـیالێتی هەمیشـــە پـــوختتر

بەدیدەهێنرێ و دەگونجێنرێ، کەچی لە نێویدا یەك تاکە کەس نیە. هەموو کاتیگۆرییەکی مرۆڤ کەمتر یان پتر بەدەرکراوە، هەتا ئیتر ساتێك دێتە ئاراوە کە تێیدا سۆسیالێتی تەواو دزێوێنراوە.

لە ئەوروپا هەلاّتنێکی زلی بەرەوپێش هەیە. پرسیارەکەش تەنها ئەوەیە کە ئاخۆ دەخوازرێ چی بشاردرێتەوە یان خۆ لە چی بپارێزرێ. ڕەنگە مرۆ بە ڕاستی هەوڵ بدات خۆی لە بەرهەڵستیی ئەو سینگولاریتێیانە بە دوور بگرێ کە بەرەو ڕووی ڕێکخراوی نوێی ئیکۆنۆمی و سیاسی وە جیهان دەبنەوە. بەبێ گومان هەموو یەکێك دژی کۆسمۆپۆلیتەکردنی شتەکان دەوەستێتەوە. هەر بۆیە دەبێ نەخشەی مۆدێلی نوێی گونجاندن (ئینتەگراسیۆن) بکێشرێ، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەم مۆدێلانە هیچی دیکە نین جگە لە حەلکردنی نەوێنراوەکان و تایبەتێتی (پارتیکولارێتی) و تاکێتییەکان (سینگولارێتی). هەرچییەك کە نەفرەتێنراوە و پیرۆزێنراوە، دەبێ حەل بکرێ، بەلاّم هیچ جەختییەك بە دەستەوە نیە کە ئاخۆ ئەم پرۆژەیە سەربگرێ. ئەوروپا لە ڕووی دامەزراوەییەوە چێدەبێ، چونکە هاوگەرییەك لە نێوان حکومەتەکان و چینەکانی سیاسی و کەسانی داراییدا هەیە. بەلاّم هەتا چەند پتر ئەم گونجاندنە لە لوتکەدا چێبکرێ، هێندەش کەم لە زەمینەدا چێدەبێ.

**دی تسایت:** کوتوپڕ دەربارەی کریزەی کۆمەلاّیەتی دەدوێن. ئایا ئەمە ئەو واتایە دەگەیەنێ کە سیاسەت سەرلەنوێ بۆ نێو "مێژوو دەگەڕێتەوە" و پۆستمۆدێرنە بەرەو کۆتایی دەڕوات؟

**بۆدریا:** بەڵێ. بەلاّم لەو واتایەدا کە پۆستمۆدێرنە ویستی پاشماوەکانی مۆدێرنە بچەسپێنێ. من نازانم کە ئاخۆ دەبێ پۆستمۆدێرنە چی بوو بێ جگە لە تەنها ووشەیەك. ئەمە بۆیە ئاوهایە، چونکە ڕەنگە مۆدێرنە هەرگیز ئەکزیستێنسی نەبووبێ. بەلاّم مۆدێرنە وەك یۆتۆپیایەك هەبوو کە زۆر بە پەلە بەسەر ئامانجەکانی خۆیدا بازیدا. ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی پۆستمۆدێرنە بێتە ئاراوە، مۆدێرنە بەسەر ئامانجەکانی خۆیدا سەریکردبوو، ئەم سەرکردنەش لە شێوەی فرەبەرهەمهێنان و فرەزەبر نواندن خۆی دەنواند. زۆر زەحمەتە بگووترێ کە ئاخۆ چی لە هاتندایە. بەلاّم من بە هیچ شێوەیەك باوەڕ ناکەم کە مرۆ بتوانێ ڕووەو بەها دێفێنزیڤەکان بگەڕێتەوە، واتا لەو شێوەیەدا کە هابەرماس ڕایدەگەیەنێ، کە گوایە مۆدێرنە هێشتا خاڵی نەبۆتەوە و لەبەر ئەم هۆیەش پێویستە مرۆ هەتا کۆتایی ڕاسیۆنالێتی هەنگاو بنێ. خۆ هەموو شتێك بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە زۆر فرە ڕاسیۆنالێتی هەیە، کە زۆر فرە ڕیالێتی هەیە، کە زۆر فرە ئینفۆرماسیۆن هەیە، ئینجا ئێمەش خۆمان لەنێو بێپێوەریدا لەسەر زەمینەی ئاژاوە (کائۆس) و کارەساتیەتی دەبزوێین. مرۆ بە پتر ڕاسیۆنالێتی دامەزراو لەم کریزەیە ڕزگاری نابێ.

**دی تسایت:** بەلاّم خۆ ناهاوکاتیش هەیە، خۆ زەبر و بێدادی هەیە، خۆ کریزەی تەواو ڕیال هەیە. کەچی جەنابتان دەخوازن قەناعەت بە جمهور بهێنن کە گوایە سەرجەمی جیهان برێتیە لە شوێنێکی ناهەقیقی، لە هەقیقەتێکی دووەمینی دەسکرد.

**بودریا:** بەبێ گومان ناهاوکاتی لە گۆڕانەکاندا هەیە، بەبێ گومان زۆر ناوچە هەن کە گشتتەشەنەییان بەرناکەوێ. جگە لەمە کێشەکە لە حاڵەتی سۆسیالیزاسیۆنیشدا هەر بەم چەشنەیە. لە فەرەنسا ژمارەیەکی زۆر مرۆڤ هەیە کە بە ڕەهایی لە چالاکیەکانی ئیکۆنۆمی بەدەرن. لە سەردەمی زوودا ناکۆکییەکی زیندووی مێژوویی هەبوو لە نێوان ئەوانەدا کە دەچەوسێنرانەوە و بەدەرکرابوون، ئینجا ئەوانەدا کە دەسەڵاتیان هەبوو. بەڵام لەوە دەچێ کە مرۆ ئەمڕۆ چیدی نەتوانێ بە دژبەریی دیالێکتیکیانە بیر لەم کێشەیە بکاتەوە. بە چەند ووشەیەکی دی بڵێم: هیچ شیمانەیەك نەماوە بۆ ئەوەی لەم نەسازیانەوە حاڵەتێکی سیاسی بێتە ئاراوە. ئەو هەقیقەتە کە هەندێك کەس هیچ دەرفەتێکیان نیە بگەن بە ئینفۆرماسیۆن و هەندێکی دی خاوەنی زۆر فرە ئینفۆرماسیۆنن، هیچ ناکۆکییەکی سیاسی ناهێنێتە ئاراوە. ئەو کەسانە ڕەوانەی بیابان دەکرێن، کە خۆیان لە نێو سیرکولاسیۆندا نابیننەوە و خاوەنی بەرهەمەتۆڕ نین. ئەمڕۆ لە فەرەنسا زۆر دەربارەی پچڕانی کۆمەڵایەتی قسە دەکرێ. ئەمە میتافۆرێکی جوانە، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ پچڕاندنێکی ڕاستەقینە لە ئارادا نیە، بەڵکو پچڕاندنەکە تەنها لەو واتایەدا هەیە کە ناکۆمونیکاسیۆنێکی ڕەها لە نێوان تەوەرەیەك و یەکێکی دیکەدا هەیە. مرۆ تەنانەت ناتوانێ بێژێ کە تەوەرەیەکی فرە ئینفۆرماسیۆن و تەوەرەیەکی نائینفۆرماسیۆن هەیە، بەڵام جیهانێك هەیە کە ئەکزیستێنس دەکات، هەروەها جیهانێکی دیکە هەیە کە ئەکزیستێنس ناکات. مرۆ سەردەمی زوو دەیتوانی بێژێ، ئەوانەی لە نێو سیرکولاسیۆندا نەبوون، لایەنی کەم ئەکزیستێنسێکی مەزنیان هەبوو. بەڵام ئێستا ئەمانە چیدی سینگولاریتێ نین، بەڵکو تەنها پاشماوەن. ئێمە لە نێو کۆمەڵگای زبڵدا دەژین نەك لە کۆمەڵگای ناکۆکیدا.

**دی تسایت:** بۆ ئەوەی جیهاندیدیەکەتان بە نەسازی تەڵخ نەبێ، ئەوا ناچارن بە شێوەیەکی سیستەماتیك نکوڵی بکەن لەوەی کە بەڕاستی شیمانەی کردار هەیە. ئینجا لە کۆتاییدا پایەگای سەبژێکتیش دەپێچنەوە.

**بودریا:** بەڵێ" من چیدی باوەڕ ناکەم کە سەبژێکت برێتی بێ لە جێگەیەکی ستراتیژیانە، هەموو ئەو سیمایانەی دەدران بە کاتیگۆری سەبژێکت، بۆ نموونە ویست، حەز، ئازادی، بەرپرسیاری، هەموو ئەمانە بوون بە فونکسیۆن و یەکێك دەتوانێ ئەویەڕی وەك تاسەیەکی لاوەکی یان وەك دیکۆری دەسکرد لێیان تێبگات. سەبژێکتی کۆنی کلاسیکی بزر بووە لە بەرژەوەندیی ئەو تۆڕەدا کە خاوەنی ئۆتۆنۆمیی ڕاستەقینەیە. مرۆ دەتوانێ تەنانەت بێژێ کە سەبژێکت بزر بووە لە بەرژەوەندیی ئیندیڤیدوویەکی نوێدا کە بە توندی تەکنیکیزە و ئۆپەراسیۆنال کراوە.

ئەم ئیندیڤیدووە نوێیە تەواو یەکە لە تەك خۆیدا، بەڵام سەبژێکت بە پێچەوانەوە — لەو شێوەیەدا کە ئێمە ناسیومانە — لە خۆیدا دوو بەش بوو و نەساز بوو لەتەك ویست و حەزی خۆیدا. ئیندیڤیدوو بە پێچەوانەوە بە هیچ شێوەیەك دوو بەش یان نامۆ نەبووە، بەڵکو برێتیە لە گەردیلەیەکی نێو تۆڕەکە. سەبژێکت لە نێو

سیستەمدا بزر نابێ، بەڵکو لە نێو لاساییە مەهزەلە (پارۆدی)ی خۆیدا بزر دەبێ، واتا لەو ئیندیڤیدووە نوێیەدا کە هێشتا مافی بۆ تەرخان دەکرێ و کەچی خۆی هێشتا هەر بە ئازاد و بەرپرسیار دەزانێ. ئێستا ئەم فونکسیۆنانە بە زۆری ڕەوایەتی بە خودی ئۆپەراسیۆنەکان دەدەن: مرۆ باوەڕ دەکات پرۆژەیەکی هەیە، ئینجا بە هەر شتێك بێ هەڵدەستێ و پاشان ئەمە بە پاشگەریانە ترانسفۆرماسیۆن دەکات بۆ نێو پرۆژەکە. ویست بە دیدی پاشگەریانە ڕەوایەتی بەوە دەدات کە پێشتر رووی داوە. ویست، ئازادیی سەبژێکت، ڕەوایەتی بەوە دەدات کە سیستەم دروستی کردووە، ڕەوایەتی بەوە دەدات کە مەکینە و پرۆگرامەکان بە شێوەیەکی ئۆپەراسیۆنێل ئەنجامیان داوە. مرۆ ناتوانێ تەنانەت دەربارەی مەرگی سەبژێکت لەو واتایەدا ببێژێ کە دەربارەی مەرگی خوا دەیبێژێ. دەتوانین بڵێین، سەبژێکت سووك و ئاسان بزر بووە، تواوەتەوە.

وەك نموونەیەکی بچووك لە تەلەفونی دەستی (هێندی – و) بڕوانن. ئەم مۆبیلتلەفونە شێوەیەکی کاریکاتۆری، شێوەیەکی تەواو ئۆبسوێن دەدات بە خاوەنەکانی. تکایە بمبەخشن، گەر ئێوەش خاوەنی مۆبیلتلەفون بن. من ئەوەی ڕاستی بێ مەبەستم نیە هێندە توخنتان بکەوم. بەڵام من دەبینم چۆن خەڵکان بە هێندیەوە لەسەر شەقام دەوەستن. ئێستا لێرەدا ناوچەیەکی ئیزۆلەکراو بۆ خۆیان تەرخان دەکەن. ئەمانە تەنها بۆ ئەوەی شتە پریڤاتەکەی خۆیان ئەنجام بدەن، ئەوا ئەوە تێکدەشکێنن کە هیچ نەبێ وەك پاشماوەی شوێنی گشتی ماوەتەوە، ئەم شتە پریڤاتەشیان شتێکە کە لە نواندندایە لەتەك کۆسمۆپۆلیتیزمدا و دەیەوێ لەتەك سەرجەم جیهاندا بچێتە تۆڕی پەیوەندیەوە. ئەمە شێوەیەکی بەدەرکردنە، شێوەیەکی وەلاوەنانە. من لەم لایەنانەدا دادگەرێکی باش نیم، من تەنها فاکسێکم هەیە و نە کۆمپیوتەر و نە هێندی بەکاردەهێنم. بەڵام ڕوانینی ئەم ئیندیڤیدووانە بە هێندیەوە شەرمەزاریە و نەشیاوی تەحەمولکردنە. ئەوە برێتیە لە شکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی، گەر خەڵکان لەسەر شەقامەکە ئیشارەبدەن: من گرنگی بە هیچ کام لە ئێوە نادەم، من لە بری ئەمە لە نێو تۆڕدا بەستراومەتەوە" من لە نێو جیهان لە ماڵی خۆمدام، ئێوەش تەنها لەسەر شەقامەکەن. من حەزم بەمە نیە کۆمپیوتەر و مۆبیلتەلەفون دەزگان بە ڕەهەندێکەوە کە برێتیە لە ئەڵقەبەندیی ئیندیڤیدوو لە نێو گەردوونێکی بەرەهایی داخراودا.

**دی تسایت:** لەتەك ئەم دەربڕینەدا شتێك دەگونجێ: ئەم تەکنیکە لە ڕێکلامدا بە شێوەیەکی ئۆبسوێن هومانیزە دەکرێ. شمەکە تەکنیکیەکان بە سۆز پڕ دەکرێنەوە. ئایا ئەم چەواشەکردنەی شمەك و پارە و لیبیدۆ چە واتایەك دەگەیەنێ؟

**بودریا:** ئەمانە ئەو کێشە کۆنانەن کە ئێمە لە شەستەکان و حەفتاکاندا هەمان بوون. ئەم کۆلاژەی شمەك و سێکسوالیتێ بۆ نموونە وەك نامۆبوون ڕاڤە کرا" مرۆ بۆ ئەوە چوو کە شمەکی ڕاستەقینە، نرخی بەکارهێنانەکەی، تەزویر دەبێ گەر هاتوو سێکسوالیتێ بهێنرێتە ناویەوە. بەڵام یەکێك دەتوانێ لێرەدا ببێژێ کە ئەم کێشەیە لە بنەڕەتدا هەوڵێکە بۆ ئەوەی جیهان لە سێکسوالیتێ پاك بکرێتەوە، ئەمە بە تێبینیی من لایەنە گرنگترەکەیە.

خۆ مرۆ دەبێ بە ڕوونی ببینێ، ئەم سێکسوالیزەکردنەی جیهان – کە بێگومان تەنها ڕوو ناکاتە شمەك، بەڵکو هەروەها ڕوو دەکاتە وێنە و پۆرنۆگرافی – هیچی دیکە نیە جگە لە فۆنتەراتێکی ناسێکسوالیزەکردن و پاشان بە وەچەخستنەوەی بێسێکسی (کلۆن) کۆتایی دێ. ئێمە ئەمڕۆ کەوتووینەتە بەردەم پرۆسەی لە ڕیشە دەرکێشانی سێکسێتی. گەر مرۆ بیەوێ جیهانێکی پێرفێکت دابمەزرێنێ، ئەوا نەشیاوە ئەم جیهانە هینی سێکسێتی بێ، بەڵکو دەشێ کە تەنها جیهانێکی بێ سێکسێتی بێ.

من ئەو حاڵەتەم زۆر لا سەیر بوو کاتێك فیلمی "کڕەش" لە بەریتانیای مەزن یاساغ کرا، ئەمەش بەو بیانووە کە گوایە ئەم فیلمە دەبێ بە پاڵهێزی سەرهەڵدانی جۆش بۆ زەبری سێکسی. مەسەلەکە لێرەدا سەبارەت بە کتێبەکەی بالارد – کە فیلمەکەی لێوە دەرهێنرا – ئەوەیە کە ئەم کتێبە بە ڕاستی پڕ مەترسیە، بێگومان نەك لەبەر ئەوەی بانگەوازێك بدات بۆ ئازادی و بەرەڵایی سێکسی، بەڵکو لەبەرئەوەی سێکس چیدی وەك سێکس ڕوونادات و تەنها لەسەر زەمینەی بابەتی تەکنیکی و حادیسە خۆی دەنوێنێ. ئەمەش بریتیە لە نەرێدانێکی ڕەها بە فونکسیۆنی سێکس. گەر سانسۆر بە تەواوی ووریا بووایە، ئەوا دەبوو بە ڕاستی لە دژی بە ئیجرا هەستێ. فونکسیۆنی سێکسێتی خراوەتە پاشماوەچێوەی کەرتە بابەتەوە" هەموو برینێك بریتیە لە ئۆرگانی حەز (حەزگە). ئەمەش بریتیە لە بزربوونی سێکسێتی لە نێو بڕێکی بێدوایەکیی شیمانەدا: (با) لە هەموو جێیەك سێکس ببینرێ، لە هەموو جێیەك سێکس بکرێ. هەموو شتێك لە نێو بەرەڵایی بێسنووردا (ئێکسسێس) لەناودەچێ. گەر سێکس لەناوبچێ، ئەوا لەبەرئەوەی سێکس زۆر فرەیە" گەر ئینفۆرماسیۆن لەناوبچێ، ئەوا لەناودەچێ چونکە ئینفۆرماسیۆن زۆر فرەیە.

**دی تسایت:** ئایا چە سەرەنجامێك لە دیاگنۆزەکەتان دەردەکێشن؟ ئایا بەرگەی ئەم دیاگنۆزەی خۆتان دەگرن؟ خۆ هەرچۆنێك بێ جەنابتان لە گۆڤاری "کریزیس"ی ڕاستڕەوە نوێکاندا کەوتنە ئەتککردنی مۆدێرنەی ئێستێتیکی. هەتا ئەمڕۆش ڕاستە توندڕەوەکانی دەوری ئالان دو بێنوا چەپڵەی ئافەرین لێدەدەن. ئایا جیهانبینیەکەتان بەرەو ڕاست دەبەن، بۆ نێو باوەشی ئەنتیمۆدێرنە؟

**بودریا:** نەخێر، نەخێر، من بە هیچ شێوەیەك بەرەی خۆمم جێنەهێشتووە و پەڕیبێتمەوە بۆ لای ڕاستە توندڕەوەکان. ئەم چیرۆکە ماوەی ساڵێکە هاتۆتە ئاراوە. من ووتارێکم لە گۆڤارێکدا بڵاوکردبۆوە، پاشان دەرکەرانی "کریزیس" پرسیاریان لێکردم کە ئاخۆ مۆڵەتیان هەبێ جارێکی دیکە لە لای خۆیان چاپی بکەنەوە. من هێندە بیرم لەم مەسەلەیە نەکردەوە، چونکە من هێندە گرنگی نادەم بە تێفکرینە چەپ – ڕاستەکان. "کریزیس" گۆڤارێکی ئینتەلیگێنتە و تەنانەت زیرەکترە لە هەندێکی گۆڤارە چەپەکان.

بەڵام ئەمە بە هیچ شێوەیەك کێشەکە نیە. ووتارەکە بڵاوکرایەوە و سەرەنجام چیرۆکێکی بێواتای لێکەوتەوە، چونکە شێوازی بیرکردنەوەی سەروەری سیاسی هیچ لارییەکی لەوە نەبوو کە ڕاستەوخۆ مۆرکی پاشگەرێتی لە من بدات. کاتی سەرهەڵدانی ئەم تۆمەتە ناگەڕێتەوە بۆ ئەمڕۆ. من

ماوەیەکی درێژخایەنە خۆم لە بەردەم هەموو جۆرەکانی هەستی دوژمنایەتیدا دەبینمەوە" بۆ نموونە تۆمەتی ئەوەم دەخەنە پاڵ کە گوایە من هەستی بەرپرسیاری یان بیرکردنەوەیەکی بەم چەشنەم نیە. لێرەدا ئێستا ئەمە کریستالە بووە. ئەوەی بەراستی پیس و شایانی ڕشاندنەوەیە ئەوە بوو کە دوو کێشە بە یەکتری تێکەڵ کران. کێشەیەکیان ئەمەیە: ئایا ئێمە چی بکەین لەتەك هونەری هاوچەرخدا؟ ئەم پرسیارە کێشەیەکی زۆر قەبەیە، بێگومان نەك تەنها بۆ هونەرمەندان، بەڵکو بۆ هەموو یەکێك کێشەکەی دی ئەمەیە: ئایا ئێمە چی بکەین لە تەك لوپێندا؟ ئەم دوو کێشەیە تێکەڵ بە یەکتری کران و زاراوێکیان لێ چێکرا: گەر یەکێك هونەری هاوچەرخ ئەتك بکات یان تەنانەت لێی بکەوێتە گومانەوە، ئەو کەسە بێ چەند و چوون ڕاستێکی توندڕەوە. ئەمەی دەکرێ برێتیە لە ئاوێتگەرییەکی تیرۆریستانەی ئیستێتیك و سیاسەت، ئەمە وازییەکی پیسە و تەنانەت بە پێویستم نەزانی بەرانبەری بەرگری لە خۆم بکەم، مرۆ دەڵێ کە گوایە ئێمە لە کۆمەڵگایەکی لیبەرال و لێبوورد دا دەژین، بەلام ئەم قسەیە ڕاست نیە. جارێك دێ کە سەرجەمی ئەمە شیتەڵ بکەمەوە، بەلام جارێ لە میانەگریدا دەمێنمەوە، سەرجەمی ئەمە بۆ من شەڕخوازییەکی زەقە. حەز ناکەم پتر لەمە بدوێم.

**سەرچاوە**

***Wochenschrift***

***DIEZEIT,1997***

# ئاستەنگەکانی دیموکراسی مۆدێرن

## دیالۆگێك لەگەڵ تۆماس کارۆتێرزدا

رامین جەهانبەگلو
لەفارسییەوە: کارزان محەمەد

تۆماس کارۆتێرزی بیرمەندی ئەمریکی، کۆلیژی مافی لەزانکۆی هارڤاردو کۆلیژی ئابوری لەزانکۆی لەندەن تەواوکردووە، ئەو وتارو کتێبگەلێکی زۆری لەمەڕ سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاو پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان نوسیوە.

تەوەرەی سەرەکی لەنوسینەکانیدا، (دیموکراسی)یەو پتر لە (23)ساڵە لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستو بەرفرەکردنی دیموکراسی لەخاڵەجیاوازەکانی جیهاندا" چالاکی دەکات.و بەڕێوەبەری باڵای پرۆژەی (دیموکراسیو دەسەڵاتداریتی یاسا)یە کە بایەخ بەشیکردنەوەی دۆخی دیموکراسی لەجیهاندا دەدات.

ئەمەش گفتوگۆیەکی (رامین جەهانبەگلو)ە لەگەڵ ئەودا سەبارەت بەئاستەنگە مۆدێرنەکانی دیموکراسی لەجیهاندا.

*****

*** دەربارەی (چەمکی دیموکراسی) جیاوازگەلێکی لەبەرچاوی بیروبۆچوون هەن، هەڵبەتە ئەم سەرگەرمییەی ئێستا لەچەندین دەیە لەمەوپێشەوە کە چەمکگەلێکیوەك (دیموکراسی جەماوەریی) یاخود (دیموکراسی شۆڕشگێڕی) دەبیسترا، کەمتربۆتەوە. ئەمڕۆ، هەندێك کەس پێناسێکی کەم بۆ دیموکراسی دەخەنەڕوو کە تەنها بریتییە لەبەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی ئازاد، وەلێ هەندێکیتر جەخت لەسەر ئاستێکیب الآتر لەئازادییە مەدەنییەکان دەکەنەوە. تۆ کام لەم لێکدانەوانە بەنزیکتر دەزانیت لەواقیعو پێناسی خودی تۆ بۆ دیموکراسی لەسەدەی (21)دا چییە؟**

–من پێموایە کە لەم (15 تا 20) ساڵەی دوایدا رێککەوتنێکی گشتی دەربارەی چەمکەکانی دیموکراسی هەیە. تۆ بەدروستی ئاماژەت بۆئەوەکرد کە چەمکگەلێکی وەك ئەوەی وتت یاخود نمونەکانیوەك (دیموکراسی ئەفریقایی)،

(دیموکراسی ئەمریکای لاتین)و (دیموکراسی عەرەبی) تائەندازەیەکی زۆر ئیعتباری خۆیان لەدەست داوە. ئەم نەتەوانە کاتێك هەوڵ دەدەن کە ببنەدیموکرات، لەبواری پراکتیکدا شتگەلێکی یەکگرتوو داوادەکەن. ئەم شتانە چین؟ هەڵبژاردنەکان‌و ستاندارکردنی دیموکراسییە، وەلێ ئەمانە هەموو شتێك نین. ئەگەر خەڵکی وڵاتێك نەتوانن ڕێبەرانی خۆیان هەڵببژێرن، تۆ ناتوانیت دیموکراسییەکی واقیعیت هەبێت. وڵاتێکی دیموکراتی وڵاتێکە کە خەڵکەکەی بتوانن ڕێبەرەکەیان هەڵبژێرن. وەلێ خەڵك بۆئەوەی بتوانن هەڵبژاردنێکی دروست ئەنجام بدەن، پێویستە خاوەنی لایەنی‌کەمی ئازادییە مەدەنییەکانی نمونەی ئازادی‌ڕاگەیاندن، ئازادی چالاکی کۆمەڵایەتی، ئازادی کۆبوونەوەو ئازادییەسیاسی‌و مەدەنییەکانی‌تربن. لەسەرئەم بنەمایە، بەتێڕوانینی من ئەگەر تۆ سیستەمێکی هەڵبژاردنی واقیعیت هەبێت کە لەڕێگەی بەرنامەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ دابینکردنی ئازادییە مەدەنییەکانی هاوڵاتیان ئامادەکرابێ، ئەم سیستەمە" دیموکراسییە. هەنوکە تۆ دەتوانیت جۆرەها دیموکراسی مۆدێرنی جیاوازت لەجیهاندا هەبێت، وەك دیموکراسی ئەمریکایی، دیموکراسی فەرەنسایی یاخود دیموکراسی هیندی. ئەوانە مۆدیلگەلێکی جیاوازی هەمان سیستەمن کە من دەربارەیان دەدوێم. ئەوان لەڕاستیدا جیاوازییەکی بنچینەییان لەگەڵ یەکتردا نییە.

***شێوازی مۆدێرنی سیاسەتڕێژی بۆ لەناوبردنی یاخود لایەنی‌کەم کەمڕەنگکردنی پەیوەندییەکانی سەرۆك - سەرۆك یاخود ئەرباب- ڕەعییەتی (کە تایبەتمەندی بنچینەیی سیاسەتی پێش سەردەمی مۆدێرن بوو) لە کۆمەڵگاکاندا سەری‌هەڵداوە. لەسەرئەم بنەمایە، سیاسەتی مۆدێرن کەمتر لەچوارچێوەی پەیوەندییەکانی نێوان ڕێبەران‌و پەیڕەوانیان شی‌وشیکار دەکرێت، بەڵکو سیاسەتی مۆدێرن زیاتر بەناوی کۆمەڵێك لە ناوەندەکان کە بوون‌و کارایان بەشێوەیەکی تایبەتی هەڵدەسەنگێنرێت" دەخرایەژێر شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەوە. بەتێڕوانینی تۆ ئایا دیموکراسییە مۆدێرنەکان توانویانە کە ئەم هاوسەنگییە بگۆڕن بەقازانجی هاوڵاتییە نوێیەکان‌و جیاکردنەوەی دەسەڵات؟**

– دیموکراسییە مۆدێرنەکان دوو ئاستەنگی بنەڕەتییان لەبەردەمدایە. یەکەمین ئاستەنگ کاراکردنی نوێنەرایەتی سیاسییە. مەبەستی من ئەوەیە کە ئەگەر تۆ ئازادی سیاسی‌و هەڵبژاردنی ئازادت هەبێت، خاوەن پایەو بونیادی پێویستیشیت بۆ سیستەمێکی نوێنەرایەتی. بەڵام ئەمە تەواوی مەسەلەکە نییە. دوای‌ئەوە تۆ پێویستە دژبەو لەڕێ‌لادانانە تێبکۆشیت. سیستەمی نوێنەرایەتی هاوکات لەبەردەم لاداندایەو تۆ پێویستە دژبەوە تێبکۆشیت تادڵنیابیت کە هەموو خەڵك، خاوەنی مافی یەکسانن بۆ ڕادەربڕین. سیستەمی دیموکراسی نوێنەرایەتی وڵاتانی ئەسکەندەناڤیا تەنها سیستەمێکە کە تیایدا یەکبەیەکی هاووڵاتیان خاوەنی مافی ڕادەربڕین‌و مافی بەشداریکردنن لە ڕەوتی نوێنەرایەتیدا.

دووەمین ئاستەنگی گەورەی دیموکراسییە مۆدێرنەکان، دەسەڵاتدارکردنی یاسایە لەپەیوەندییە سیاسییەکاندا، هەر سیاسەتمەدارێك، سەربەخۆ لەو دەسەڵاتەی هەیەتی، پێویستە پابەندی هەمان ئەو یاسایە بێت کە هاووڵاتییەکی ئاسایی ملی بۆ کەچ دەکات. ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە، چونکە تۆ لەم ڕێگەیەوە دەسەڵاتی سیاسی بەیاسا سنوردار دەکەیت، نەك یاسایەکی پۆستمێژوویی‌و دەرەوەی کۆمەڵگا، بەڵکو یاسایەك

کــە لەڕێگـــەی یاســـادانەرانی پێشـــنیازکەرەوە، دانـــــدراوەو پراکتیزەکـــــراوە. خـــــودی ئـــــەم یاســـادانەرانەش ئازادانـــە لەلایـــەن خەڵکـــەوە هەڵبژێردراون.

پاشان ئەم یاسایە، بەرهەمی سەرەتایی مافی حکومڕانییــەتی خەڵکــە. ئــەم یاســایە، دەســەڵات و سیاســەت ســنورداردەکات. هــەر سیســتەمێکی سیاسی، تەنانەت سیستەمە زۆر دیموکراتەکانیش، تێکۆشـانێکی بـەردەوام دەکـات بـۆ سـنورداركردنی سیاسـەتمەداران و ناچـارکردنیان بـۆ ملکەچیکردن بۆ یاسا. لەسـەرئەم بنەمایـە، ئێمـە لەدیموکراسـیدا ڕووبـەڕووی دووئاســتەنگی بـەردەوام دەبینـــەوە، یـــەکێکیان لـــەخوارەوە بۆســـەرەوە بەمەبەســـتی دروســـــتکردنی نوێنەرایـــــەتی ڕاســـــتەقینەو ئـــــەویتریان لەســـــەرەوە بۆخـــــوارەوە بـــــۆ سنورداركردنی سیاسەتمەداران و ناچارکردنیان بۆ ملکەچکردن بۆ یاسا.

جیاکردنـەوەی دەسـەڵاتەکان لەدیموکراسـییە مۆدێرنەکانـدا دەبێتەمایـەی دروسـتبوونی ئازادییـە مۆدێرنـــەکان، وەلـــێ لەهەمانکاتـــدا جۆرێـــك لـــە جیاکردنەوە لەنێوان خودی هاووڵاتیانیش دروست دەکات. هـەروەك چـۆن هـەموویان هەسـت دەکـەن کە دەسەڵاتدارن چونکە دەسەڵاتی حکومـەت لـەئیرادەی ئەوانـەوە سەرچـاوەدەگرێت، وەلـی لەهەمانکاتـدا ئـەوان هەسـت دەکـەن دەسـەڵاتێکیان نییـە چـونکە ئیرادەیـــان لەڕێگـــەی ئـــیرادەی ئـــەوانیترەوە سنوردار دەکرێت.

ڕاستە لەدیموکراسی ئێمەدا مادام ڕووبـەڕووی سـنوردارییەتەکان و هاوکێشـەکان بووینەتـەوە، بـۆ ئێمــە زۆر کێشــەیە کــە لــە کۆمــەڵگا مرۆییەکانــدا بـــەدوای کامەرانیـــداویڵ بـــین. خـــەڵك پێویســـتە ئـــەوەفێرببێت کـە لەهاوکێشـەکاندا لەگـەڵ یـەکتردا بژین، ئەوان پێویسـتە ڕوئیاکـانی خۆیـان هاوسـەنگ بکـەن، بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان هاوسـەنگ بکـەن و ئـــەو کۆمەڵـــە ئینتمایـــەی خۆیـــان کـــە نـــاڕێکن لەگەڵ واقیعیەتەکانـدا، هاوسـەنگ بکەنـەوە. بـەهۆی ئـــەم فاکتەرەوەیـــە کـــە دیموکراســـی پرۆســـەیەکی بـەردەوامی گفتوگـۆ، سـنورداربوون و هاوسـەنگییە. دیموکراسی" بەهەشت نییە. بەڵکو سیستەمێکە بۆ کۆکردنەوەی بەرژەوەندییەکانی خەڵك.

*** ئەم باسە ئێمە بـەرەو پەیوەنـدی نێـوان دەوڵـەت و کۆمەڵگای مەدەنی دەبـات. بـەتێڕوانینی تـۆ (کۆمـەڵگای مـــەدەنی) چـــەمێکێکی درۆزنـــە یـــاخود دەتوانێـــت بەبەهێزکردنی پەیوەندی نێوان هاولاتیان و دەولەت، خـەڵك بۆ بەشداریکردن لەحکومەتدا هان بدات؟**

–لەفەلسـەفەی سیاسـیدا، کۆمـەڵگای مـەدەنی چەمکێکی زۆربەبەهایە. ئەم چەمکە لەگـەڵ جیهـانی ئـــەمڕۆی ئێمـــەدا پەیوەندییـــەکی زۆری هەیـــە. لەڕەوەنـدی دیموکراتیزەبـوونی ئـەم (20) سـاڵەی دواییـدا لەسەرتاسـەری جیهانـدا، هاووڵاتیـان دژ بـە ســـتەرەکتورەکانی دەســـەڵات تێکۆشـــاون و ئـــەم تێکۆشـــانەیان لەژێرناونیشـــانی ناوەنـــدێکی وەك کۆمەڵگای مەدەنیدا پێناس کردووە. بەداخـەوە لـەم ســالانەدا لەســودوەرگرتن لــەزاراوەی (کۆمــەڵگای مــەدەنی)، وردبینیــەکی تــەواو ئــەنجام نــەدراوەو زیادلەســـنور ســـود لـــەم زاراوەیـــە وەرگیردراوە. بەشـێوەیەکی گشـتی خـەڵك بەشـێکی بچـوکیان لـە کۆمـــەڵگای مـــەدەنی هەڵبـــژاردووە و بـــە ئـــەو بەشەبچوکەشـــــیان بەکۆمـــــەڵگای مـــــەدەنی نـــاوزەدکردووە. بۆنمونـــە (*NGO*– ڕێکخـــراوە ناحکومییـــەکان) کـــە لـــە زۆرینـــەی وڵاتانـــدا دروســـــتکراون، بەشـــــێوەیەکی گشـــــتی وەك ئێســـکەپەیکەری بنچـینەیی کۆمـەڵگای مـەدەنی دانـدراون، لەکاتێکـدا کـە یەکێتییـە کرێکارییـەکان و

گروپەکانی لاوانیش بەشێکن لەم کۆمەڵگای مەدەنییە. لەسەرئەم بنەمایە کاتێک لەجیهانیئەمڕۆدا تۆ گوێبیستی وشەی (کۆمەڵگای مەدەنی) دەبیت، ئەم زاراوەیە بەشێوەیەکیگشتی ئاماژەیە بۆ کۆمەڵێکی بچوك لەم ڕێکخراوانە.

چەندین ساڵ لەمەوپێش وێنەیەك لە یەکێك لەرۆژنامەکانی کۆڵۆمبیا (لەئەمریکای باشور) بڵاوبۆوە، ئەموێنەیە دەربارەی سەرۆك کۆمار بووو مانشێتەکەشی ئەمەبوو: (سەرۆك کۆمار لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا دیدار دەکات).

ئەو وێنەیە، سەرۆك کۆماری کۆڵۆمبیا نیشان دەدا کە چاویکەوتووە بە سێکەس کە نوێنەرانی سێ ڕێکخراوی نادەوڵەتی بوون. ئەو شتەی کە مانشێتەکە ڕایدەگەیاند ئەوەبوو کە ئەو لەساتی دیدارکردندایە لەگەڵ سەرجەم کۆمەڵگای مەدەنیدا. ئەم نمونەیە گاڵتەکردنێك بوو، بەڵام مەبەستی ئەو مانشێتە ئەوەبوو کە کۆمەڵگای مەدەنی لە چەند ڕێکخراوێکی تایبەتیدا سنوردار دەکرێت.

من پێموایە ئێمە پێویستە لەسودوەرگرتن لەزاراوەی (کۆمەڵگای مەدەنی) وردبین بین، کۆمەڵگای مەدەنی کاتێك دروست دەبێت کە هاولاتیان لەدەوری یەکتر کۆببنەوە، بەهامەدەنییەکان لەنێوان خۆیاندا بەڕەسمی بناسن و سودلەوەوەربگرن بۆ سنوردارکردنی دەسەڵات.

*** بەتێڕوانینی تۆ لەو کۆمەڵگایانەی کە دەوڵەت ئەرکەکانی ئەنجام نادات و حکومەتییاسا بوونینییە، کۆمەڵگای مەدەنی دەتوانێ گەشەو شکۆفەی تیادابکات؟**

–من پێموایە لەنێوان دەوڵەتێکی دەسەڵاتداروبەکاریگەر پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ کۆمەڵگایەکی مەدەنی دەسەڵاتدارو بەکاریگەردا هەیە. ئەگەر یەکێك لەئەوان لاواز بن، کۆمەڵگا هاوسەنگ نییە. مەبەستی من لە دەوڵەتێکی دەسەڵاتدارو کارا، دەوڵەتێکی تاکڕەو نییە. مەبەستی من لە دەوڵەتێکی دەسەڵاتدار، و کاراو ئۆرگانیزەکراوە کە بەباشی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا دادەمەزرێنێت و توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی هەیە.

لەنێوان هەردوو چەمکی دەسەڵاتخوازیو کاریگەربووندا جیاوازگەلێك هەن. لەنێوان (باوکی دەسەڵاتدار)و (باوکی دیکتاتۆر)دا جیاوازی هەیە. باوکی دەسەڵاتدار باوکێکە کە جێی ڕێزە. دەوڵەتی دەسەڵاتدار، دەوڵەتێکە کە ئەو ئاراستەیەی هەبێت، تۆ دەتوانیت بەدوای دەوڵەتدا بگەڕێیت و پێیبڵێیت کە ئێمە کێشەی ژینگەیمان هەیە وەرە با هاریکاری یەکتر بکەین. ئەگەر تۆ دەوڵەتێکی کاریگەرت هەبێت، کۆمەڵگای مەدەنی هیچ کێشەی لەهاریکاریکردنیدا نییە.

***یەکێك لەو پرسیارانەی کە من هەمیشە لەخۆمی دەپرسم ئەوەیە کە بۆچی دیموکراسی لەولاتەپێشکەوتووەکاندا، پایەدارترن؟ ئایا بەهەمانشێوەی کە (لیپست)وتویەتی فاکتەرەکەی ئەوەیە کە لەئاستی داهاتیبالادا، هەژاریی کەمترە یاخود بەوتەی (لێری دیامۆند) ڕۆڵگێڕانی سیاسی لەولاتانی پێشکەوتوودا ئامادەگی زیاتر هەیە بۆ کارکردن لەناوەندێکی ئۆرگانیزەکراودا؟**

–بەتێڕوانینی من چەند فاکتەرێك لەم کێشەیەدا ڕۆڵیان هەیە. من لەڕووی چەندلایەکەوە جەختیان لەسەردەکەمەوە. یەکەم ئەوەیە کە لەکۆمەڵگادەسەڵاتدارەکاندا، ناچڕکراوەترن. چونکە تۆ سەرچاوەی بەرهەمهێنانی جۆراوجۆرت لەسەرئاستی کۆمەڵگا هەیە. لەسەرئەم بنەمایە تاکەکەسێك یاخود خێزانێك ناتوانن زاڵ بن بەسەر سیستەمەکەدا. کێشەی کۆمەڵگا هەژارەکان ئەوەیە

کـە ژمارەیـەکی کـەمی خـەڵك دەسـەڵاتدارن بەسـەر کاروباری کۆمەڵگادا. دابەشبوونی سامان لەکۆمەڵگا دەوڵەمەندەکاندا باشترە وەك لەکۆمەڵگا هـەژارەکان. دووەم ئەوەیە کە بەدیهێنانی دیموکراسی پێویستی بـەکات و ڕاهێنانـە. وڵاتانی نمونـەی فەرەنسـا، ئـەمریکا، پێشـینەی دووسەدسـاڵی ڕاهێنـانی سیاسـیان هەیـە. بنـۆڕە کۆمـاری فەرەنسـاو پێـنج کۆمـارە جیاوازەکـەی. هـەر فەرەنسـا ئـەزموونێکی دیموکراسی بووە. لەسەرئەم بنەمایـە ئـەو وڵاتانـەی کـە مێـژووی دیموکراسـییان نییـەو لـەماوەی (10تـا20)سـاڵی ڕابـردوودا بـەرەو دیموکراسـی جـوڵاون، پێویسـتە ئـەوە بـزانن کـە دیموکراسـی ڕەوەنـدێکی بـەردەوامی گۆڕانکـاری سیاسـی و تێکۆشانە بۆ سبەینێیەکی باشتر.

*** ئـەم بابەتـە ئێمـە دەگەیەنێتـە وتـارێکی تـۆ بەناونیشانی (تەواوکردنی پارادایمگوزار)، چەندسـاڵێکیش لەمەوپێش فەرید زەکەریا لەوتارێکدا لە گۆڤاری (فـۆریگن ئەفاریس)دا ئەم ئایدیایەی خستەڕوو کە ڕەنگە دیموکراسی بۆ هەندێ لەوڵاتان مۆدێلێکی زۆرباش نەبێت و لەبەرامبـەردا پێشنیازیکرد کـە هـەوڵ بـۆ دروسـتکردنی سیستەمێکی ناسـیۆنالیزمی لیـبراڵ بـدرێت لـەم وڵاتانـەدا. زەکـەریا لەم وتارەدا، تێگەیشتنی ژمارەیـەکی زۆری لـە شـیکارانی ڕۆژئاوا بۆ دیموکراتیزەبوون" خستەبەر ڕەخنـەوە. تـۆش لـە وتاری (تـەواوکردنی پـارادایمگوزار)دا کـە لـە کـانوونی دووەمی (2002) لە گۆڤـاری دیموکراسـیدا چـاپ کـرا، ئاماژەت بۆهەمان خـاڵ کـردووە کـە زەکـەریا ئامـاژەی بۆکردبـوو. تـۆش داوات لـە تیۆریسـتانی بەرەوپێشـبردنی دیموکراسـی کردبـوو کـە (پـارادایمگوزار)وەلابنێن و چاوەنواڕی ئەوە لەزۆرێك لـەوڵاتان نەکـەن کـە بگـونجێن لەگەڵ پیناسی ئەواندا بـۆ دیموکراسـی. تـۆ بەپێچـەوانەی زەکەریاوە ناڵێیت کە ئێمە پێویستەوەك مـۆدێلێکی گونجـاو دەستبەرداری دیموکراسی ببین. بەڵکو وتەکانی تۆ ئەوەیـە کە زۆرینەی وڵاتان لەدۆخی دیکتاتۆریـدان نـەك لـەدۆخی جولاّن بەرەو دیموکراسی.**

–مـن پێمـوایـە ئـەو شـتەی کـە فەریـد زەکـەریا دەیویسـت جەختیلەسـەر بکاتـەوە ئـەوەبوو کـە هەنـدێ لـەوڵاتان ئامادەگیـان بۆ دیموکراسی نییـەو پێویسـتە لەڕێگـەی گەشـەی ئـابوریو ڕێکخسـتنی یاسـاکانەوە بـۆ بەرقـەرارکردنی دیموکراسـی ئامادەبـاش بکـرێن. لەسـەرئەم بنەمایـە وتـەی ئـەو ئـەوەبوو کـە دیموکراسـی بەرلـەوادەی خۆی" مەترسیدارە.

وتـەی وتارەکـەی مـن شـتێکیتر بـوو. مـن دەمەویست بڵێم کاتێك ئێمە سەرنج دەدەینە (100) وڵات لـە دەوروبـەری دنیـا، ئـەمریکای لاتـین، خۆرهـەڵات، ئاسـیاو ئـەفریقا، دەرئـەنجامی گۆڕانکارییـەکانی ئەم (20) ساڵەی دواییـان چییە؟ شـێوەیەك کـە ئێمـە لـەم وڵاتانـەدا سـودمان لـێوەرگرت و بـە (گـوزار) ناوزەدمـان کـرد، ڕژێمـی دیکتـاتۆری لەناودەچێت یـاخود کۆیلەن، وەلـێ ئـەو ڕووداوانـەی کـە لەموڵاتانـەدا لـەدۆخی ڕوودان دان، ڕەوتکـردن نییـە بـەرەو دیموکراسـی. زۆرینـەی ئـەم وڵاتانـە ئەوەنـدە دیموکراسـی نـین. ئـەوان لـەنێوان دیکتاتۆریو دیموکراسیدان.

من ئەم دۆخە بە (دۆخی ئاڵۆز) ناودەبەم. ئێمـە ئیتر نابێت چاوەنواڕی ئەوەیان لـێبکەین کە بـەرەو ڕەوتکردن هەنگاوبنێن.

من کاتێك بڕیارم دا ئەموتارە بنوسم کە گەشتم بـۆ هەنـدێ لـەم وڵاتانـە کـرد و نوێنـەرانی وڵاتانی ڕۆژئـاواو هـەروەها نوێنـەرانی ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییەکان بـەمنیانوت: (نـەخێر! ئـەم وڵاتانـە لـەدۆخی ڕەوتکردنـدا نـین بـەرەو دیموکراسـی. ئەموڵاتانـە گەیشـتونەتە سـەقامگیرییەك لـە دەسـەڵاتدارێتی سیاسـیداو دەسەڵات لـەم وڵاتانـەدا

گەمارۆ دراوەو ژمارەیەك كەس، سیستەمەكە بەڕێوەدەبەن.) ئەموڵاتانە لەدۆخی جوڵانی سروشتیدا نین بەرەو دیموكراسیو بیرۆكەی جوڵانی سروشتی بەرەو دیموكراسی دەتوانێ ئێمە ڕێنمایی بكات بۆ تێگەیشتن لەڕەوەندی ڕووداوەكانی دنیا.

*** تۆ لە دوا وتارتاندا لەگۆڤاری فۆرین ئەفرزدا بەناوی (دیموكراسیو جەنگیدژبەتیرۆر) ڕاتگەیاند كە دژ بەبەرەو پێشبردنی هێرشبەرانەی دیموكراسیت كە سیاسەتی نوێی موحافیزكارانی ئەمریكایە؟**

—بەتێڕوانینی من پێویستە بەتەواوەتی خۆپارێزی بكرێت لەزۆرەملێیكردن بۆ بەرەوپێشبردنی دیموكراسی. كۆمەڵە بابەتێك هەن كە پێویستە سود لەهێزە سەربازییەكان وەربگیردرێت بۆ بەرگری میللیو یاخود مەسەلە ئاسایشییەكان، بەڵام نابێ هێزی سەربازی بەكاربهێنرێت بۆ مەبەستە سیاسییەكانی نمونەی دروستكردنی دیموكراسی لەوڵاتێكدا. لەسەرئەم بنەمایە تەنانەت ئەگەر من پەسەندیشم بێت كە ئەمریكا دەبێ هاریكاری دروستكردنی دیموكراسی بكات لەسەرتاسەری جیهاندا، ئەوا بڕوام بەو ئایدیایە نییە كە داگیركردنی سەربازییانە هاریكاری سەقامگیركردنو بەرەوپێشبردنی دیموكراسی بكات.

*** لەسەرئەم بنەمایە بێت لەبارەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، تۆ ڕەزامەندیت ڕەوتەكە هەنگاو بەهەنگاو بێت؟**

— من پێموایە زیاتر وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەدۆخی تێكۆشاندان لەگەڵ دەسەڵاتگەراییەكی بەردەوامدا. زیاتر هاوڵاتیانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەدیدی سیاسییەوە نائومێدنو بێبڕوان بەرامبەر مەسەلە سیاسییەكانو ناوەندە سیاسییەكان لەموڵاتانەدا نەرمڕەو نین. هەموو ئەم فاكتەرانە دەبێتەمایەی ئەوەی كە بزووتنەوەی یەكئاراستە بەرەو دیموكراسی زۆر سەخت بێت. بەم پێیە ئێمە پێویستمان بەگۆڕانێكی پێبەپێیە.

ئەو شتەی كە ئێمە پێویستمان پێیەتی، ڕەوەندی دەستوەردانی هاووڵاتیانە لەكاروباری سیاسیو ڕێبەرانی كۆمەڵگاش پێویستە هەلومەرجی كێبەركێكان فەراهەم بكەنو جیهانی دەرەوەش دەبێ ئەم ڕەوەندە هان بدەن. بەڵام ئەگەر تۆ تەواوی تواناتان تەرخان بكەیت بۆ فشار خستنەسەر حكومەتێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی، كارێكی مەترسیدارت كردووە. چونكە ئەمكارە دەبێتەمایەی بەرگری ئەو حكومەتەو هەروەها دروستكردنی شەڕی ناوخۆییو ئانارشیزم لەناوخۆی ئەووڵاتەدا. هەندێ لەحكومەتەكان كاتێك لەدەرەوەی وڵاتدا هەست بەفشار دەكەن، فەزای سیاسی ناوخۆشیان سنوردار دەكەن.

*** تۆ گۆڕانی دیموكراسی لەچەرخی بەجیهانیبووندا چلۆن دەبینیت؟ هەندێك لەڕیزیاندا وەك مارك پلاتنر لەوبڕوایەدان كە بەجیهانیبوون زیاتر جەخت لەسەر لیبراڵیزم دەكاتەوە تا لەسەر دیموكراسیو هەمان ئەو مەسەلەیەش هەڕەشە لەهزری دیموكراسی دەكات.**

—دیموكراسی لەچەرخی بەجیهانیبووندا واتا بەدەستهێنانی تاكگەرایی زیاتر. بۆ پێشكەوتنی ڕەوەندی بەجیهانیبوون، تاكەكان دەبێ لەپەراوێزیاندا هەڵبژاردنێكی بەرفراوانتریان لەبارەی چارەنووسی خۆیانەوە هەبێت. مانای ئەم مەسەلەیە ئەوەیە كە تاكەكان لەم ڕەوەندەدا دەسەڵاتێكی زیاتریان هەیە. بەڵام ڕەنگە ئەم دەسەڵاتە بۆ كۆمەڵگا بەزیانبار دابنرێت. ئێمە لەڕۆژئاوا بەرەو دیموكراسییە پۆست تاكەكەسییەكان دەجوڵێین. ئەم مەسەلانە لەبوارەكانی

کلتـورو کۆمەڵایـەتی تایبەتـدا نارەزاییـەکی زیـاتر دروسـت دەکـەن. لەچـەرخی بەجیهانیبوونـدا ئـەم هەستە دێتـەئارا کـە هەنـدێ لـەولاتان خۆشـبەختن و هەنـدێکیتریش بەدبـەخت. خـەڵکی ئـەم ولاتـە بەدبەختانە لـەوەی کـە دەوڵەتـەکانیان خواستەکانی ئـەوان پراکتیزەناکـەن، نائومێـدو نائاسـودەن. لەسـەرئەم بنەمایـە تـۆ لـەم ولاتانـەدا شـایەتحاڵی کاردانەوەی زیاتریت. لەم ولاتانەدا خەڵك بێهیوان لـە حکومـەت و لەحیزبەسیاسـییەکان. هەلومـەرج بـۆ قـەیرانی سیاسـی فەراهەمـە. تـەنها یـەك شـێوازی ئەلتـەرناتیڤ هەیـە کـە دەکرێ ئێمـە لـەم بارودۆخـە رزگار بکات.

***وادێتەبەرچاو کەلەم (15) ساڵەی دوایـدا هـەردوو تیـۆریی تونـدرەویی ئیسـلامی و کۆنفۆشـیوزم زۆرتـرین ئاستەنگی ئایدۆلۆژیان لەگەڵ لیبراڵ دیموکراسیدا هـەبووە. ئـەمرۆش پێشـبینی ناکرێـت کـە هیچـکام لـەم تیۆریانـە ئاسـتەنگێکی جـددی بـۆ سـەرتاپاگیربوونی جیهانیانـەی دیموکراسی دروست بکەن، بەڵام لەهەمانکاتدا هەنوکە ئەو دەسەلاتە ئەوەندە لاواز نەبوون کە لەبنەڕەتـەوە بەهەنـدیان وەرنەگرین. بەڕای تـۆ ئاسـتەنگە بنچینەییەکانی بـەردەم دیموکراسی لەسەدەی (21)دا چ شتگەلێکن؟**

—مـن لەوبڕوایـەدام ئاسـتەنگە بنچـینەییەکانی دیموکراسـی، دەسـتکەوتەکان و سـەرکەوتنە ناوخۆییەکانییـەتی. سـەدەی بیسـتەم، سـەدەی تێکۆشانی دیموکراسی بوو لەگەڵ ئایدۆلۆژییـەکانی تـری وەك کۆمـۆنیزم و فاشـیزم. لـەکۆتایی سـەدەدا، دیموکراسـی بەسـەرکەوتووانە لـەم تێکۆشـانە هاتەدەرەوە.

سـەدەی ئێمـە، سـەدەیەکە کـە تیایـدا دیموکراسی تەنها لیبراڵ جیهانییە کە ڕووتێکردنی جیهانیشـی لەبەرامبەردایـە. ئـەم سـەدەیە، سـەدەی تێکۆشـانی ئـەو دیموکراسـیانەیە کـە دەیانـەوێت خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکەکانیان دابین بکەن، ژمارەی کەسـانی پەراوێزکـەوتوو کـەم بکەنـەوەو ڕێگاگـەلێك بدۆزنەوە کە ڕێبەرانی سیاسی لەلای خەڵك بەرێزتر بـبن. هـەموو ئـەم ئاسـتەنگانە، ئاسـتەنگگەلێکی ناوخۆین. بەڵام من کە گەشت بۆهـەر ولاتێك دەکـەم، داواکـانی خەڵکەکـەی یەکسـانە. ئـەوان بەدەسـت گەندەڵییـەوە دەناڵێنن. ئەوان بەدەست بێکارییەوە رەنـج دەکێشـن. ئـەوان سیسـتەمێکی فێرکردنـی باشیان دەوێت و خوازیـاری مۆدێلێکی دیموکراسین کـە بـارودۆخی ئـەوان بگۆڕێـت. بـەم پێیـە سـەدەی بیسـتەم، سـەدەی تێکۆشـانی ئایـدۆلۆژیاکانی دیموکراسـی بـوو دژبـە دەسـەلاتگەرایی و سـەدەی بیسـتویەکەم سـەدەی تێکۆشـان بـوو لـەپێناو کاراکردنی دیموکرسیدا.

## سەرچاوە

سایتی رۆژنامەی (وقایع اتفاقیه)، شنبه، 11تیر 1383، 1 ژوئیه 2004

# فراس السواح (لە لێدوانێكیدا بۆ ئیلاف)

## هەرچەندە من دژی ئایین نیم، بەڵام هەندێك تەوژمی بیری عیلمانی لەكتێبەكانمدا بۆ ئەو شتانە دەگەڕێن كە لە دوژمنایەتیاندا لەگەڵ ئاییندا پشتگیرییان لێدەكات.

سعود السرحان

لە عەرەبییەوە: سەردەم

ئەگەر سەیری ئەو بابەتانە بكەین كە بیرمەندی سووریایی (فراس السواح) لە كتێبەكانیدا لێیان دەكۆڵێتەوە، كە بریتین لە لێكۆڵینەوەی گەوهەری ئایین و مێژووی ئایینەكان و ئەفسانەو مێژووی كۆن، بۆمان دەردەكەوێت كە ئەم بابەتانە زۆر سەرنجی خوێنەری عەرەب رادەكێشن. ئەمەش هەر لەبەر ئەوە نییە كە ئەو بابەتانەی دەینووسێت سەرنجراكێشن، یان لەبەر ئەوەی كە لێكۆڵینەوەكانی لەئاستێكی زانستی بەرزدان، یان لەبەر ئەوەی كە ئەو بابەتە ئاڵۆزانە بە زمانێكی رەوان و سەرنجڕاكێش پێشكەش دەكات، بەڵكو ئەوەی زۆر خوێنەران رادەكێشێت ئەو گەرم و گوڕییەو ئەو رۆحانییەتە بەرزەیەتی كەوا لەخوێنەر دەكات دووبارە لەو كەش و هەوایەی ئەو بابەتانەدا بژێت كەلێیان دەكۆڵێتەوە (مێژووی ئایینەكان، ئەفسانەكان...) ئەو پێشەكییانەی كە بۆ كتێبەكانی دەنووسێت زۆربەیان هەر لەخۆیاندا دەقی سەربەخۆن.

(السواح) ئەوەش فەرامۆش ناكات كە بەوتەی هەڵبژاردەی گەورە پیاوانی سۆنیستە ئیسلامییەكان، وەكو (النقری)، كۆتایی بەكتێبەكانی بهێنێت .

لێدوان لەبارەی كەم و كورتی ئەو بابەتانەی كە (السواح) لێیان دواوە بەجێدەهێڵم بۆ ئەوانەی كە پسپۆڕن لەو بوارانەدا، بەڵام دەمەوێت باسی دوو لایەن بكەم. یەكێكیان خۆلادانی (نالێم ترسی) لەباسی هیچ ناكۆكیەك لەگەڵ هیچ تەوژمێكی فیكری یان سیاسیدا، تەنانەت خۆلادان لە رەخنەگرتن لەو نووسینانەش كە پەیوەندییان بە بواری پسپۆڕییەكەیشەوە هەیە، (بێجگە لە وەڵامدانەوەی الصلیبی). لەسەرەتای

هەڤپەیڤینەکەدا (السواح) ئەو مەرجەی دانا کە نابێت پرسیار لەبارەی بیروڕای بکەم دەربارەی کاری هیچ نووسەرێکی دیکە. دووەمیشیان ئەتوارە سەیرەکانی کە واتلێدەکات نەتوانیت پێشبینی رەفتارەکانی بکەیت, چونکە هەر چەند کە لەسەرەتادا ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ گفتوگۆ و رێکەوتین لەسەر ئەوەی کە هەر جارەو چەند پرسیارێکی لێبکەم, بەڵام تەنها وەڵامی پرسیارەکانی جاری یەکەممی دایەوەو قایلنەبوو وەڵامی پاشماوەی پرسیارەکان بداتەوە, بەبەهانەی ئەوەی کە گوایە "تووشی بێزاری بووە ." ئەمەش دەقی ئەو هەڤپەیڤینەیە کە لەگەڵیدا ئەنجامم داوە:

*تۆ لەبواری راڤەکردنی ئایین و ئەزموونی ئایین و ئەفسانەو مێژووی کۆندا دەنووسیت, پەیوەندی ئەم سێ پسپۆڕییە پێکەوە چییە؟

-بۆ ئەوەی بەزارەوەیەکی دروستتر قسەبکەین, دەڵێم: من لەبواری "فینۆمینۆلۆجیای ئایین" دەنووسم, واتە لێکۆڵینەوەی ئایین لە گۆشەنیگایەکی جوداوە, واتە هەوڵدان بۆ ناسینی ئایین بێ پشت بەستن بە هەڵوێستێکی پێشینە یان ئایدۆلۆجیایەکی ئامادەوە, بەڵکو لەگەڵ هاوسۆزیمدا بۆ باوەڕی مرۆڤ, ئایین و باوەڕیان هەرچییەك بێت. هەروەها هێرش نەکردنە سەر هیچ باوەڕێك لەبەر خاتری باوەڕێکی دیکە یان لەبەر خاتری عیلمانییەتێکی ئاسۆ تەسك, لە فینۆمینۆلۆجیی ئاییندا هەموو ئایینەکان یەکسانن, هەموو ئایینەکان لەسەر تەکتاییەك رێکدەخرێن نەك لەسەر پلەی پۆلێنکردن لە هەرە خراپەوە بۆ هەرە باش, چونکە لە ئاییندا ئایینێکی زۆر باش و یەکێکی دواکەوتوو و توندڕەو نییە.... چۆن شارستانییەکان لە زمان و هونەر و بیناسازی و دیاردەکانی دیکەی شارستانیدا جیاوازییان هەیە,

بەهەمان شێوەش لەباوەڕو ژیانی ئایینییدا جیاوازییان هەیە. هەموو ئاینێك رێبازێکی تایبەتە, هەموو رێبازەکانیش بەرەو خودا دەڕۆن, لەبەر ئەوەی کۆمەڵی دەربازبوو و کۆمەڵی لەناوچوو لەئارادا نییە. ئەو کۆمەڵەی کە لەناو دەچێت ئەو کۆمەڵەیە کە هەوڵی پاوانکردنی ئەو رێبازە دەدات کە بەرەو خودا دەچێت. کۆمەڵی دەربازبووش ئەو کۆمەڵەیە کە لەو باوەڕەدایە ئەو رێگایەی کە ئەو گرتوویەتییە بەر یەکێك لەو رێگایانەیە کە بەرەو خودا دەچن. بەپێچەوانەوەی نووسەری مێژووی ئایینەکان کە هەوڵی دۆزینەوەی راستیی رووداوەکانی رابردوو دەدات, نووسەر فینۆمینۆلۆجیای ئایین بەدوای مانای ئەو رووداوانەدا دەگەڕێت و بەدوای ئەو دەزووەی کە باوەڕە جیاوازەکان پێکەوە دەبەستێت و بەدوای مانا شاراوەکانی دیارە ئایینییەکاندا دەگەڕێت. بەواتایەکی دیکە: نووسەری فینۆمینۆلۆجیای ئایین جۆرێکی تایبەتی مێژوونووسی ئایینە کە لەهەمان بابەت دەکۆڵێتەوە, بەڵام ئامانجەکانی ئامانجی مێژوونووسی ئایینی تێپەڕ دەکات. ئێستا دێمە سەر ئەو بوارانەی کە لەپرسیارەکەتدا باستکردن. ئەفسانە یەکێکە لەپێکهاتە بنەڕەتییەکانی ئایین و هیچ ئاینێك بەبێ ئەفسانە نییە, واتە حیکایەتی پیرۆز کە بەزمانی هێماو شێوازی گێڕانەوەی ئەدەبی راڤەی باوەڕە ئاڵۆزەکان دەکات. ئەفسانە مامەڵە لەگەڵ لایەنە سۆزی و وروژێنەکانی مرۆڤ دەکات, باوەڕیشی لەگەڵ ئەقڵیدا, باوەڕو ئەفسانە لایەنی تیۆری ئایینی دروستدەکەن و نوێژو سرووتە ئاینییەکان لایەنە کردارییەکە لەگەڵ ئەو دنیا پیرۆزەدا دروستدەکەن کە باوەڕو ئەفسانەکان وێنایان کردوون, مێژووش ئەو زەمینەیەیە کە باوەڕو ئەفسانەی لەسەر بنیاتدەنرێت, لە ئێمە

لەڕێگەی بەڵگە مێژووییەکانەوە نەبێت کە تیشك دەخەنە سەر ئەو بارە فەرهەنگییەی ئەو ئایینەی تێدا دروستبووەو ئەو کاریگەرییە دەرەکیانەی کە بەشداربوون لە دروستبوونیدا , ناتوانین لە هیچ ئایینێك تێبگەین. هیچ ئایینێك لە بۆشاییەوە دروست نابێت و پێویستی بە لێتێگەیشتنی مێژوویی هەیە بۆ ئەوەی پێکهاتەو سەرچاوەو رەگوریشەو داهێنانە تایبەتەکانی بناسن. بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت لە ئایینی بوودی بگەین دەبێت لەو بارودۆخە فەرهەنگییە هیندییە بکۆڵینەوە ئایینی راستەقینەی بوودی دروستکرد, هەروەها بۆ تێگەیشتنی ئایینی هیندۆسی دەبێت لێکۆڵینەوە لەسەر باوەڕی (ڤیدی) پێش ئەو بکەین. بۆ تێگەیشتنی مەسیحیەت دەبێت لێکۆڵینەوە لەسەر کاریگەری تەورات و ئایینی زەردەشت زەردەشتی و ئەفلاٌتوونیەتی نویٚ و باوەڕە نهێنییە هێلێنیستییەکان بکەین. بۆ تێگەیشتنی ئیسلامیش دەبێت تیشك بخەینە سەر کاریگەرییەکانی مەسیحیەت و تەورات و ئایینی زەردەشتی و مانی و بتپەرستی دورگەی عەرەبی. دەبینیت چۆن ئەم سیٚ بوارە زانستییەی کە بایەخی پێدەدەم تێکهەڵکێشی یەکتری دەبن؟

*لەکام لەم بوارانەدا زیاتر کۆشش دەکەیت؟

–کۆششی زۆر لەو کارەدا دەکەم کە ئێستا بەدەستمەوەیە, هەموو کات و بایەخێکی دەدەمیٚ و وا هەستدەکەم کە کارەکانی داهاتووم فراوانکردن و زۆر کردنی بابەتەکانی ئەم کارە دەبێت. پاش تەواوکردنی وا هەستدەکەم کە من و کتێبەکە لەیەکتری جودا بووینەتەوەو بیرۆکەی تازەم بۆ دێت و بەرەو رەوتێکی تازەم دەبات.

*هەرچەند کە ئیسلامییەکان لێت رازی نین, بەلاٌم تۆ ناتەوێت بیٚ باوەڕەکان زەوتت بکەن (وەکو لەگەڵ صادق جلال العظم دا رویدا), تۆ لەگەڵ کام لایەندایت, بیٚ باوەڕەکان, یان ئیسلامییەکان؟

–(فراس سواح) لەگەڵ خۆیدا دەوەستێت. من نە لەگەڵ ئەم کۆمەڵ و ئەو کۆمەڵدام و نەدژی ئەم کۆمەڵ و ئەو کۆمەڵم. من بیرمەندێکی ئازادم و دوورم لە هەموو جۆرە ئایدۆلۆجیایەك, ئایینی بێت یان سیاسی_ئیسلامییەکان (وەکو تۆ ناویان دەنێیت) لیٚم رازی نین چونکە لە کەس رازی نین و لەسەر ئەو بنەمایە دەڕۆن کە دەڵێت: ئەوەی لەگەڵماندا نەبێت, دوژمنمانە. وشەی "رازی نین" کە لەپرسیارەکەتدا بەکارتهێناوە لەجێی خۆیەتی, چونکە رازی نەبوونە کە هێشتا نەبۆتە شەڕێکی ئاشکرا, چونکە دەزانن کە بەرەنگاری بیرێك بوونەتەوە کە باوەڕی بەگفتوگۆیە نەك وروژاندن و وبەرەنگار بوونەوە. من ئامادەم بۆ گفتوگۆو کارەکانم گفتوگۆ ئامێزن و رەخنەی بنیاتنەر دەگرن و هەوڵی لەناوبردنی کەسی بەرامبەر نادەن.. بەلاٌم ئەوان ئامادەنین بۆ گفتوگۆ چونکە باوەڕیان وایە کە راستیی رەها لای ئەوانەو ئەوان ئەو کۆمەڵەن کە دەرباز دەبن. لەبەرامبەریشدا تەوژمی تایبەتی عیلمانیی ئەوتۆ هەن کە لەکتێبەکانمدا بەدوای شتی ئەوتۆدا دەگەڕێن کە هەڵویٚستی دژ بە ئایینەکانیان پتەوتر بکات. من بەڕوون و ئاشکرایی دەڵێم کە من دژی ئایین نیم, من دژی سەلەفیەت و لێکدانەوەی حەرفیم لە تێگەیشتنی ئاییندا, ئایین هێزێکی رزگارکەرو پاڵنەرە ئەگەر لەسەر بنەمایەکی مرۆڤانەی فراوان بێت, بەلاٌم دەبێتە هێزێکی سەرکوتکەر ئەگەر لەدیدگایەکی تەسکی شۆڤێنییەوە سەیری بکرێت.

*لەکتێبی "دین الانسان"دا, باسی مەسەلەی یەکێتی ئەزموونە ئایینیەکانت کردووە, جیاوازیی لەنێوان ئەم بۆچوونەو بۆچوونی فەیلەسووفە

سۆفیستەکان چییە کە باس لەیەکێتی ئایینەکان دەکەن؟

-لەوانەیە مرۆڤی سۆفی بە ئەزموونی خۆیی بگاتە هەستکردن بەیەکێتی ئایینەکان، بەڵام میتۆدی من لەسەر ئەم ئەزموونە بنیاتنەنراوە، بەڵکو لەسەر لێکۆڵینەوەی (هەڵهێنجان_استقرائی) بۆ راستییەکان، ئەنجامەکانیشی لەسەر تێگەیشتنی ئەزموونی ئایینی مرۆڤ لەدرێژایی مێژوویدا دادەمەزرێنێت. بەواتایەکی تر، من نەکاری فەلسەفە دەکەم و نەهەستی کەسیی خۆم دەردەبڕم، بەڵکو لە رووداوی بابەتی دەکۆڵمەوەو هەوڵی راڤەکردنیان دەدەم.

*رایەکی هەژێنەرت هەیە دەربارەی ئایینە کۆنەکان. تۆ دەڵێیت کەم ئایینانە باوەڕیان بەتاکە خودا هەبووە. لای تۆ تاکە خودا پەرستی چی دەگەیەنێت و ئەم ئایینە تاکە خودا پەرستانە چۆن بوون؟

-من نەمووتووە کە ئایینە کۆنەکانی رۆژهەڵاتی کۆن تاکە خودا پەرست بوون، بەڵام لەکتێبی "الاسطورة والمعنی" باسی لایەنگرییەکی ئاشکرای تاکە خودا پەرستیم کردووە لەئایینەکانی رۆژهەڵاتی کۆندا، کە لەسەر ئەو باوەڕە دامەزراوە کە خودایەك هەبووەو ئەو خودایەش چۆن دنیاو هەموو زیندەوەرەکانی دروستکردووە، بەهەمان شێوەش خودای دیکەی دروستکردووە. ئێمە لەم باوەڕەوە یەك هەنگاومان دەمێنێت بەرەو تاك خودا پەرستی کە لەسەر بنەمای باوەڕهێنان بە خودایەك دامەزراوە کەدنیاو هەموو بوونەوەرە زیندووەکان و فریشتەکانی دروستکردووەو بۆ هەر یەکە فرمانێکی داناوە، چۆن خودای باڵای رۆژهەڵاتی کۆن خودای پلە دووی دروستکردبوو و بۆ هەر یەکەیان فرمانێکی دەستنیشانکردبوو. هێڵی جودا کەرەوە لەنێوان تاکە خودا پەرستی و فرەخودایی، بەرای من، هێڵێکی لاوازەو لە تاك خودا پەرستیشدا جۆرێك لە فرەخودایی هەیەو لە فرەخودایشدا جۆرێك لە تاك خودا پەرستی هەیە.

*هەر چەند کە تۆ لەبارەی ئەفسانەو ئایینە کۆنەکانی وڵاتی شام و میسرو هیندو چین شتت نووسیوە، بەڵام هیچت لەبارەی ئەفسانەو ئایینەکانی دورگەی عەرەبی نەنووسیوە. هۆی ئەم فەرامۆشکردنە چییە؟

-هەموو شتێك بەرادەی خۆی. ئەمساڵ وادەی ئەوە هات کە باسی ئاینی عەرەب لەپێش ئیسلامدا بکەم و لەبەشی دووەمی ئینسایکلۆپیدیای مێژووی ئایینەکاندا، کە خۆم سەرپەرشتی دەکەم، شتێکم لەبارەی ئەم بابەتەوە نووسیوە.

*(د. کمال الصلیبی) کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناوی (التوراة جاءت من جزیرة العرب)، تۆش بەکتێبی (الحدث التوراتي و الشرق الادنی القدیم) وەڵامتدایەوە. پاشان (الصلیبی) سێ کتێبی دیکەی بڵاوکردەوە کە پەرە بە بیردۆزەکەی دەدەن و بریتین لە (خفایا التوراة واسرار شعب اسرائیل)، (حروب دولة داود) و (البحث عن یسوع). بۆچی وازتهێنا لە رەخنەگرتن لە تێزەکانی (الصلیبی)و کتێبەکەت یەك کەرەت چاپکرد؟

-من زۆرم لا مەبەست نییە کە چاودێری هەموو نووسینەکانی (کمال الصلیبی) بکەم، شتی گرنگترم هەیە کە هەموو کاتەکەم دەبەن. لاموایە کتێبی (الحدث التوراتي و الشرق الادنی القدیم) ئەو کێشانەی روونکردۆتەوە کە وەڵامی تیۆری (التوراة جاءت من جزیرة العرب) دەداتەوەو بەپێویستی نازانم کە زیاتر لەبارەی ئەم بابەتەوە بنووسم. کتێبەکەشم چوارجار چاپکراوەتەوە، نەك یەك جار، بەمزوانەش چاپی پێنجەم دەکرێتەوە.

*(الصـــليبى) دەڵێــت کــە هــیچ ڕەخنەیــەکی بەرچــاو نەکــەوتووە (لــەو شــتانەی کــە لێکۆڵــەرە عەرەبــەکان نووســیویانە, بێگومــان) کــە ئاراســتەی بیردۆزەکەی کرابێت. لەم بارەیەوە چی دەڵێیت؟

—لەبارەی ئەو قسەیەی (الصلیبی) کە دەڵێت هــیچ ڕەخنەیــەکی بەرچــاو نەکــەوتووە لــەدنیای عەرەبەوە ئاراستەی کتێبەکەی کرابێت هیچ ناڵێم ئــەوە نــەبێت کــە مــن لــە کتێبەکەمــدا پــەیڕەوی هەڵوێســتی زانســتی و ڕێزگــرتن لــە دۆســتایەتیی ئەکادیمیم کردووەو نامەوێت هەڵوێستی تایبەتی وەربگرم. من ڕێز لە هەوڵەکانی (الصلیبی) دەگرم, هــەر چــەند کــە جیــاوازیم لەگەڵیــدا هەیــە. لاموایــە ئەویش هەمان هەڵوێستی هەیە. گۆڕەپانی تۆژینەوە لەئاستی ڕۆشنبیری عەرەبیدا بەتاڵەو بەهەزار (کمال الصلیبی) و (فراس السواح) پڕ نابێتەوە. هەموومان دەبێت لەم هەوڵەدا بەشداربین.

## سەرچاوە

ئیلاف 17 یونیو 2004

# لەگەڵ "سەید عەلی ساڵحی"دا

## شاعیری بەر تریفە

**دیمانەی ئەمین هۆشەنگ ئیفتیخاری راد**

**لە فارسییەوە: فەرەیدون بێوار**

ئەو شاعیرەی کە هەر لە منداڵییەوە شەیدای خوێندن و خوێندنەوە بووە، شەوان تاکو درەنگانێ نەدەخەوت و باوکی چرای ڕووناکی لێ خامۆش دەکرد، ئەوسا دەچووە بەر تریفەی مانگ و لەبەر ڕۆشنایی تریفەدا دەیخوێندەوە، ئەوەندە لەبەر تریفەی مانگدا نووسیو خوێندییەوە تاکو ڕووناکی چاوی راستی بەمانگ بەخشی.

(سەید عەلی ساڵحی) شاعیری نوێکارو نوێخوازو داهێنەری هاوچەرخی ئێرانی، فارسی نوس و بەڕەچەڵەك کورد: ساڵی _1334_ش لەدایك بووە. ساڵحی یەکێکە لە دامەزرێنەرانی رێبازی (شیعری ناب) کە لەو قوتابخانەیەدا پشکی زۆری بەرکەوتووە. نزیکەی سی ساڵێکە لەبواری ئەدەبیات (شیعر، ڕۆمان، لێکۆڵینەوە، کۆمەڵناسی کورد) کاردەکات و شێوازو رێبازێکی تایبەت بەخۆی هەیە. پانزە ساڵ لەمەوبەر و لەناوەڕاستی هەشتاکاندا تەکانێکی دیکەی بە شیعری فارسی داو شێوازێکی نوێی داهێنا، ئەویش وتارە شیعربوو، خۆی وتەنی:

شیعری زمان. ئەگەرچی ئەم شێوازە نوسینە لە ئەدەبیاتی جیهاندا شتێکی نوێ نییەو لە مێژینەیە، بەڵام لەسەر ئاستی ئەدەبیاتی ئێراندا ساڵحی ئەستێرەیەکی درەوشاوەیەو جێگە پەنجەی دیارە. شیعرەکانی ساڵحی بۆ سەر چەندان زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراون و لە چەندان وڵاتانی جیهاندا کۆڕی شیعر خوێندنەوەی سازداوە، و لە کۆنفرانسی (جیهانی شیعر) لە کەنەدا بەشداری کردووە، و لەتەمەنی (19) نۆزدە ساڵیدا خەڵاتی (فروغی) لە شیعردا وەرگرتووە. ئەوەی لە شیعرەکانی ساڵحیدا دەبینرێ جوانی و پاکی و ڕەوانی و سادەیی و ئازادی ڕادەربڕین و خۆشەویستی ژیانە بە هەموو ئێش و کۆسپ و تەگەرەکانییەوە. زمانێکی ڕەوان و پاراوی هەیە لە شیعرداو زیاد حەز لە تەمومژاوی و بارگرانی فۆڕم

و رووالـەتی ناكـات. خـۆی وتـەنی: "زمـان ئـامرازە نەوەك مەبەست" هەروەها شاعیرێكی ماندونەناسی كـوردە و هەمیشــە بـۆ ناسـاندن و خســتنە رووی ئەدەبیاتی كوردی لە هیچ هـەوڵ و كۆششێ درێغی نەكردووە "خۆشەویستی من بۆ ئەدەبیاتی كوردی هەمان خۆشەویستیە بۆ ئەدەبیاتی پارسی" بیست ساڵێك لەمەوبەر لەڕێگەی (بەڕۆژ ئاكرەیی و ناسر سینا) وە ئەدەبیاتی كوردی ناسیوەو لە قەڵەمڕەوی شـیعری كوردیشـدا توانایـەكی باشـی هەیـەو بـە ســەرنجەوە قۆنــاغ و ڕێبــازو شــێوازە ئەدەبیــە كوردییـەكانی (گـۆران و فایـەق بێكـەس و هـەژار و هــێمن)ی خوێندۆتــەوە. شــێركۆ بێكــەس بــە ئیمپراتـۆری شـیعر نـاو دەبات و جوڵـەی دێرەكـانی ڕەفیـق سـابیریش بـە سوریالیسـتی سەركێشـانەی ڕۆژهــەلاتی لــە جــۆری خــۆی دەزانــێ. "شــیعرو ئـەدەبیاتی كـوردی چـرای درەوشـاوەی جیهانـە، بۆچی خۆمان بەكەم بزانین" خۆی وتەنی: لە ڕێگەی شیعرو عەشقەوە بـەرگری لـە گەلەكـەی دەكـات و " مرۆڤ یەكەمین و دووایین قەبیلـەی منە. ڕەگـەزی من مرۆڤـەو جیهـانیش بـۆ مـن كـوردەو كـوردیش بۆ مـن جیهانە. گەلی كورد، نەتەوەی منەو بنەمای پـارس و پارسیەكانە" لە كۆڕوكۆبوونەوەكانیدا هەردەم ناوی شـیرینی كـوردی لەسـەر زارە. تـاكو ئێسـتا نزیكـەی (137) كتێبی هەمەجۆری لە بوارە جیاجیاكاندا بە چاپ گەیاندووە، كە زێترینیان پەندو حیكایەتە كۆن و ئەفسانەكانن" لەگەڵ حەكایەتی هەزارو یەك شەوو سروودەكانی زەردەشت. نـاوی هەندێك لـە بەرهەمـە شیعرییەكانی بریتین لە: "مثلث ها و اشراقها/ نامـە هـا (ئـەم كتێبـە كراوەتـەوە بـە كـوردی)/ نشـانی هـا/ سادەبودم، تونبودی، باران بود/ لیالی لا/ پیشـگوو و پیـادەی شـطرنج/ از نخسـتین نامـەها / عاشـق شـدن دردی مـاە، مـردن بـەوقت شـهریور/ نامــەهای بـی نشانی دیگر/ دیر امدی ری را/ اسمانی ها/ اخـرین عاشقانە های ری را/ دریغا ملا عمر/ چیدن محبوبـە هـای شـب. وە هـەروەها ڕۆمـانی (مـرگ پلـنگ) لـە ئێراندا كـراوە بـە فیلم. ئـەم گفتوگۆیـەی بەردەسـتان ڕوونكردنــەوەو تیشــك و تێڕوانینــەكانی ســاڵحییە ســەبارەت بـە شـیعرو زمـان و وتـارە شـیعرو قۆنـاغی تەوژمە شیعرییەكان لە ئێراندا.

(وەرگێر)

• نیما دەڵێت (لـە هـیچ جێیـەكی دنیـادا بەرهەمـە هونەرییــەكان و هەســتە شــاراوەو دابــین كراوەكــان نــــەگۆڕاون مەگــــەر دوابـــــەدوای گــــۆڕانی ژیانـــــە كۆمەڵایەتیەكان، هەندێ لەمەڕ بۆچوونی نیما پێیـان وایـە كـە گۆڕانكارییـەكان و ڕووداوە هونەرییـەكان، گۆڕانی كۆمەڵایـەتی بـەدواداێ، بە سـەرنجدان لـەو گۆڕانكاریانەی كە لەم دوو دەی دواییدا لە جیهـان و ئێرانــدا ڕوویانــداوە (بــەدوور لــەوەی كــە ئــەم گۆڕانكارییانـە درۆن، یـان نـا) بۆچـوونی بـەڕێزتان سەبارەت بە شیعرو كۆمەڵ چییە؟

—لە درێژەی ڕێگەی مێژوو ژیان و بونی مـرۆڤ، كـەم نـەبوون ئـەو كەسـانەی كـە لـە پێنـاو پەیڤـە جوانـەكان و بـڕوا بـێ هـاودژە ڕەهاكانـدا، گیـانی خۆیـان كـردە دەسـت مایـە. مـرۆڤ هـەر لەسـەر ئـەم پەیڤـە ڕەقانـەو تەنانـەت ئـەم بـاوەڕە گوماناوییانـە، چـەندین جـەنگی بـەرپا كـردووەو كاولكـاری هێنایـە كایـە. فەیلەسـوفەكان هەوڵیانـداوە جیهـان بگـۆڕن و شاعیرانیش پێیان وایە كە دەتوانن بە شیعرەكانیان ژیان بگۆڕن. نیچە مژدەی دەركـەوتنی مرۆڤـی بـالای (*Superman*) ڕاگەیانـد، بــەلام هیتلــەر پێــی نایــە گۆڕەپانـەوە، مـاركس لـە دادپـەروەری دووا، بـەلام سـتالینی بـەدوا دا هـات. لـەم جیهانـەدا نـە ڕوداوێ بــەناوی "ڕاســت" حەقیقــەتی هەیــەو نــە بــاوەڕێ

بەناوی "درۆ" تەنیا خودی "حەقیقەت"ە کەوا حەقیقەتی هەیە. لە ڕاستیدا خودی حەقیقەت چییە؟ لە ژیاندا قسە گەلەکی جوانم بیستووە کە لەزاتی خۆیا لابەری فکری گەنەڵ بووە. منیش بەم مەبەستەو لە دوو ڕوانگەوە دەڕوانمە بۆچونەکەی بەڕێزتان: هەم نیمای بەڕێز هەڵەی کردووەو هەم بەرهەڵستکارانی ئەم تیورە:

هونەر بەدیهێنەری گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتییە. نە ئەمەو نە پێچەوانەی ئەمە! هونەر ناتوانێ ژیان و کۆمەڵ بگۆڕێت, بەتایبەتی شیعر, باوەڕ بەوەها فتواگەلی داچڵەکێنەر, وەکو نەزانی وایە. مرۆڤ هەر لە ئەزەلەوە تا دەگا بە ئەبەد پێویستی بە هەبوونی هونەر هەیە, بەلاّم ئەم بابەتەش بەو مانایە نییە کە بڵێین شیعر توانای ڕاپەڕین یا کودەتاو یاخود پەرجوی هەیە. پەیوەندی نێوان شیعر و کۆمەڵ پەیوەندییەکی دیالێکتیکی و ڕێژەییە, هەڵسوکەوتی هاوسەنگیان هەیە, هەر بەو شێوەیەی کە خەڵکی هەر کۆمەڵگایەك بە تێپەڕبوونی کات وەکو حاکمەکانی هەمان ئەو کۆمەڵگایەیان لێدەردەچێت, شیعریش هێدی هێدی لەگەڵ کۆمەڵدا دەچێتە نێو سەودای واتاییەوە, بەلاّم لە پلەی وەرچەرخانی بینراودا وەکو "چارەسەر" کاردەکات چارەسەرکەرە نەوەك یاخیبوو.

هاتووچۆی هاوتەریبی شیعروژیان, دەبێتە هۆی کامڵبوونی هەردووکیان, لێك جیاناکرێنەوە, کاریگەری ئەمیان بەسەر ئەوەکەی تریانەوە, بەتەواوی یەکسان و هاوسەنگ و بەرامبەرە. ژیان..... شیعر دەخوازێ و شیعریش_ژیان, نە نەهەنگ لە کانیدا گەورە دەبێ و نە هەڵۆ لە قەفەزدا. لە کۆمەڵگەی داخراوو بێ هیواو بیر تەسکدا, نابێ چاوەڕێی شیعری مەزن و بەهادارو تەوژمی و هیوابەخش بین, ئەگەر جگە لەمە بێت, ئەوە شاعیرەکەمان درۆ دەکات, وەها شاعیرێ لە مینبەری قەزاوەتەوە ووتار دەخوێنێت و ئیدی شاعیر نییە, بە پێچەوانەشەوە شیعری مەزنیش نەوەی کۆمەڵگەی مەزنە. ئەو کە بانگەشە بۆ هیوای درۆیینە دەکات لە راستیدا قوڵی بۆ کوشتنی هیواکان هەڵماڵیوە. بە پێچەوانەشەوە ئەگەر شاعیرێ, لە هەل و مەرجی هیوادا, تەنیا پەنا بۆ سۆزی لالانەوە ببات, بە دڵنیاییەوە دەبێ خۆی پیشانی دکتۆری (دەروونناسی) بدات. شاعیر ئاوێنەی کۆمەڵەو کۆمەڵیش ئاوێنەی شیعرە, هەردوو پێکەوە تەواوکەری یەکترن, نە قسەی نیماو نە بانگەشەی بەرهەڵستکارانی ئەم تیورە, هەر ئەمە!

• لەم رۆژگارەدا چەندان بۆچوون سەبارەت بە سڕینەوەی مرۆڤ لە شیعرداو بزاوتن بەرەو "پیشەگەری شیعر" قۆناغی ئاوێتەکردنی باسەکان و بەزمانی بوون خراوەتە ڕوو ئایا (ئەم سەدەیە) دەتوانێ ڕۆژگاری شیعرو لەبەرچاوگرتنی مافەکانی مرۆڤ بێت.

–لە ڕاستیدا مانای بە زمانی بوونی زمان واتای چییە؟ ئەوەیە کە سەردەمی مەدلولەکان لە زماندا بەسەر چووەو نۆرەی دالەکانە: دەسکەوتی فەوتانی عەقڵە. دال بەبێ مەدلول و مەدلولیش بەبێ دال جۆرێك ڕووت بونەوەیە لە زستانی سیبریدا کە هەواڵی بەستنی زەینی زمان ڕادەگەیەنێت. ئێمە پەیمانمان لەگەڵ شتەکانی جیهان و مرۆڤدا بەستووە, پەیمانی ناسین. دال کاغەزو دەقی پەیماننامەیەو مەدلولیش واژۆی ئێمەیە, ئەم حەکایەتەی (سڕینەوەی مرۆڤ) لە شیعردا, وەکو سڕینەوەی شیعرە لە روح و ویژدان و ژیانی مرۆڤدا, کەواتە بۆچی ناوی شیعر لە پەیڤەکانی خۆت

دەنێیتو پاشان گازندە دەکەی کە بۆچی ئەم مرۆڤە لە شیعری من ناگاتو پەیوەندی لەگەڵ نابەستێت و من وەکو شاعیر بە فەرمی ناناسێت؟

هەڵبەت هونەرکاری لەگەڵ خوڵقێنەرەکان، توانایی دەوێ، ئەگەر لیاقەتی ئەوەت نییە، زەحمەتی خەڵکانی تر کەمکەرەوە، هەرچەندە هونەرکاری کردن لەگەڵ خوڵقێنەرەکان گاڵتەکردنە بە هەست و نەستی کۆمەڵگە. شیعری ئاستیکماتی ئەم دامــاوە زمانکوتانەش تەنها بە ژمارەی چاویلکەی خۆیان شیاوی بینینە. ئەم بەڕێزانە ڕێگەیان ناکەوێتە بەر خەو مرۆییەکان. دەڵێن: بەسەرەکی دانانی گوێگر واتا دواکەوتوویی، کەواتا من لێرەدا دەپرسم: بۆچی بە تیراژی زۆر کتێبی شیعریتان چاپ دەکەن؟ بۆچی بەدوای گوێگردا دەگەڕێن؟ ئەگەر باوەڕتان بە مرۆڤی گوێگر نییە، تاوانباریشی مەکەن بەوەی کە تێناگات. تێدەگات، لە "حافز" دەگات، بەڵکو تەنها لە تۆ تێناگات! سەبارەت بە کۆتایی پرسیارەکەشتان دەڵێم: شیعرو ئەو شیعرە مەزنە ئینسانییە هەرگیز بەم بەلا باهاوردانە نافەوتێت. نە چوار دیکتاتۆر بەسەر هەسارەی زەوییەوە مافەکانی مرۆڤ ڕیشەکێش دەکەن، نە دیکتاتۆرە سەرشێتەکان لە قەڵەمڕەوی پەیڤ و شیعردا، دەتوانن مرۆڤ و شیعر بەگشتی قەڵاچۆکەن. ئاییندەی خەڵك و کۆمەڵگەی ئێمە زۆر جێی هیوایە، ئەمەش هیوایەکی واقیعییەو دیسانەوە ڕۆژگاری ئێمە دەبێتەوە بە ڕۆژگاری شیعرو ئازادی. نابێ نیگەرانی ئەم گاڵتە نەفامیانە بین لە شیعردا، لەکاتی لەدایکبوونی منداڵ کە سیمبولی ئەڤین و پاکییە، لفەکەشی کە سەردەمانێك توێشوو بەرەی خواردنی بووە، ئەویش دێتە دنیاوە، ئەم لفەیە، برینی هەڵکەندراوی ناو ڕەحمە کە دەیخەنە نێو زبڵدانەوە، ئەم لە شیعر چووە ورێنە ئاسایانەش هەمان ئەو لفە ئالودەیە کە لەگەڵ لەدایکبوونیدا، دەمرێت. من لەدایکبوونی ئەم پەیڤە گۆ نەکراوانە بەرز دەنرخێنم چونکە هەواڵی دەرکەوتنی "مرۆڤی نوێ" دەدات لە شیعردا.

• بەڕێزتان لەو کۆمەڵە شاعیرانەن کە تێڕوانینێکی نوێتان هەبوو لەسەر شیعرەکانی (40–50)ی رابردوو ڕێچکەیەکی ترتان بۆ شیعری هاوچەرخ هەڵبژارد. دەمەوێ بزانم چ هۆکارێك یان فاکتەرگەلێك هەبوون کە بەڕێزتان گۆڕانتان لە شیعردا بە پێویست زانی، بەواتایەکی تر لە جیهانبینی شیعری رابردوودا چ گیروگرفتێکتان بینی کە وەڵامدەرەوەی ڕۆژگاری هاوچەرخ نەبوو. لەراستیدا بنەما فکرییە پێشنیارەکانی بەڕێزتان چی بوو؟ بۆچی بزوتنەوەی شیعری پەتی بەڕێزتانی ڕازی نەکردو لێی دوورکەوتیتەوە؟

—لە کۆمەڵ و ڕۆژگارێ کە تەنانەت سیاقی سانسۆریش گۆڕانی بەسەرداڕدێت و شێوەیەکی سەیرتر بەخۆوە دەگرێ، چاوەڕێ دەکەی (قوربانی سانسۆر) شیعر نەگۆڕێت، بەهاکانی زمان و جینی وشەکان گۆڕانی بەسەردا نەیێت؟ ئەگەر منیش بزافی (وتارە شیعر)م نەخستبایە ڕوو کە مەحموود دەرویش بە (چۆنییەتی کۆتایی زمان) ناوی دەبات دڵنیابن شاعیرێکی تر پێی دەنایە ئەم گۆڕەپانەوە. من لەناو گیان و زارو بیرو ویژدان و زمانی خەڵکیدا بەدوای شیعرمدا دەگەڕێم، گەڕانی بینراو! کۆمەڵگە بەشێوەیەکی ناخود ئاگا ئەم ئەرکەی بەمن سپارد و لە بەرامبەردا، وتارە شیعریش لە کۆمەڵگەی پەیڤی و شیعردا گۆڕانی بەدیهێنا ئەوەندە بەسە کە نزیکەی 80٪ شیعرەکانی دەیەی حەفتا لەگەڵ شیعرەکانی دەیەی چل و پەنجاکاندا بەراورد بکەین، بەدڵنیاییەوە دەپرسی کامیان شیعرە؟ هەردووکیان، شیعری هەردوو قۆناغ بەلام

هەریەکەیان لەدایکبووی سەردەمی خۆیەتی کەوا هاتووەو کاریگەریشی بەسەر سەردەمەکەیەوە جێهێشتووە. ئێمە لە قۆناغی کلاسیکیدا (فەرهەنگی پارتیزانی لە دەیەکانی رابردوودا) بە سەردەمی نوێی فەرهەنگی ئاشتی و لێبووردەیی و تێگەیشتنی بێ چەکدارانەی ئازادی گەیشتوون. ئاساییە کە مرۆڤی هاوچەرخی ئێرانی قۆناغی تەوتەم و ئەفسانە و زمانی تاکڕەوی و کڕنوش لە بەرامبەر گلگامیشە سیاسی و تەنانەت کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی تێپەڕاندووە, ئیتر توانای قبوڵ کردنی زمانی قورس و نووسەرانەو دەرباری و ئەکادیمی و تایبەتی چینە هەڵبژاردەکانی نییە. زمان حەزی لە روون بوونەوەیە, واتە یەکەمین ئاماژەی دژی سانسۆر. ئێمە قۆناغی خوازە پەرستیان لە گۆڕەپانی مێژوو بەدەرناوە, خوازە پەرستی جۆرێك بەهای شیعری نییە, لەراستیدا سادەکردنی کاری سانسۆرە. ئەمڕۆکە ئەم زمانە شێواوەش جۆرێك خوازراوی مۆدێرنە کە جێی ڕەزامەندی خۆشحاڵی فەرمانگەکانی سانسۆرە . چی لەمە باشترە کە هەروەك ریلکە دەڵێت: بەرازیش لە زمانی تۆ نەگات! ... دان بەوەدا دەنێم کە من بە ئەنقەست لە شیعری قورس و لەوانەش شەپۆلی پەتی دانەبڕاوم کە بە وتارە شیعر بگەم. لە ناوەڕاستی دەیەی شەستەکاندا لەناکاو تێگەیشتم کە ئەمە شیعرە بەکردار خودی کۆمەڵ و گیانی گۆڕیوەو منیش بەم جۆرە دەهۆنێتەوە , پاش گەیشتن بەم زمانی تێگەیەنەرە ناوم لێناو تاکو ئەمڕۆکەش درێژەم بە بەیان کردنی بنەمای تیۆری ئەم کارە داوە, هەموو ئەم ئاماژە پێویستانە, بە زوویی لە کتێبێکدا بەناوی (شیعر لەهەر بارودۆخێکدا) بڵاودەکرێنەوە, کە بریتییە لە هەوڵەکانی من لەبارەی بزوتنەوەی وتارە شیعر.

شیعری شەپۆلی پەتی و هەموو ژیانی شیعرو زمانی زاڵ لەدەیەی چل و پەنجاکاندا لە پاش دەروازەی (22/ بهمن 1357–ش)بە چۆك داهات, خەڵکی لەو پەیامە کۆنەیە دابڕان, ئەم راکێشانەش بەناوی منەوە دەرچوو کە جێگرێکی باش و بێ سنووری بۆ دەست نیشان بکەم. لە سەرەتاکانی دەیەی حەفتادا لەگەڵ پێشوازی کردنی رەخنەگران و خەڵکی لەم شێوازە (حافز)انە, تێگەیشتم کە رێگا هەر ئەوەیە: وتارە شیعر, چۆنیەتی کۆتایی زمان! وتم زمانی شیعر مرد, ئەمڕۆکە رۆژگاری شیعری زمانە کە شیعری زمانیش سەرچاوەی وتارە شیعرە.

• هەرچەند ئەم پرسیارە دووبارەکردنەوەی دووبارەکانە, بەڵام چونکە باوەڕم وایە ئێمە لە قۆناغێکداین کە زۆربەی چەمکەکان پێویستیان بە پێناسەکردنی نوێ هەیە, رێگەم بدە لەم رووەوە ئەم پرسیارەتان ئاراستە بکەم! ئایا بەڕێزتان پێتان وایە کە ئیتر پەیامی شیعر (هونەر)کۆتایی هاتووە؟ ئایا هونەری پەیام کۆتایی هاتووە؟ و ئامانج لە هونەری ماڵ تەکێنراو چییە؟

–"پەیام"و "پەیامی شیعر" ناونیشان و ئاماژەی لەم جۆرانە, زۆر گشتییە. شیعر لە سنووری زاتی خۆیا, پەیام نییە, بەڵکو پانتاییەکە کە پەیام بەیەکێك لە وەتەرەکانی دەژمێردرێت. نە(ئارمانی شاعیر)انەمان هەیەو نە (شیعری ئارمانی). کۆتایی ئەم جۆرە باوەڕانە, یان بەرەو سۆفیگەری (ئارمانی شاعیر)انەمان دەبات و یاخود بەرەو وتەکەی (سیاوش کسرایی): "شیعری ئارمانی". هەردووکیان کۆتایی بێسنووریان نییە. شیعری سەروو ئایدۆلۆژی, شیعرەو بۆ مرۆڤەو لەراستیدا سەرەتا بۆ خودی شاعیرە. لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ رۆژنامەیەك وتم: من هەرگیز بۆ

هیچ کەسێك شیعرم نەوتووە, چ بگات بەخەڵکی, تەنها بۆ خۆمم وتووە. پاشان گازندەی دۆستانی بەئەزموون و بەساڵاچوو: ئەمە چ قسەیەکە؟ تۆ بۆچی؟ ئەوان مەبەستی منیان نەپێکا. شیعر هەرچەندە خودی تر بێت, خەڵکی تر, و جاویدانی ترو کاریگەرترە. من خۆیشم تاکێکم لە خەڵکی, هەر ئەمەش بەسە کە خەڵکی پێشوازی لە شیعرەکانم دەکەن. ئیدی دروشم بۆچی؟ بەڵام... پەیام (بەواتای مرۆیی ئەوەی کە ڕێگا بەرەو خواستنی ئازادی‌و دادپەروەری دەبات) بەدڵنیاییەوە وەزیفەیە, بەڵام شیعر وەزیفە نییە ڕێکەوتە.

• کافکا دەڵێ: "شیعر شتێك نییە جگە لە گەشتێك بەدوای حەقیقەتدا" کۆمەڵێ لە ڕەخنەگرانی ڕۆژئاوایی و بەدوای ئەواندا هەندێ لە ئێرانییەکانیش پێیان وایە کە ئیتر حەقیقەتێك هەبوونی نییەو گەڕان بەدوایدا کارێکی بێهودەیە. کۆمەڵێکیش لەبری حەقیقەت باس لە جوانی دەکەن, بە بۆچوونی بەڕێزتان ئایا هێشتاکە لە نێوان شیعرو حەقیقەتدا, بوون, حەماسەو مرۆڤدا پێوەندییەك هەیە؟

–درێژەی هەمان باسە: کۆمەڵێك شتی گشتی کە بەبەردەوامی دەگۆڕێن. حەماسە کامەیە: مێرولەیەك بۆ گەیاندنی نێچیرەکەی بە ماڵەوە کوڵ نادات؟ حەماسە چییە؟ دایك‌و باوکێك کە سێ شیفت کار دەکەن تاکو ئاهی منداڵە گچکەکەیان نەبیستن؟ ووتم کە: حەقیقەت, ئەو واتا سرك‌و هەزار ڕوخسارە, چ شێوازێکی هەیە؟ بن لادن لە پێناو پەیڕەوکردنی حەقیقەتدا هەزاران مرۆڤی سیڤیلی لەکارەساتێکدا بە کوشتندا, یازدە (11)ی ئەیلول حەقیقەتە, بوشیش خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین لەسەر حەقیقەت لەناو دەبات. کەواتە ئەم حەقیقەتە نەفرەت لێکراوە چی لێمان دەوێ؟ حەقیقەت واژەیەکی ئینسکلۆپیدیای ئەخلاقیاتە. بوون واتا یاسا, مرۆڤ واتە پەرجوو, و شیعریش شتێك نییە جگە لە بۆنی شیفا. من چۆن دەتوانم ئەم هەموو هەسارەیە لەمشتی خۆمدا جێ بکەمەوە؟

• ئایا هێشتا کە شیعر وەکو هونەری میللی ئێرانییەکان لە ئارادایەو دەتوانێ ڕۆڵی هەژموونی هونەری هەڵگرتبێ یان شیعر لە هونەرەکانی دیکەدا تواوەتەوەو بەرجەستە بووە, لەوانە "سینەما".

–زێدەڕۆییەکی شاعیرانەیە کە شیعر هونەری میللی ئێرانییەکانە. کتێبێکی شیعری کە پێنج سەددانەی لێ چاپ دەکرێ و تەنانەت خودی شاعیرەکانیش نایکڕن, لە کوێ هونەری میللییە, شاهنامەو مثنوی‌و معنوی– یش چیتر کڕیاریان نییە, باوەڕ بکەن –حافز– ڕەمزو ڕازێکی تری هەیە: شیعری حافز گرێ کەرەوەی خەڵکی داماوی نێو خەونەکانە. ئەوەی کە جارجارە لە تەلەفزیۆنەکانیش بە شیعرێك قەناعەت دەکەن, لەبێ پرۆگرامییە, چەندان پرۆژەی بێ نرخ بە شیعر کۆتایی دێن, شیعر هەرگیز هونەری میللی ئێمە نەبووەو نییە, بەڵێ, لە سەردەمانی ڕابردوودا, هونەر زاڵ بووە, بەڵام لە ڕۆژگارانی ڕابردوودا جگە لە دەرباریان و کەمینەی تایبەت, مەگەر کەسێ خوێندەواری خوێندنەوەو نوسینی هەبووە کە شەوو ڕۆژی خۆی لەگەڵ شیعرا.....؟ وادەزانم ستەمدیدەبوون هونەری میللی ئێمە بووە. لەگەڵ ئەوەشدا شیعر لای ئێمە ئازیزو خۆشەویستە, بەدڵنیاییەوە لە هونەرەکانی دیکەشدا ئاستەم نابێ, بەڵکو هەڵدەستێ بەیارمەتیدانیان, وەکو ڕۆڵی شیعر لە سینەمادا..... کە لەیەکەی وشەوە دەگاتە یەکەی وێنەو ڕوناکی‌و ڕەنگ و جووڵەو وەهەستی دیوار.

• لە یەکێك لە ووتار خوێندنەوەکانتدا ووتت: شیعری ئەمڕۆ پێویستی بە وشەی "بێ چینە" هەیە. تکایە سەبارەت بە وشەی "بێ چینە" لە شیعردا زێتر بدوێن.

—ئاماژەکەم بۆ کرداری نەمری و بێ سنووری (شیعری زمان) بووە. واتە چنینەوەی شیعر لە زماندا لەوپەڕی ئازادی, و نەوەك چنینەوەی زمان لەبەرخاتری شیعر. ئێمە شیعر بەسەر زماندا ناسەپێنین، بەڵکو دەرفەت بە زمان دەدەین تاکو شیعری خۆی بێنێتە دنیاوە. لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی "زمانی شیعر"دا شاعیران بۆ ووشەکان ناسنامەی عاتیفی‌و چینایەتیان بۆ دەردەکرد, بۆ نمونە ئەم وشەیان شاعیرانەیەو ئەوی تریان ناشاعیرانەیە. ئەم دۆزینەوە گەورەیە چەندە نەفامانە بووە. دەڵێی شاعیران دەلالانی ڕانی وشەکانن لە ئاخوڕی زماندا, قەڵەوەکانیان جیاکردۆتەوەو لاوازەکانیان بەجێ دەهێڵن. ئەم کارە بلیمەت ئاسایە جۆرێ قەسابی شاعیرانە بوو لەبەرامبەردا: واتە بە رەتاندنی زمانی تاکرەوی و باوەڕمەندی بە کۆمەڵگەی چینایەتی وشەکان سەردەمی ئێمە گەیشت, سەرگەردانەی زەریادا, خاوەن شوێنگەیەکی مێژوویی‌و زەمەنییە, کە سەردەمی ژیانەکەی (لەرووی بەکاربردنی کۆمەڵایەتییەوە) کۆتایی دێ. هەر شاعیرەو لە هەر قۆناغێکدا وەکو دۆزەرەوەی یەکێك لەم دورگە زمانیانە حوکمڕانی هەست و ئارەزووەکانی هزری خۆی بووە, بەلام ئەم دوورگانەش وەکو شارستانیەکان مەحکوم بە فەوتان بوون و هێدی هێدی خالّی بوونە دانیشتوانی "گوێگر". ئەو دوورگانەی کە لە دەیەی چل و پەنجاکاندا لە دەستی شاملوو ئەخواندا بوو, تەمەنیان بەسەرچوو, لەراستیدا توانا تایبەتەکانی زمانیان تێربوو. مەبەستی منیش لەم زمانی تاکرەوییە هەمان ئەو تێر بوونەیە. چونکە تێر بوون تایبەتمەندی روحی تاکرەوییە. ئەم گەورە پیاوانەی ئێمەش لەسەردەمی خۆیاندا بەدۆزینەوەی ئەو دورگانەی کە هەر بەناوی خۆیشیانەوە ناونران, زۆر کەسیان لە زریانی تەنیایی و بەلای نەزانی بەکەناری رزگاری‌و کەناری دورگەکانیان گەیاندووەو رزگاریان کردن. بەلام هەر دورگەو توانایەکی سنورداری هەیە. لەبەرامبەر ئەم هەرێمە سەرگەردانانەشدا, وتارە شیعر لەبنەڕەتدا دورگە نییە, بەڵکو زەریای زمانە کە هەرگیز تێرنابێ, (خاتم الانسان)ە زەریا بەردەوام خەریکی نوێ کردنەوەی خۆیەتی .

• سنووری تواناو پانتایی زمان تاکوێیە؟

—هەر ئەو زەریا زمانییەی کە باسم کرد. توانایی هەموو کاتی‌و نەمری هەیە, بە بەردەوامی لە ئەزمونی شۆڕشە لە شۆڕشدا.

هەرچەندە وەکو شاملو دەڵێ: وەچەبازی و قۆناغبەندییە باوەکان لە شیعرو هونەردا ناگاتە هیچ کامێك, بەلام پێویستە بپرسین ئایا رۆژی "شیعری زمان" و زمانی ئازادی, ووتمان وشە بوونەوەرێکی زیندووە, بەلام دەوڵەمەندو هەژاری نییە. شاعیر ئەگەر شاعیر بێ, وەها ژیان‌و گیان و سەربەرزییەك دەبەخشێتە وشەکان کە پێویست بە گەڕانی شەکەت ناکات بەدوای وشە پیرۆزەکاندا. لە بنەڕەتدا گەڕان و تەقەلاکردن, کردەیەکی عەقلانی‌و ئیدراکییەو خود ئاگایە کە ئامادەبوونی لەساتی داهێناندا, وەکو ژەهری هەلاهێل وایە سەرەتا خودی شاعیرەکە دەکوژێ‌و پاشانیش شیعرەکە.

• زمانی شیعریتان بەزمانی مەزن, و نووسین و ئارائیك پێناسەکردووەو ئەوەی کە "زمانی شیعر" دەبێتە کۆنکرێتی وشەکان و ئەمەش هەمان زمانی

تاکڕەوییە. لەبەرامبەر ئەمەشدا "شیعری زمان" (کە جوانترو شایستە تر دێتە بەرچاو لە وتارە شیعردا) و دیموکراسیو هونەریتان بەکاربردووە. نیماو شاملوو ئەوانی تریشی بە نۆرەی خۆیان بۆ رەهایی لە کۆت و بەندی شیعری رابردوو یان، شیعرێکی تریان خستەڕوو. بۆیە جێی ئەم پرسیارە دەمێنێتەوە کە ئەم زمانەی تاکڕەوی و دیموکراسی زمان چ پێناسەیەکیان هەیە ئایا لە هەموو سەردەمێکدا زمان بەرەو تاکڕەوی پاڵ پێوە دەنرێ دەبێ لێی دەرباز بین.

—زمان وەکو زەریایەک وایە، خاوەنی چەندان دورگەی جیاوازی وەکو بەرگەکان و تواناییە مەرجدارەکانە، دۆزینەوەو هەڵبژاردن و دیاریکردنی نیشتمانی هەریەک لەم دورگانە، ئاست و سنورو ژیان و هەلو مەرجی تایبەت بەخۆی هەیە. لەڕاستیدا سوود وەرگرتنە لە هەریەک لەم نیشتمانە.

• بڕوات بە وێکچوونی نێوان شیعری ئەم یەک — دوو دەیەی دوایی و دەیەکانی رابردوو هەیە یاخود نە؟

—تەنیا بوونی زمانی پارسی "زمانی فارسی" وێکچوونی هاوبەشی نێوان شیعری ئەم سەردەمەیە لەگەڵ سەردەمەکانی رابردوو. مەودای نێوان ئێمە لەگەڵ دەیەکانی رابردوو، هەمان مەودای شیعری نیمایە لەگەڵ شیعری کلاسیکیدا.

• بە بۆچوونی بەڕێزتان شیعر دەرچوونە لەزمانی بێوەری یان چوونە ناویەتی؟

—هیچ کامیان! پیشەگەرانی شۆخ مەشرەبەکانی سەروی مۆدێرن، پێیان وایە شیعر واتە دەرچوونە لە زمان. رۆمانتیکە کاڵخوڕە ئاسودەکان لە فرە بێژیدا پێیان وایە شیعر واتە چوونە بۆ نێو زمان. لە کاتێکدا شیعر واتە لەدایکبوونی زمان.

• بە بۆچوونی بەڕێزتان باری رەخنەی ئەدەبی و توێژینەوەی ئەدەبی لەکاتی هەنووکەییدا چۆنە؟

—دوو پرسیار لەیەک پرسیاردا، کاری وەلامدەرەوە تووشی گرفت دەکات، دەرفەت بدەن گوتاری توێژینەوە بۆ خەڵکانی ئەو بوارە بەجێبهێڵم، بەلام بابەتی رەخنە لە کۆمەڵگەی هونەرو هزردا، بەتایبەتی لە چوارچێوەی شیعری ئێمەدا، زۆر خەماوی و خاوو بێ کاریگەرییە. لە کۆمەڵگە رۆژهەلاتییەکاندا (کە خاوەن پێکهاتەیەکی فەرهەنگین وەکو کۆمەڵگەو مێژووی ئێمە) هێشتا رەخنەی زانستی نەبۆتە نەریتێکی کاریگەر. لە رۆژئاوادا لە رەخنەوە بە هونەرو داهێنان دەگەن. بەلام لە دنیای رۆژهەلاتی ئێمەدا، رەخنە لەدایکبووی هونەرە. ئەوان کە پێ بەپێ لەسەر بنەمای دەستورات و رەخنەو بۆچوونی رۆژئاواییەکان، لەشیعر دەکۆڵنەوە. لەو رازە ئاشکرایە بێ ئاگا ماوون رۆژئاوا واتە لۆژیک و رۆژهەلاتیش واتە حیکمەت. رەنگە وەلام بدرێتەوە کە ئەمڕۆکە لە گوندی جیهانیدا هیچ سنوورێک نییە. من دەڵێم بە پێچەوانەوە سنورەکان تۆخترو پڕرەنگترو دیارتر بوونە. جەنگ نیشانەی ئەم هێڵانەو جیاکردنەوە رۆشنانەیە. ئەو بێ شەرەفانە ناویشیان لێناوە جەنگە خاچیەکان. ئەمە چ گوندێکە کوێخاکانی لە زمان و دیالۆگ و ئاشتی و لێبووردەیی ناگەن و بەزۆرو زۆرداری سەرەنێزە دەیانەوێ میللەتی ئەفغانستان رەوانەی بەهەشت بکەن و بەزۆرو زۆرداری بۆمباران، دیموکراسیان لەعیراقدا بەزاند.

• تکایە چەند نمونەیەک بهێننەوە بۆ بابەتەکانی "وێنەی ڕووت" و ئاشکرای سوننەتیو وێنەی

ناوەکیو وورد چنراو کە بەبڕوای بەڕێزتان تەنیا لەبەر ڕۆشنایی ناسینی جیهاندا "ڕۆشنایی زمان" دێتە دی.

–قۆناغی وێنە دەرەکیەکان بەسەرچووە، ئەگەر وێنە لە شیعرا لەڕێگەی پیشەگەری سینەماو کۆمپیوتەرەوە شایانی دروست کردنەوەی راستەوخۆ بێ، من ئەمە بەوێنەی دەرەکی و کۆنەساڵ ناودەبەم، لەرابردوودا کە پیشەی ئاشکراو کاریگەری بینراوو بیستراو وجودی نەبوو، چیرۆکبێژی و ڕۆڵی وێنەی دەرەکی بەئەستۆی شاعیران بوو، وەکو وێنەکانی دەرەکیو تەنانەت دیکۆپاژ بووەکانی "شاهنامە" یان "پێچینەی نظامی" بەڵام ئەمڕۆکە وێنە لەشیعردا دەبێ بکرێتە نهێنیو ناوەکی، بەجۆرێ کە پیشەسازی و تەکنەلۆژیای بینراو توانای دووبارە دروست کردنەوەی نەبێت بۆ سەر پەردەی بینراو، و ئەم دۆزینەوەیە بەدەست نایەت، مەگەر بەپەرجووی گوتار. نمونە دێنمەوە:

"جۆرێ بەتەنیشت ژیانا تێدەپەڕم/ نە ئەژنۆی مامزی بێ هاوڕێ بلەرزێ، و نە ئەم دڵە بێ دینەی کە تاسەر نامێنێ..." هەر لەم دێڕە شیعرەدا بەڕێزتان لەگەڵ وێنەیەکی ناوەکی و هەستیدا روبەرو دەبنەوە، بەڵام ناتوانرێ ئەم وێنەیە بە سانایی لەڕێگەی سینەماوە لەسەر پەردە بگێڕدرێتەوەو ببینرێت، رەنگە بەشێوازێکی زۆر دورو ناراستەوخۆ بکرێ بەهۆی شێوەکاری سوریالیزم، نیگاری بکێشرێ کە لەم وێنە ناوەکیەوە نزیک بێ، بەڵام دروست وەکو خۆی مەحاڵە گەیشتن بە وێنەی ناوەکی جگە لە شیعری زماندا، نایەتە دی. دروستکەرو ناسێنەری وێنەی ناوەکیش هەر ئەم وتارە شیعر بووە کە پازدە ساڵ لەمەوبەر خستمەڕوو.

• شاعیر چۆن دەست دەکات بەگەڕان بەدوای بینراوەکانی شیعر لە زماندا؟

–پێویست بەگەڕان و هەوڵ و تەقەلاَ ناکات. ئێمە لە زەریایەك لە بینراوەکان هەناسە دەدەین. تێگەیشتن و جیهانبینی و بڕوای ئەم بابەتە کارێکی چۆنیەتییە کە گەیشتن پێی پێویستی بە پەڕینەوەیە لە گەردەنەکانی مەرگ و ژیان. حیکایەتێك نییە کە بتوانرێ لەبەرامبەر زانکۆی تاراندا بیکڕیت و ئیتر تەواو!

## سەرچاوە

–مجلە/ جامعە نو/ شمارە: 8/ سال: 1381.

–ئەم دیمانەیە لەڕۆژی 1381/5/12 سازدراوە.

–رستەی ناو کەوانەکان کە لە پێشەکیەکەدا هاتووە، قسەی خودیساڵحییە لە سەرچاوەیەکی تر وەرگیراوە.

# سێ پارچە شیعری لۆركا

گارسیا لۆركا
لە ئیسپانییەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ

### سۆنێتە

ئەترسم, ئەم شتە سەیرو پاكەم لێ ونبێ
ئەم شتە بەفرینە,
كەوا لەنێو بێدەنگی چاو تەڕو نمدارەكانتایە,
ئەمشەو ئەترسم:
چونكێ هەناسەی گوڵە چاوترووكاوەكەت
بەر دەموچاوی من ناكەوێ و هەستی پێناكەم.

ئەترسم,
كەوا لە لێوارو كەنارێكی پەنهاندا
لق و پۆپی مردووم, كەڵەكە بێ و هەڵچنرێ
نامەوێ بۆ هەر كوێیەك بڕۆم
ئەو بەرو بوومە لە كۆڵ نێم,
لەو جێیەی كە كرمی ئێش و ئازاران
خۆیان مەڵاسداوە..

ئەگەر تۆ گەنجینەی نادیاری منت
لەگەڵ خۆتدا بردووە

ئەگەر تۆ ئازارێكیت و
دەرهەق بە من,
هیچ میهرو بەزەییەكت نییە...
ئەگەر من خۆشم بەهای شتێكم
شتێكی ئەوتۆم تیا نەبێ...
ئیدی كەسێك بانگهێشت مەكە
دووا گوڵە گەنمی من بدوورێتەوە,
دەبا ئیتر ڕێڕەوی ڕووباری تۆ
بەو گەڵا ووشكەڵاتوانە داپۆشرێ
كە پاییزی بەسەرچووی تەمەنم
ئەیهاوێژێتە ئەوێ...!

### هونەر داوا لە ئەوینەكەی ئەكات دەربارەی بنووسێ

ئەوین وەكو مردن, وەكو بەهار بێ بڕیارە
بێهوودە چاوەڕوانی وەڵامێ, چارەیەكم
بێگومانم كە لەم چركە ساتەدا
گوڵیش وەری,

چیدیکە ناتوانم بژیم...
لەکاتێکدا, کە جێتهێشتووم لەنێو خۆتا ..!

ئەمرو هەتا هەتا, هەوایە
تاشەبەردی پتەویش سست و داهێزراوە
کە نە سێبەر ناسئەکات و
نە پەناش ئەوەستێ لێی..
دەبا مانگیش ئاونگی شەختەیی خۆی
ڕۆ بکاتە سەر سنەوبەر و دار سەرووەکان
لێ چیدیکە دڵی من نایخوازێ..

ئەزانم کە ئازارم داویت و ئێشم پێگەیاندووی
لە چرکەساتێکیشدا,
بەخوێنی خۆم
بەژن و باڵاکەتم ئاوڕشێن کردووە,
من شادەماری خوێنی خۆم
ڕشتۆتە نێو شەڕو پێکدادانی
کۆترە کێویلە و پڵنگەکانەوە..
نێوانی مارو گوڵەکانەوە.

لێگەڕێ با وڕێنەی کێویلەی من
لێوان لێو بێت بە وشە
یان لێگەڕێ با,
لەو شەوەدا بژیم,
کە شەوی ڕۆحی منەو
شەوی خەونە نامۆکانە....!

## لادێ

بەسەر هەنیەی
ڕووت و قووتی چیایەکەوە
پەناو خەڵوەتگایەکی چکۆلانە هەبوو..
لق و پۆپی دار زەیتوونەکان,
سەدانساڵەو هێشتاکە
خۆیان داهێشتۆتەو شۆڕبوونەتەوە
بەسەر ڕووبارو چەمی مرواریيدا...
پیاوە عەبا لەبەرەکانیش
پەیدا پەیدا لێکدی جوێدەبنەوە...
با نیشاندەرەکەی سەر تۆپکی بورجەکەش
شەو بێ یا ڕۆژ بێ,
پەیتا پەیتاو بێ هەرادان,
هەر ئەخولێتەوە...
ئاخ!
ئەی لادێ بزر بووەکەی نێو ئەندەلووسی
چاو بەگریاوی من"
تۆ لەکوێی...!

## سەرچاوە

لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە:

*www. Abc-calitratura_garica lorca.es*

# گەشتی نووسەرێك

ئێرنست جەی. گەینز
لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

لە سەردەمێکی زووتر لە ئێستادا ئەو کاتەی کە لێیان پرسیم ئاخۆ من چۆن چۆنی دەستم بە نووسین کرد، وەڵامەکەم ئەوە بوو کە من لە ساڵی (1949)داو لە کتێبخانەی (ئەندرو کارنیگی) و لە (ڤالیجۆ)، کالیفۆرنیا دەستم کرد بە نووسین. بەڵام لەم چەند ساڵە کەمەی دواییدا، هەستم کرد کە پیشەی من وەکو نووسەر چەند ساڵێك بەر لەو بەروارە دەستی پێکردووە. تا تەمەنی پازدە ساڵی من لە مەزرایەکی قامیشی شەکر و لە (لویزیانا—ی باشوور) گەورە بووم. زۆربەی هەرە زۆری کەسە پیرەکانی ئەو ناوچەیە و بە تایبەتی سەر ئەو مەزرایە بۆ یەك ڕۆژ چییە نەچووبوونە قوتابخانە — پورم کە منی بەخێو کرد بوو پێی وتم کە دەبێ من ئەو نامانە بۆ پیرەژن و پیرەمێردەکان بنووسم کە خۆیان مەبەستیانەو ناتوانن بینوسن، ئەو کاتەشی کە نامەیان بۆ دێت من بیانخوێنمەوە. نامە نووسین ئەرکێك بوو کە من چاوەڕێی نەبووم و خۆشیم لێ نەدەهات، چونکە پیرەژن و پیرەمێردەکان هەر لە دوای "سەلام و کەلام.. چاك و چۆنی؟ شتێکی دیکەیان نەبوو کە بیڵێن، هەر لە دوای وتنی "من باشم و هیوادارم تۆش باش بیت" دەوەستان و ئیدی تەواو خامۆش دەبوون، ئیدی لەوە بەدوا دەبوو بە ئەرکی من کە ئەو نامانەیان بۆ تەواو بکەم" ئەویش لە ڕێی پرسیارکردنەوە، پاشانیش من هەر خۆم هەندێك سەرنج و تێبینیم دەخستنە سەر. ئەوان هەمیشە حەزیان دەکرد کە لەسەر هەردوو دیوی کاغەزەکە بنووسم، بەڵام هەریەك لەوان بایی ئەوەندە ڕاز و نیازی لەلا نەبوو کە نیو لاپەڕەی پێ پڕ بکەمەوە. کەواتە گەر من حەزم لە چوونە دەرەوە بکردایە بەو نیازەی کە هەتا زووە فریای بلیاردو یاری بێسبۆل بکەوم و لە هاوڕێکانم دوا نەکەوم دەبوو بیر بکەمەوە چی لەو نامانەدا بنووسم، خێراو ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو، هەڵبەت هەر واشم دەکرد. لەو نامانەدا هەموو شتێکم دەنووسی سەبارەت بە ئاووهەوا، سەبارەت بە جۆرەها سەوزەی چاندراوی ناو باخچەکانی پشتەوە، یان هەر شتێکی کەم و چکۆلە کە جێی بایەخ بووبێت بەڵام خێرا و دەست و برد ئەوەندەی پێم کرابێ،

تاوەکو بتوانم ئازادبم و لەگەڵ براکەی دیکەم و هاوڕێکانی دیکەم سەرگەرمی گەمە و زرمەزلێ بم، ئەوان لەو ئەرکە بە دوور خرابوونەوە و کەسیان داوای ئەوەی لێ نەدەکرا نامە بنووسێت. لە بری نووسینی نامە پیرەژن و پیرەمێردەکان هەر جارە و پێنج سێنت، چەند دانە کێك و شیریان پێدەبەخشیم. ئەو کاتەی من لەسەر زەوییەکە دادەنیشتم، نزیك بە کورسییەکەی ئەوان، نەمدەزانی کە من بەو نامە نووسینانە خۆم ڕادێنم کە ببمە نووسەر و ئەم دۆخەی تیا بووم جۆرێك بوو لە مەشق. لەو کاتەدا تەمەنی من لە نێوان دوانزە و چواردە دا بوو، هەر بە قەد ئەوانی دیکە خوێندەوار بووم کە لەسەر مەزراکە دەژیان، ئەوە گەر مامۆستای قوتابخانەکەی لێ دەربکەین کە لە هەموو کەسانی ئەو ناوچەیە خوێندەوار تر بوو.

لەساڵی (1948)داو لە تەمەنی پانزدە ساڵیدا بووم کە چوومە کالیفۆرنیا. دایکم لەسەر یەکێك لە کێڵگەکانی سەربازگەیەك کارێکی دەستکەوت، باوکە پیارەکەم لەسەر یەکێك لە کەشتی گەلی بازرگانی دامەزرا، هەر ئەوسا لە قوتابخانەیەکدا ناوم نووسرا.

بەڵام وەك هەر کوڕیژگەیەکی تەمەن پانزدە یان شازدە ساڵی، حەزم دەکرد دوای هاتنە دەرەوە لە قوتابخانە لەگەڵ هاوڕێکانمدا کات بەسەر ببەم. گەر سەرگەرمی گەمەی فتبۆلێن نەبووینایە، ئەوە لێرەولەوێ لەسەر جادەکان دەسووڕاینەوە، تا ئەو کاتەی باوەپیارەکەم لە یەکێك لە گەشتەکانی سەر کەشتی گەلی بازرگانی دەگەڕایەوە و پێی دەوتم کە وا چاکترە لە وەختی دەست بە تاڵی من خەریکی شتێکی بە سوودتر بم.

من سێ ڕێگام لە بەردەمدا بوو کە ئەوانیش: سینەما، سەنتەری لاوان، یان کتێبخانە بوو. من پارەیەکی ئەوتۆم پێنەبوو، هەر بۆیە چوونە سینەما بە من نەدەکرا. کەواتە لە نێوان کتێبخانەو سەنتەری گەنجان دەبوو یەکێکیان هەڵبژێرم. هەڵبەتە من چووم بۆ سەنتەرەکە چونکە هەرگیز لەمەوبەر شوێنێکی لەو بابەتەم نەدیبوو. خۆ تا ئەو کاتە نەچوو بوومە ناو کتێبخانەیەك، بەڵام سەنتەرەکەم پێ خۆشتر بوو. گۆڕەپانێکی تیا بوو بۆ یاری –تۆپی سەبەتە– جگە لە مەلەوانگە و ژوورێك بۆ کەمکردنەوەی کێش، لە پاڵ هۆڵێکی سەما کە پیانۆیەکیشی تیا بوو. من نەمدەزانی چۆن چۆنی گەمەی تۆپی سەبەتە بکەم، نەمدەتوانی مەلە بکەم، نەمدەزانی بلیارد چۆنە و نەشمدەتوانی پیانۆ بژەنم. بەڵام بەو ناوەدا دەسووڕامەوە و سەیری ئەو کەسانەم دەکرد کە سەرگەرمی ئەو گەمە و شتانە بوون.

ڕۆژێکیان یەکێکیان لێی پرسیم ئاخۆ حەز لەوە دەکەم دەستکێشی بۆکس وەشاندن لە دەست بکەم. من لەمەوبەر یەك دوو جاران ئەو دەستکێشانەم تاقی کردبۆوە، بەڵام هیچ شتێکم سەبارەت بە یاری –بۆکسێن– نەدەزانی. ئەو ڕۆژە هیچ شتێکی دیکە نەبوو خۆمی پێوە سەرگەرم بکەم، منیش دەمویست کە لەو سەنتەرە قبوڵ بکرێم، هەر بۆیە دەستکێشەکانم کردە دەست و چوومە ناو بازنەو مەیدانی بۆکسێنەکە. پاشان دوایی زانیم قاندڕەکەی بەرامبەرم بۆکس وەشێنێکی کارامە و لێزان و ناسراوە. بەڵام کەس ئەوەی پێ نەوتم – من هەر خۆم لە گێمی دووەمەوە هەستم پێکرد. لە نێوان گێمی یەکەم و ناوەڕاستی گێمی دووەم، قاندڕکەم توانی لە هەموو ئازای جەستەم بسرەوێنێ، بۆکسی ئەم بەر هەموو ئەو شوێنانە کەوت کە لە ڕووی یاسای گەمەوە ڕەوا بوو. هەر بۆیە لە نیوەی دووەمی گێمی دووەمەوە

ئیدی من پشتی خۆم دەخستە بەر مشتەکۆڵەکانی و زوو زوو بەسەر گوریسەکاندا دەکەوتم و دەنووشتامەوە، تەواو.. کەوتمە فڕێدانی دەستکێشەکانم، وام لێهات بە ددان لەسەر گەمەکە بەردەوامبم، کەچی هەر هەموو ئەوانەی دەوریان گرتبووین قاقا پێدەکەنین. بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم یان دوو ڕۆژ دواتر بوو کە ڕووم کردە کتێبخانە.

ئەوەیان یەکەمجارم بوو کە لە هەموو ژیانمدا بچمە کتێبخانە، چونکە ئەو کتێبخانەی کە لە ماڵی ئێمەوە نزیك بوو لە (لویزیانا) بە تەنها بۆ پێست سپییەکان تەرخان بوو. من تا ئێستاش یەکەم ڕۆژم لە یادە کە چووم بۆ کتێبخانەی (کارنیگی) لە (ڤالیجۆ) — کالیفۆرنیا. دەبوو ژمارەیەك پێبلیکەی مەڕ مەڕ سەرکەوم، لە ڕێی دەرگایەکی دوو دەرییەوە کە دەمیبردەوە ڕاڕەوێك، لەوێوە دەگەیشتم هۆڵە سەرەکییەکەی کتێبخانە. لەو دیو مێزێکی درێژەوە دوو سێ ئافرەتم بینی، کۆمەڵە کەسێکی دیکە لەسەر چەند مێزێکی دیکە گۆڤار و ڕۆژنامەیان دەخوێندەوە. ئەو خەڵکانە سەر بە ڕەگەز و تەمەنی جیاواز بوون، هەر بۆیە هەستم کرد بۆ منیش ڕەوایە لە ناو ئەو خەڵکەدابم. لە کۆمەڵێك گۆڤاری بەسەریەکدیدا کەڵەکە کراو نزیك بوومەوە، هەر ئاواهی و ڕەمەکیانە گۆڤارێکم هەڵگرتەوە، لەسەر کورسیەك دانیشتم. هیچ کەسێك ئاگای لە من نەبوو. بەڵام من لە هەموو شتێکی دەوروبەری خۆم ورد دەبوومەوە. من پتر لەسەر گۆڤارە کراوەکەوە لەو خەڵك و شتانە ورد دەبوومەوە و کەمتر بابەتەکانم دەخوێندەوە. بۆ ماوەی چەند ڕۆژێکی دواتریش دەبێ من هەمان شتم کردبێ، یەکێك لەو ڕۆژنامە یان گۆڤارە کەڵەکە کراوەکانم هەڵگرتووە، لەسەر کورسی و مێزێك دانیشتووم و ئەوەندەی کە لە دەوروبەری خۆم ورد بوومەتەوە، نیو ئەوەندە شتم نەخوێندۆتەوە.

من سەیرم دەکرد کە هەندێك لەو خەڵکانە کە کتێبخانەکەیان بە جێدەهێشت کۆمەڵێك کتێبیان دەخستە بن باڵیان و دەچوونەوە. ڕۆژێکیان بە دڵێکی ئازاوە لە یەکێك لە ژنەکانم پرسی کە لەودیو مێزەکەوە سەیری دەکردم: ئاخۆ قەرز کردنی چەند کتێبێك و بردنەوەیان بۆ ماڵەوە چ ڕێوڕەسمێکی دەوێت. ئەو ژنە فۆرمێکی دامێ و ڕێنمایی کردم کە داوا لە دایك و باوکم بکەم بۆمی پڕ بکەنەوە" ئەوسا من دەتوانم ببمە خاوەنی کارتی بەشداربوون. هەر لەو سەروبەندەی کە من بووم بە خاوەنی کارتی کتێبخانە، زانیم کە چەند پێبلیکەیەکی دیکە سەرکەوم دەگەمە نهۆمی دووەم. ئەوەش کاتێکی زۆرتری لە من ویست تا ئەوەندە ئازا بم و بوێرم بچمە نهۆمی سەرەوە، ئەوەش وەك گەشتێك وا بوو کە ڕووە و وڵاتێکی دیکە و بیانیی بمبات. وای لەو هەموو ڕەفە زۆرەی کتێبان، ڕەفە لە دوای ڕەفە، پڕاوپڕ لە کتێب" ئەوەندە زۆر کە لە هەموو ژیانمدا مەزەندەم نەدەکرد لە یەك شوێندا ئەو هەموو کتێبە هەبێت. هەر ڕاڕەوێك چۆڵ بووایە من بە دەم وردبوونەوە لە کتێبەکان پیایدا پیاسەی خۆم تەواو دەکرد، لە ناوونیشانەکان ورد دەبوومەوە، لە ناوی نووسەرەکان، بەڵام بێئەوەی یەك دانە کتێب لە یەکێك لەو ڕەفانە دابگرم. من دەزانم کە لەو ڕۆژەدا لە ناوەڕۆکی کتێبێکم نەڕوانی، بۆ چەندین ڕۆژی دواتریش هەروا بووم بەر لەوەی بوێرم کتێبێك قەرز بکەم و بیبەمە ماڵەوە. بەڵام گەر من کتێبێکم بردبێتە ماڵەوە یان هەر لە کتێبخانەکەدا خوێندبێتمەوە، من دەرکم بەوە کرد کە هەندێك ناوونیشانی تایبەت سەرنجم ڕادەکێشێ و هەڵیاندەبژێرم بێئەوەی بە ڕاستی بزانم بۆچی ئەو

کتێبانەم مەبەستە. گەر ناوونیشانی کتێبێک وشەگەلی وەک (ڕێگا)، یان (ئاو) و (درەخت) و (خاک) و (کێڵگە) و (وڵات) و یاخود (مەزراو باخ و بێستان)ی لەسەر بووایە" ئەوە من بە شێنەیی ئەو جۆرە کتێبەم لەسەر ڕەفەکە دادەگرت. دواتر من تێگەیشتم کە من بێ هۆ نەبووە کە ئەو ناوونیشانانەم هەڵبژاردووە، بەڵکو دیارە کە من بۆ شتێک گەڕاوم پەیوەندی بە پاشخان و مێژووی خۆمەوە هەبووە" بەوەی کە من خەڵکی باشوورم و لادێیم. لە ماوەی پانزدە ساڵ و نیوی قۆناغی یەکەمی تەمەنم، من لەسەر مەزرایەکی قامیشی شەکر دەژیام، لەو کێڵگانەدا و هەر لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە من ڕەنجم کێشابوو. هەر لەو تەمەنەدا بووم کە سەرگەرمی ڕاوە ماسی بووم لە گوێ چەم و جۆگەلە و ڕووبارەکاندا، تەمەنم لە یانزدە ساڵ تێپەڕی نەکردبوو کە دەبوو بە مشارێکەوە بچمە ناو مەزراکە و قامیشەکان ببڕمەوە. کەواتە هەرکاتێک لەسەر بەرگی کتێبێکدا وشەگەلی وەک (درەخت)، یان (زەوی)، (خاک) یان (ئاو)م ببینیایە، دەستبەجێ خۆشی و ئارەزوویەک لە دڵی مندا جۆشی دەسەند.

بەڵام زۆربەی ئەو کتێبانە منیان دووچاری چەشنێک لە نائومێدی کرد. گەرچی باسی خاک و زەوی و ئاوو ئەو خەڵکانەی کە لەسەر ئەو خاک و ئاوە دەژیان، بەڵام باسی ئەو خەڵکانەیان نەدەکرد کە من لە باشوور دەمناسین و بەجێم هێشتبوون — پلکم کە منی بەخێو کردبوو، ئەو پیرەژن و پیرەمێردانەی دەهاتنە لای ئەم و من نامەکانم بۆ دەنووسین. ئەو کتێبانە باسی براکان و مامەکانی منیان نەدەکرد" هیچیان نەدەوت سەبارەت بە هاوڕێکانم کە من لە تەک ئەواندا گەمەی فتبۆڵێن و بلیاردم دەکرد. ئەو کتێبانە لە خەڵکی دیکە دەدوان، من خۆم تیا نەدەدۆزییەوە.

لە ساڵی (1949)دا دایکم کوڕێکی دیکەی بوو — میکائیل. لەو هاوینەدا، ئەرکی سەرشانی من بوو کە ئاگام لە —میکائیل— بێ و چاودێری بکەم، بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە دایکم دەچوو بۆ ئیش. وام بیر لێکردەوە کە ڕەنگە ئەوەیان هەڵێک بێ بۆ ئەوەی ڕۆمانێک بنووسم. نووسینی ڕۆمان ناکرێ ئەوەندە قورس بێت" سەیری ئەو هەموو کتێبانە کە لەو کتێبخانەیەدا هەن. گرفتی سەرەکیم ئەوە بوو کە وا بکەم (میکائیل) کڕوهێمن بێت و لێم تێک نەداو سەرم لێنەشێوێنێ ئەو کاتانەی کە دەنووسم. ئیدی بێ هێمنبوونەوەی میکائیل هیچم بۆ نەدەکرا، هەردووکمان لەسەر زەوییەکە ڕادەکشاین" وەک ئەوەی کە هەردووکمان بەیەکەوە ئەو کارە جێبەجێ بکەین، ئەو کاتانەی کە لە دەفتەرێکی تێبینییەکاندا سەرنجەکانی خۆم دەنووسییەوە، دەستەکەی دیکەم لەسەر چاوی میکائیل بوو، بەڵام بە نەرم و نیانی. ئەو کاتەی لەوە وەڕس دەبوو، دواجار ملکەچ و بێ دەستەڵات، هەوڵی دەدا هەستێتەوە بەڵام ناچار ملی دەداو خەوی لێ دەکەوت.

کە ڕەشنووسی کتێبەکەم تەواو کرد، چوومە لای دایکەو پێم وت کە ئەگەر بکرێ چاپکەرێکم بۆ پەیدا بکات، سەبارەت بە ئامێری چاپ و چاپکردن هیچم نەدەزانی، هەر لە هەمان کاتدا دەرکم بەوە کرد کە من لە مەڕ هونەری ڕۆمان نووسینەوە هیچ شتێک نازانم. لە بەرامبەر چاپکەرەکە دادەنیشتم و بەیەک پەنجە لە دوگمەکانم دەدا، لە هەمان کاتیشدا دەستێکم دەخستە سەرچاوەکانی میکائیل تا خەوی لێدەکەوت.

لەبەرئەوەی کتێبەکان لەسەر کاغەزی نیو فولسکابی چاپ دەکران (نیو لاپەڕەی خورشیدی)،

بڕیارمدا کە کاغەزە خورشیدییەکان بکەم بە دوو لەتەوە. لەبەرئەوەی لەسەر هەردوو دیوی پەڕەیەك نووسینەکان چاپ دەکران، منیش هەروام کرد. لەبەرئەوەی تەنها یەك بۆشایی –سپەیس– لە نێو وشەکاندا هەبوو، منیش هەر ئاواهی چاپم کردن. من دەمویست کارەکە بۆ چاپکەرانی چاپخانە ئاسانتر بکەم.

من توانیم لە دەوروبەری بەهاری یان هاوینی ساڵی (1950)دا ڕۆمانەکەم تەواو بکەم. لە مووبەقەکە هەندێك کاغەزی بۆرم بینی کە بە کەڵکی ئەوە دەهات دەستنووسەکەمی تێوە وەرپێچم، لە ناو چەکمەجەکەدا هەندێك تەل و دەزووم دۆزییەوە، دەستنووسەکەم ڕێك و پێك پێچایەوە و ناردم بۆ نیو یۆرك. مانگێك یان تۆزێك دواتر بوو کە دەستنووسەکەم بۆ گەڕایەوە کە لەتە کاغەزێکی بەسەرەوە بوو، ڕوون و ئاشکرا، کاغەزی ڕەتکردنەوەی ڕۆمانەکەم بوو.. نووسرابوو:

"ببورە.. بەڵام ئێمەت لە یاد نەچێت."

دەستنووسەکەم بردە دەرێ و لەناو تەنەکەی زبڵەکە ئاگرم تێبەردا. ئەمەیان کۆتایی یەکەمین هەوڵی من بوو لە بواری نووسیندا – چونکە من بە تەواوی ئەرکی زۆری قوتابخانەم فەرامۆش کردبوو تا وای لێهات چەندین ساڵ دوا بکەوم.

دوای ئەوەی قۆناغی ئامادەییم بڕی و دوو ساڵ لە پەیمانگایەك خوێندم، ناوی خۆم نووسی تا بچمە ناو سوپا و خزمەتی سەربازیم تەواو بکەم. هەر دوا بە دوای ئەوە توانیم لە (سان فرانسیسکۆ) بخوێنم و بابەتی کۆرسەکەشم (نووسین و ئەدەبی ئەمریکی) بوو. دواتر توانیم کورسییەکی خوێندنم لە زانکۆی (ستانفۆرد) دەست بکەوێت. چ لە (سان فرانسیسکۆ) و چ لە (ستانفۆرد) مامۆستای زۆر باش و بلیمەتم هەبوو کە هەمیشە هانیان دەدام لە مەڕ ئەو شتانە بنووسم کە دەیانزانم و پێیان ئاشنام – سەبارەت بە –لویزیانا– بنووسم: ئەو شوێنەی کە من لێوەی هاتبووم، ژیانی ئەو کەسانەشی کە لەوێدا دەژیان. پێیان وتم کە سەبارەت بە پوورم و ئەو پیرەژن و پیرەمێردانە بنووسم کە نەیاندەتوانی هیچ بخوێننەوە و بنووسن، سەبارەت بە براکەم و هاوڕێکانم کە چۆن دەژیاین و چۆن چۆنی یاریمان دەکرد. ئەوان دەستنیشانی ئەو کتێبانەیان دەکرد کە دەبوو من بیانخوێنمەوە، ئەوان بۆیان ڕوون دەکردمەوە کە چۆن چۆنی نووسەرەکانی دیکە توانیویانە ئەزموونی زۆری خۆیان بخەنە دوتوێی کتێبەکانیانەوە.

بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەسەر نووسین بەردەوام بووم و توانیم کۆمەڵێك کارو پیشەی جیا بگۆڕم و پێی بژیم، هەڵبەت زۆربەشیان خزمەتگوزاری و هیچ بوون، ئیدی دوای ئەوە بوو کە من یەکەم کتێبی خۆم لە ژێر ناوی (کاثرن کارمیە) بلاوکردەوە. سێ ساڵی دیکەی ویست تاوەکو خەڵکی ئاوڕ لە بەرهەمێکی دیکەم بدەنەوە و پەسەندی بکەن کە لە ژێر ناوی (سەبارەت بە خۆشەویستی و خۆڵەمێش) نووسیبووم و لە ساڵی (1967)دا بلاو بووەوە. لەوساوە زۆربەی کتێبەکانی خۆم بینی کە وەردەگێڕدرانە سەر زمانەکانی تر. (ژیاننامەی خاتوو جێن پتمان) زۆرترین ژمارەی لێ فرۆشراو ڕۆمانی (وانەیەك بەر لە مەرگ) کە کرا بە فلیم پاداشتی (ئیمی) چنییەوە. هەر لە پاداشتی نووسینەکانم (خەڵاتی دەزگای ماکئارسەر)م وەرگرت وەك ڕێزلێنانێك لە کۆی هەوڵ و تەقەللاکانم لە بواری ئەدەبدا، بەسوار چاکی هونەر و ئەدەب و پەیامی وشە ناوزەدیان کردم، بە

تایبـەتی فەرەنسـییەکان، دیـارە بـووم بـە ئەنـدامی کارای هونەر و ئەدەبی ئەمریکی.

کە ئاوڕ دەدەمەوە و لەو گەشتە دوور و درێژەم وردەبمەوە، وا هەست دەکەم کە من هێشتا نامە بۆ ئەو پیرەژن و پیرەمێردانە دەنووسم، نەك بە تەنها بۆ پیرەکان، بەڵکو بۆ گەنجەکانیش دەنووسم. نەك هـەر بۆ ئەو کەسانەی کە بە منداڵی دەمناسین، بـەڵکو بۆ چـەندەها نـەوە کـە پێشـووتر ژیـان. جیاوازییەکـە ئەوەیـە کـە ئـەوان هـەلی ئـەوەیان بـۆ نەڕەخسـا کـە بخوێنن و بنووسن، بەڵام بۆ من ڕەخسا. بـەڵام بـەبێ دەنگـی ئـەو کەسـانە، گـەر مـن پـەنجا ساڵ لەمەوبـەر لەبـــەر هەیوانەکـــە دانەنیشـــتبام و ئـــەو نامانـــەم نەنووسیایە، من گومان دەکەم خاوەنی ئەو کتێب و فلیمانە بوومایە، یاخود هیچ خەڵاتێکم وەربگرتایـە. مـن دڵنیـام کـە لـەم شـوێنە نـەدەبووم و ئـەو پایـەو پلەیەم نەدەبوو کە ئەمڕۆکە من خاوەنیم.

## سەرچاوە


Chicken Soup for the Writers Soul

Jack Canfield

Mark Victor

Bud Gardner

1950

pages (6-12) New-York

# هاوڕێی مەزن

گی دۆ. مۆپاسان
لە فارسییەوە: حوسێن مەردانی

خەڵکی لەگەڵ هەستی زیادخوازی و مەزنخوازی لەدایك دەبن, کە قسەکردن و بیرکردنەوە فێر ئەبن ئەو هەستە وەکو بەهرەیەك یان ئارەزوویەکی سەرهەڵداو خۆی نیشان دەدات.

ئاغای "ساکرمان"*cacrement* هەر لە منالیەوە تەنیا بیری لەیەك شت دەکردەوە, ئەویش ئەوە کە نیشانی شانازی وەربگرێت. بە منالی وەکو زۆربەی منالانی دیکە کە کلاوی کەپی لەسەر دەنێن, خاچێکی فافۆنی (رۆحین)بە شکلی نیشانی "لۆژیۆن دۆنۆر"ی بەخۆی هەڵدەواسیو لەناو کۆلاندا بە لەخۆفشین و لووت بەرزییەوە دەیدا بە دەستی دایکی و سنگی بچووکی کە بە بەنێکی سوور و ئەستێرەیەکی تەنەکەیی ڕازابۆوە, دەیکرد بە قەڵغان, پاش تەواوکردنی دەرسەکانی کە زۆر کەموکوڕی تێدابوو بە نیوەچڵی مایەوە لە ئەزموونەکانی دوایی قۆناغی دواناوەندی دەرنەچوو و لەوە بەولاوە زانی چ بکات.

چونکە دەوڵەمەند بوو لەتەك کەنیشکێکی جوان زەماوەندی کرد.

هەردووکیان لە پاریس وەکوو ئاغاواتەکان ژیانیان دەبردەسەر, بێئەوەی کە لەگەڵ خەڵك زۆر هامووشۆ بکەن کۆمەڵێکیان تایبەت بەخۆ پێك هێنابوو, لەگەڵ نوێنەرێکی مەجلیس کە تێدەچوو ببێ بە وەزیر و هەروەها دوو کەس لە فەرماندەرانی گەورەی سوپا ناسیاو بوون و شانازییان بەخۆوە دەکرد.

بەلام ئاغای ساکرمان هەر لە سەرەتای ژیانی هاوبەشەوە بیری لە شتێك دەکردەوە و ئەویش ئەوە بوو کە بۆچی ناتوانێت شریتێکی سووری باریك بەیەخەی چاکەتەکەیەوە بدوورێت و خەڵك بیبینن . لە شەقام تووشی هەر کەسێك بوایە کە نیشانی شانازی بە سنگیەوە بووایە دەتگوت بە چەقۆ لە زگی دەدەن. چارەڕەش بە ئێرەیی و بە دزەدز سەیری دەکردن. زۆر جاران لە وەختی بێکاریدا

پاش نیوەڕۆیان خەریکی ژماردنی خاوەنانی ئەم نیشانانە دەبوو و لای خۆی دەیگوت:

"وا بزانم, لە شەقامی "مادلەن"وە تاکوو کۆلانی "درۆئۆ" تووشی چەند کەسی نیشان دار ئەبم."

ئەوسا هێدی و لەسەرەخۆ وەرێ دەکەوت و چاوی لە کراسی ڕێبواران دەبڕی و بەڕادەیەك حوکمی چاوی بەهێزو تیژ بوو کە لە دوورەوە ئەو خاڵە سوورەی دەدیت. لەدواییدا , کاتێ دەگەیشتە ئاخری ڕێگاکەی واقی وڕدەما لە زۆربوونی ئەو هەموو کەسە نیشاندارە و لای خۆی دەیگوت: "–ئاخ! هەشت ئەفسەرو هەڤدە سوارچاك! بەڕاستی زۆرە! وەڵلا نیشان زۆر بەخشین بەو شێوەیە گەوجانەیە! ئێستاکە با بزانم لە گەڕانەوەدا تووشی چەند کەس دەبم!"

ئەوسا, هێدی هێدی دەگەڕاوە, کاتێ حەشیمەتەکە زۆر دەبوو و نەیدەتوانی بە وردی کارەکەی بکات و نیشان دارەکان ببژێرێ زۆر ناڕەحەت دەبوو. ئەو چەند گەڕەکێکی دەناسی کە خاوەنانی نیشان و میداڵ بوون، هاتوچۆی ئەویان دەکرد, لەوانە گەڕەکی "پالەڕۆوایال". شەقامی "ئۆپێرا" ش لەو بارەوە لە کۆلانی "ئاشتی" بەرمێن تر نەبوو" و زۆرتر بەبەری ڕاستی شەقامەکەوە دەڕۆیشتن.

دەتگوت کە خاوەنانی نیشان و میداڵ حەزیان لە کافەو شانۆ چوونی تایبەتە. هەر جارەی کە ئاغای "ساکرمان"چاوی بە دوو سێ دانە لەو پیرە پیاوانە بە تووکی سپی دەکەوت کە لەناو پێڕەوگەیەکدا ڕاوەستاون و بەریان بە هات و چۆی خەڵکی گرتووە لای خۆی دەیگوت:

"–ئەوانە ئەفسەرانی لۆژیۆن دۆنۆرن!"

و پێی خۆش بوو سلاویان لێ بکات.

ئەو زۆر جاران بیری لەو شتە کردبۆوە کە ئەفسەرەکان ئاکارو ڕەوشتیان" بەدەر لە ئاکاری سوارچاکەکانەو شێوەی خۆگرتن و هەڵس و کەوتیان جیاوازە. زۆر جوان دیار بوو کە ئەفسەرەکان بەزۆری خەڵك سەرنج و ڕێزیان دەدەنێ.

جاری واشە ئاغای "ساکرمان" ڕقی لەو کەسانە دەبۆوە کە نیشان و میداڵی شانازییان پێوە بوو و ئەوسا پێی وابوو ڕق و کینەکەی لە ڕق و قینی سۆسیالیستەکان دەچێ کە بەنیسبەت ئەم جەماعەتە هەیان بوو. ئینجا لەکاتی گەڕانەوە بۆ ماڵێ تووڕەو تۆسن لە دیتنی ئەو هەموو خاچی شانازییە, وەك هەژارێکی برسی کە لە دیتنی چێشتی جۆراو جۆری چێشتخانەکان شڵەژابووبێ بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد: "ئاخر کەی لەو وەزعە نالەبارو شڕە نەجاتمان دەبێت؟" ژنەکەی بە سەرسوڕماوی لێی دەپرسی: "–ئەوە باسی چ دەکەی؟"

ئەویش وەلامی دەدایەوە:

–دەتهەوێ چ بێت. نە ئەو هەموو زوڵم و زۆرەی کە دەیبینم تەنگیان پێ هەڵچنیوم, بەڕاستی کە "کۆمۆنار"ەکان هەقیان بوو. ئەو کات دوای خواردنی نانی شەو دەچووە دەر و لەپاش دوکانەکانی فرۆشتنی نیشان و میداڵ ڕادەوەستا. بە وردی سەیری نیشانە جۆراوجۆرەکانی دەکرد. حەزی دەکرد هەموویانی هەبێت و لە مەجلیسێکی جێژنی گشتیدا, لە سالۆنێکی پڕ لە حەشیمەت, پڕ لە خەڵکی واق وڕماو" لەبەرئەوەی هاوڕێیانی ڕێ بکات و سنگی لە نیشان و میداڵی هەمەڕەنگ کە بەجوانی و ڕێکوپێکیەوە هەڵواسراوە بدرەوشێتەوەو لە کاتێکدا کلاوە بڵندەکەی دەستی بە کەلەکەیەوەناوە وەك ئەستێرەیەکی گەش لەناو

ئاپۆرای خەڵک کە دەستیان داوەتە مەدح و ئافەریم و ڕێزلێنانی، تێپەڕێت.

مەخابن کە ئاغای "ساکرمان" هیچ بەڵگەیەکی نەبوو کە بەپێی ئەو لە نیشان و میداڵ هەڵواسین کەڵک وەربگرێت. لای خۆی گوتی: "–وەدەست هێنانی نیشانی "لۆژیۆن دۆنۆر" بۆ کەسانێک کە هیچ پێشەیەکی دەوڵەتییان نییە، زۆر زەحمەتە. ئەرێ بۆ نەبم بە کارداری فەرهەنگستان!" بەڵام نەیدەزانی کە چۆن ئەم کارە جێبەجێ بکات. پرسی بە ژنەکەی کردو ئەویش بە سەیرەوە لێی پرسی: "–کارداری فەرهەنگستان؟ مەگەر تۆ چ هەوڵێکت داوە بۆ گەیشتن بەم کارە؟"

پیاوەکە قەڵس بوو و گوتی:

"–ئاخر بۆ لە قسەکەم تێناگەی؟ من لێت دەپرسم بۆ گەیشتن بەو مەقامە دەبێ چ بکەم. بەراستی تۆش جاری وایە خۆت کەر دەکەی!"

ژنەکەی بزەیەکی هاتێ و گوتی:

"–ڕاست دەکەی" بەڵام من نازانم دەبێ چی بکەی؟

ئاغای ساکرمان بیری کردەوەو بە ژنەکەی گوت:

"–ئەتۆ بۆ ناچی لەگەڵ ئاغای "ڕۆسلن" نوێنەری مەجلیس قسەبکەی. ئەو دەتوانێ شتێکم بۆ بکات. بۆ خۆت دەزانی کە من لەو بارەوە ناتوانم ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ بکەم. ئەو کارە زۆر سەخت و ئەستەمە، بەڵام ئەگەر لە زمان تۆوە بوترێت شتێکی ئاسایی‌و سادەیە."

خاتوو ساکرمان بەقسەی شوویەکەی کرد. ئاغای ڕۆسلن بەڵێنی پێدا کە لەم پەیوەندییەدا لەتەک وەزیر قسە دەکات. ئینجا ئاغای ساکرمان ئاغای ڕۆسلنی وەزاڵە هێنا. ئاخرییەکەی نوێنەری مەجلیس وەڵامی پێداوە کە دەبێ داواکارییەک بنووسێت و تێیدا پلەو پایەکانی خۆیشی ناوبەرێت.

پلەو پایە؟ چ پلەو پایەیەک؟ ئەو بڕوانامەی شەشەمی دواناوەندیشی نەبوو. سەرەڕای ئەمە دەس بەکاربوو و خەریکی نووسینی نامیلکەیەک لەژێر سەردێڕی "مافەکانی خەڵک لە فەرهەنگ"دا بوو کەچی بەهۆی کزی‌و لاوازی باری زانستییەکەی نەیتوانی تەواوی بکات.

ئینجا وەشوێن بابەتی هاسانتر چوو. سەرەتا لەمەڕ "فێرکردن و ڕاهێنانی منالان بەهۆی کەرەسەکانی دیتن" شتی نووسی. لەو نامیلکەیەدا گوتی کە لە گەڕەکە هەژار نشینەکان جۆرێ شانۆی بەخۆڕایی بۆ منالان پێک بێنن. دایک و باوکی منالان هەر لە سەرەتای ژیانی جگەرگۆشەکانیان ئەوان بۆ دیتنی ئەم نومایشتانە بەرن و لەو شوێنە بەکامێرا کۆمەڵێ زانیاری گشتی فێری منداڵان بکەن. ئاغای ساکرمان دەیگوت کە ئەو شێوە فێرکردنە، فێرکردنی ڕاستەقینەیە. مێشک لە ڕێگەی چاو زانست وەردەگرێ و وێنەکان لە زەیندا دەمێننەوەو بەو جۆرە زانست بۆ منالان دەبێ بەکارێکی لەڕووی هەست و بینینەوە.

چ ڕێگەیەک لەوەها سادەتر بۆ فێرکردنی مێژووی گشتی‌و جۆغرافیاو مێژووی سروشتی و ڕووەک ناسی و ئاژەڵناسی و ناسینی ئەندامانی لەش و هتد هەیە؟

ئاغای ساکرمان ئەو نامیلکەیەی چاپ کرد و نوسخەیەکی بۆ هەریەکە لە نوێنەران و دە نوسخەش بۆ هەریەکە لە وەزیرەکان و دە نوسخەش بۆ سەرکۆمارو دە نوسخەش بۆ ڕۆژنامەکانی پاریس و پێنج ڕۆژنامەی سەر بە شارستانەکان نارد.

پاشان نامیلکەیەك سەبارەت بە پێکهێنانی کتێبخانە بزۆزەکانی نووسی و تێیدا ڕای دەربڕی کە –دەوڵەت دەبێ هێندێ داشقەی بچووك پڕی لە کتێب" لەوانەی پرتەقاڵ فرۆشەکان لە شەقامەکان دابنێ و هەر کەسەی پێی خۆشە" مانگانە دە بەرگ کتێب بەدانی یەك "سوو" بەکرێ بگرێ و بیانخوێنێتەوە. بۆ سەلماندنی بیروڕای خۆی دەیگوت:

"–نەتەوە جگە بۆ بەرەڵڵایی و خۆش ڕابواردن زەحمەت بەخۆی نادات. ئێستاکە ئەو بەرەو فێربوون ناچێت باشتر وایە کە فێربوون بەرەو ئەوان بەرین" و هێندێ شتی دیکە......"

ئەم نامیلکەیە هیچ دەنگ دانەوەیەکی نەبوو. بەو حاڵەش ئاغای ساکرمان دەستی لە داواکارییەکانی خۆی هەڵنەگرت. وەڵامیان پێداوە کە بایەخ دەدرێ بە پێشنیارەکانی و کاری پێویست دەکرێ . ئاغای ساکرمان زۆری هیوا بە سەرکەوتنی خۆی پەیدا کردو چاوەنواڕ مایەوە بەڵام هیچ ئاکامێك وەدی نەهات. ئەوسا بڕیاری دا بۆ خۆی وەدوا کارەکەی بکەوێت. داوای چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیری ئەو کاتی فەرهەنگی کرد, یەکێ لە کاردارەکانی دەفتەری وەزارەتی فەرهەنگ پیاوێکی جحێڵ و ماقووڵ بوو و تەنانەت جێگەی بایەخیش بوو و بۆ بانگ کردنی مونشی و پێشخزمەتەکانی پاش دەرگاو ئەندامانی بەردەستی خۆی, وەکو کەسێك کە پیانۆ بژەنێت, دایمە کایەی بە قۆپچە سپییەکانی زەنگ (هۆرن جەرەس) دەکرد, ئەو ئاغای ساکرمانی بۆ ژووری قاو کرد. ئەم لاوە" ئاغای ساکرمان هان دا کە لە ڕێبازێکی پیرۆزدا تێبکۆشێت و ئامۆژگاری کرد کە درێژە بە کارە باش و خاسەکانی بدات.

ئاغای ساکرمان سەرلەنوێ دەست بەکاربۆوە.

ئا ئێستا وا دەهاتە بەرچاو کە ئاغای رۆسلن نوێنەری مەجلیس هۆگری بە پێشکەوتن و سەرکەوتنی ئەو وەدەست هێناوە و تەنانەت کۆلێك ئامۆژگاری بەرزو بەنرخی پێدا. ئەو بۆخۆی نیشانی شانازی هەبوو بەڵام روون نەبوو کە بۆچی و بە چ هۆیەك ئەو شانازییەی وەبەرکەوتووە. بە ساکرمانی سفارشت کرد کە لێکۆڵینەوەو کاری تازەتر بکات و ئەوی بە کۆڕو کۆمەڵی پێکهاتوو لە زانایان کە بۆ گەیشتن بە شانازی زانین و داهێنان بەتایبەتی لەبواری ناڕۆشنی و گرێ پوچکەکانی زانست, توێژینەوەو کاریان دەکرد, ناساند" تەنانەت لە وەزارەتیشدا پشتیوانی لێکرد.

هەر چۆن بێت ڕۆژێك کە ئاغای رۆسلن بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ هاتبووە ماڵەکەی (ئەو چەند مانگێك بوو کە هەمیشە لە ماڵە ئاغای ساکرمان فراوێنی دەخوارد) دەستی بە توندی گووشی و بەسپایی پێی گوت:

"–ئاخری توانیم کە خزمەتێکی گەورەتان پێ بکەم. لێژنەی کاروباری مێژوویی کارێکی بە جەنابتان سپاردووە کە بریتییە لە لێکۆڵینەوەو کارکردن لە کتێبخانە جۆراوجۆرەکانی وڵاتی فەرانسە."

ساکرمان لە خۆشییان وای لێهات کە دەمی لە چێشت خواردن و ئاو خواردن نەدا. دوای هەشت رۆژان وەڕێ کەوت.

شار بەشار دەگەڕاو لیستەی کتێبەکانی کتێبخانەکانی دەخوێندەوەو لە عەمبارە پڕ لە کتێبە تۆزاوییەکان کە لەبەر بێ میهری کتێبدارەکان کەوتبوو دەستی بە پشکنین و گەڕان کرد.

شەوێك کە گەیشتبووە شاری "ڕووان" ویستی بۆ شارەکەی خۆیان بچێتەوە و ژنەکەی لەئامێز بگرێت کە حەوتوویەك نەیدیتبوو و

بـە شـەمەندەفەری کـات ژمێـر 9 کـە دەبوایـە نیوەشـەو ئـەوی بـۆ ماڵەکـەی گەیاندبایـەوە وەڕێ کەوت.

بۆخۆی کلیلی هەبوو. بێدەنگ و هەرا وەژوور کـەوت و لـەتاو ئـەوەی کـە هـەر ئێستا ژنەکـەی لەپەستا شادو بەکەیف دەبێت مچۆرکی بە لەشیدا دەهات. ژنەکەی دەرگای لەسەر خۆی داخستبوو. زۆر سـەیر بـوو!..... بـە نـاعیلاج لـەپاش دەرگـاوە بانگی کرد:

"-ژان! ئەوە منم!....."

دەتگوت ژنەکەی فرە ترساوە چونکو ئاغای ساکرمان گوێی لە دابەزینی ئەو لەسەر تەختەوە بۆ عـەرز بـوو و دەنگـی لـە قسـە کردنـی بـوو، وەکـو کەسـانی خـەوئاڵوو لەگـەڵ خـۆی قسـەی دەکـرد. پاشان بیستی کـە بـۆ لای ژووری ئارایشت کردن چوو دەرگاکەی کردەوەو دایخستەوەو دووسێ جار بـەپێی پـەتی لـە دیوەکـەدا بـۆ ئـەملاولا غـاری داو قەنەفەکانی لە شوێنێ بۆ شوێنێکی دیکە گواستەوە کـە لەبەشـە شووشـەیەکانیان دەنـگ بـەرز دەبـۆوە، تاکوو ئاخرێکەی پرسی:

"ئاخ، ئەلێکساندەر، ئەوە تۆی؟"

ساکرمان وەڵامی دایەوە:

"-ئەرێ، گیانەکەم، ئەوە منم، درگا بکەوە!"

درگـا کرایـەوەو ژنەکـەی بـە چـپەو سـرتەوە باوەشی پێدا کردو گوتی:

"-ئـاخ منـت ترسـاند! چ خۆشـییەك، چ نیعمەتێك!"

ئەوسا ئاغای ساکرمان وەکو جاران بەکاوەخۆ کراسـەکانی داکەنـد. لـەو کاتـەدا چـاوی بـە ڕووپۆشێك لەسـەر کورسـی کـەوت کـە هەمیشـە لـە دالانەکە بەچێو لیباسـی هەڵدەواسـی و هـەڵیگرت، کەچی لەپڕ سەری سوڕما!

لەشـوێن قۆپچـەی ڕوپۆشـەکە بـەنێکی سـوور دووڕوا بوو!

ساکرمان زمانی وەپتەپت کەوت و گوتی:

"- ئاخ! ئەو باڵتەیە....... نیشانیان........ پێ دووڕووەوە؟"

ئینجـا ژنەکـەی خێـرا خـۆی پێـدادا و ڕوپۆشەکەی بەدوو دەست گرت و گوتی:

"-نا، نا، هەڵە دەکەن. بیدەن بەمن!"

بـەلام سـاکرمان کـە قـۆڵێکی باڵتەکـەی مەحکـەم لـە دەسـتی ڕاگرتبـوو و بـەری نـەدەدا، دەتگـوت تووشـی سـەرەگێژەیەکی سـەیر بووە گوتی:

"-ها!....... چلۆن؟ چلۆن؟ شی بکەوە! ئەو باڵتەیـە ئـی مـن نییـە چـونکوو نیشـانی لۆژیـۆن دۆنۆری پێوەیە!....."

خـاتوو کـە زۆر گـۆڕا بـوو هـەر لەسـەر یـەك دەیگووت:

"-گوێ بگرە، گوێ بگرە!...... ئەتۆ ئەوەی بدە بەمن....

ئێستا من ناتوانم گوێ بگرم. ئەو شتە" تۆزێ نهێنییە.... گوێ بدەیە!...."

بەلام ئـەو بـەرە بـەرە تـوورە دەبـوو وە ڕەنگـی سپی هەڵدەگەڕاو هاوکات دەی گوت:

" گەرەکمە بزانم ئەو باڵتەیە بۆچی لێرەیە؟ ئەوە خۆ باڵتەی من نییە!....."

ئەو کات ژنەکەی بەسەریدا زیقاندی و گوتی:

"-بۆچـی، هـا بۆچـی! بێـدەنگ بـەو گـوێ بگرە....... ئەخە تۆ شانازی ئەوەت پەیدا کرد کە نیشانت بۆ بهێنن!....."

سـاکرمان لـە خۆشـییان وەهـا جوولایـەوە کـە باڵتەکـەی لەدەسـتی کـەوت و لـەخۆوە کەوتـە نـاو کورسی دەسکدارو گوتی:

"–مـــن...... مـــن...... نیشـــا.......
نیشانم...... گرتووە؟ ....."

"–بەڵێ.... بەڵام ئەو شتە نهێنییەو ئێستا کەس نازانێت!....."

لەو ماوەیەدا خاتوو ئەو باڵتە شانازی هێنەرەی لە کۆمۆددا شاردەوەو بە ترس و لەرزو رەنگی گۆڕاوەوە هاتەوە لای شوویەکەی و سەر لە نوێ گوتی:

"–بەڵێ, ئەو باڵتە تازەیە من گوتوومە بۆ تۆی بدووڕون. بەڵام سوێندم خواردبوو کە پێت نەڵێم تاوەکوو یەك مانگ یان شەش هەفتەی دیکە چونکو ئەو کات بەرەسمی رایان دەگەیاند– دەبێ مەئمورییەتەکەی تۆ تەواو بێت. تۆ دەبوایە لە گەڕانەوەتدا لەو هەواڵە ئاگادار ببوای. ئاغای رۆسلن ئەو نیشانەی بۆ تۆ گرتووە."

ساکرمان کە لە خۆشییان لە کەوڵی خۆیدا جێی نەدەبۆوە بەپەتە پەت گوتی:

"– ئاغای رۆسلن..... بۆ خۆی نیشانی هەیە....... ئەوە بۆ من نیشانی وەرگرتووە.... ئاخ!....."

ناچار بوو لێوانێك ئاو بخواتەوە.

لەتە کاغەزێکی سپی کە لە گیرفانی باڵتەکە کەوتبووە عەرزی لەبەرچاو دیار بوو. ساکرمان هەڵیگرتەوەو دیتی کە کارتێکی ناسینەو لەسەری ئەوە نووسراوە:"رۆسلن– نوێنەری مەجلیس".

ژنەکەی گوتی:

"– هانێ...... نەم گوت!....."

ساکرمان لەخۆشییان دڵی پڕبوو و گریا.

دوای هەشت ڕۆژان, لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا ڕاگەیەندرا کە ئاغای ساکرمان بەهۆی خزمەت و کاروباری دڵسۆزانە شانازی نیشان و نازناوی "لۆژیۆن دۆنۆری" پێ براوە.

## سەرچاوە

کتاب هفتە ژمارە 26 ساڵی 1341.

# پەیامی شیعر (1)

**سان ژۆن پێرس**

لەفارسییەوە: ئەدیب نادر

ستایشێک قبووڵ دەکەم کە لێرەدا بووەتە شاباشی شیعرو, لە بەرپەرچ دانەوەیشیدا بەشیعر کەمتەرخەمی ناکەم.

شیعر زۆر جار لەشانازی بێبەرییە. چونکە وا دەردەکەوێت کە لەنێوانی بەرهەمی شاعیرانەو چالاکی کۆمەڵایەتیدا کە پابەندی ئەرکە ماددیەکانە, جودایی ڕۆژ بەڕۆژ لەبرەودایە. شاعیر ئەم جوداییەی قبووڵ کردووە بەڵام بەدووی ئەوەوە نەبووە. ئەگەریش زانست لەدەستدەری ئەنجام و کەڵکە زانستیەکان بوو, باری زانایش هەروەها دەبێت.

بەڵام لێرەدا ئەندێشەی خاڵیی لەسوود، خواستی زاناو شاعیر, دەبێتە ئاوەڵی شانازی. ئومێدەکە, لانی کەم لێرەدایە, ئیدی شیعرو زانست وەکو دوو برای دژ یەک سەرنج نەدرێن. چونکە پرسین شتێکەو, ئەم دوانەیش بەڕووی یەکتریدا هەڵشاخاون و, تەنها ڕێگای گەڕان و سەنگ و سووڕ جیاوازە. کاتێ کە باری ئازاراوی زانستی نوێ پێوانە دەکەین هەتا دەروونی ڕەهایی ماتماتیکی سنوورەکانی ئاوەزی خۆی دەدۆزێتەوە, کاتێ کە سەرنج دەدەین زانستی فیزیک دوو تیۆری گەورەی بەسەردا زاڵە. یەکێکیان بنەچەی گشتی گوێرەییە "ڕیلەیتیڤیتی"و ئەوی تریشان بنەچەی "کوانتا"ی بنیادنراو لەسەر بێباوەڕی و بێ ئیستەرەمی_ کە بۆ هەمیشە هەتا تەبایی پێوانەکانی فیزیکیش دەستنیشان دەکەن_, کاتێ کە دەبیستین گەورەترین زانای نوێخوازی ئەم سەدەیە, داهێنەری ڕێی تازەی ناسینی گێتی و, وەڵام دەرەوەی فرەواژترین مەسەلە ڕۆشنبیریەکانە لەڕێی هاوکێشە جەبریەکانەوە, ئاشکرا کردن بەیاریدەدەری ئاوەز دەزانێت و, ڕادەگەیەنێت کە: "خەیاڵبازی زەمینەی ڕاستەقینەی خرۆشانی چڕو و پۆپی زانستە", تا ئاستێک بەرەو پێش دەچێت کە تەرزێک "تێنوارینی هونەری" ڕاستەقینە بۆ زانا پێشنیار دەکات, ئایا ئێمە ماف بەدەرین کەڕێی شیعریش چوون ڕێی زانست بەرەواو مافدار لەقەڵەم بدەین؟

لەڕاستیدا ئافەریدەکانی ڕۆح، بەر لە هەموو شتێك شاعیرانەن، شاعیرانە بەمانای پەتیی ووشە. لەگەڵ بەرچاوگرتنی هاوتایی نەخشکێشانی هەستیی و دەروونیشدا، لەیەکەمین مەنزڵەوە، لە فابریقەی زاناو شاعیریشدا تاقە ئەرکێك هەیە.

پێویستە ببینین کە ئەندێشەی بەڵگەهێن و خەیاڵبازی شاعیرانە کامەیان دوورترو بەرەو پێشتر دەڕۆن؟ لەدڵی ئەم شەوە ڕەسەنەیشدا، کە تێیدا دوو کەسی بەکوێری لەدایك بوو هێدی هێدی بەرەو پێش دەچن، یەکێکیان بە ئامرازی زانستی تەیار کراوەو ئەوی تریش تەنها ڕووناکایی ئاشکرا کردنی لەگەڵە، کێیان خێراتر چڵەپۆپەکان تەی دەکات؟ لە کامەیشیاندا ڕووناکایی تیشکدارتر دەدرەوشێتەوە؟ ئەم هەمووە بێ وەڵامە. نهێنی هاوبەشیش لەئارادایە. ڕووداوی گەورەی ڕۆحی شاعیرانەیش بە هیچ جۆرێك لە دێباجەی ئازاراوی زانستی نوێ ژێر دەستە تر نییە. زانا گێتی شوناسەکان لە زانینی تیۆرێك کە جیهانی گەردوونی و لەفراوانی و بەربڵاویدا دەبینن سەرسام دەبن، بەڵام لەجیهانی بێکۆتایی ڕۆحی مرۆیی، لەم جیهانە گەورەیەدا، هەروەها فراوانی و بەربڵاوی کەمتر لەکاردا نییە. هەرچەندەیش زانست کەوشەنەکانی خۆی بەرەو پێشتر بەرێت و ئەو کەوشەنەیش هەر چەندە بەربڵاوتر بێت دیسانەوە دەنگی ڕاکردنی سەگە ڕاوشکاریەکانی شاعیر دەبیستێت. چونکە ئەگەر شیعر، هەر وەکو دەڵێن، "ڕیالیزمی ڕەها" نەبێت، پەروەردگار نزیکترین ئارەزوومەندی واقیعیەتەو، نزیکترین ڕێی دەساژۆکردنێتی، لەو خاڵە دواینییەی هاوکاری، کە وەکو بڵێی ڕیالیزم بۆ پرس دەربارەی خۆی پێی ناوەتە حەرەمسەرای شیعرەوە. شاعیر، بە ئەندێشەیەکی پێوانەگەری و خوازەییەوە، بەڕووناکی دوورفڕی ئیماژ کە میانچییە، لەگەڵ کراوەیی پەیوەست و پەیوەندەکانی بەڕووی هەزاران زنجیری کاردانەوەو وابەستەیی بەسەر سوڕماویەوەو، سەرەنجام لە تیشکدانەوەی زوبانێك کە هەتا بزووتنەوەی بوونیش بۆ خۆی دەگوازێتەوە، لە "میتاڕیالیستی" کەڵکی وەرگرتووە کە زانست لەو ڕێگایەدا نییە، ئایا لۆژیکی لەشیعر دڵگرترو گیر کەوتووتر نزیك بەمرۆ هەیە کە پتر لە شیعر گرفتارو ئەرکمەندی بکات؟

کاتێ کە هەتا فەیلەسووفانیش سێڤدەری ئەو دیوی سروشت چۆڵ بهێڵنەوە، شاعیرەکە پێویستە لەم دەرکەیەوە وورە بەفەیلەسووفان ببەخشێت، ئەو کاتەیش هەر شیعرە، نەك فەلسەفە، کە بەگووتەی ئەو فەیلەسووفە کە ونە پتر لەهەموو شتێك شیعری پشتگوێ خستبوو_بەڕاستی خۆی بە "ڕۆڵەی سەرسامیی" دەسازێنێ.

بەڵام شیعر پتر لەوەی ئایین شوناسی بێت، بەر لە هەموو شتێك ئایینی زیندەگییە، ئایینی زیندەگی کامڵ. شاعیر لەئارای مرۆ ئەشکەوت نشینەکاندا هەبووە. لەمیان مرۆی چەرخی ئەتۆمیشدا هەر دەبێت. لەبەر ئەوەی شاعیر بەشی جودا نەویستی مرۆیە. هەتاکو ئایینەکانیش زادەی ئاتاجە شیعریەکان، واتە ئاتاجە مانەویەکانی، مرۆڤن. لەتیشك دانەوەی شیعردایە پڕووشەی خواوەندێتی تا هەتایە لەدڵی بەردە ئەستێی سروشتی مرۆدا زیندووە. کاتێك کە بینای ئەفسانە تێك و پێك دەڕژێت، خواوەندێتی پەناگای خۆی لەشیعردا دەدۆزێتەوە، ڕەنگیشە، هەتا، سەری قۆناغی نوێکردنەوەی هێزی خۆی. لەسیستەمی کۆمەڵایەتی مرۆڤیشدا کاتێك هەڵگرانی نانی دەورانی کۆن بەرامبەر هەڵگرانی مەشخەڵ سەر دادەنەوێنن، بەخەیاڵێکی

شاعیرانەوەیە کە دیسانەوە چرای هەستە باڵاکانی میللەتە ڕووناکی ویستەکان هەڵدەئایسێت.

شیعر سەربەرزی مرۆیە کە لەژێر باری هەتا هەتاییدا لەڕەوتایە. سەربڵندی مرۆیەك کە لەژێر باری مرۆڤایەتیدا لەڕەوتایە، لەکاتێکدا دەرگاگەلێکی نوێی مرۆڤایەتی بەڕوویدا ئاوەڵادەبنەوە، مرۆڤایەتیەك لە سەرتاپاگیریی واقیعی و تاقانەیی و کامڵ بوونی ڕۆحیی.. شیعری نوێ، بەئەمەکە بۆ پەیامی خۆی کە ڕۆچوونە بە پەنامەکیەکانی مرۆڤدا، دەست دەژەنێتە کارێکەوە کە سەرومڕیی ئەو پێداویستیەکی کامڵ بوونی مرۆییە، لە شیعرێکی ئاوادا شوێنەواری غەیب بێژی نییە. شوێنەواری جوانیی پەتیی شیعریش بە هیچ شێوەیەك هونەری بەرامەدار کردن و ڕازێنەرەوە نییە. شیعر هیچ کاتێك مرواریی فەرهەنگ پەروەردە ناکات، ناکەوێتە بازرگانی کردن بەتارمایی و نیشانەکان و، بۆ هیچ جەژنێکی پڕ ئاهەنگیش سەر شۆڕ ناکات، بەڕێیەکدا کە ڕادەبوورێت دەست دەداتە دەستی جوانیی. چ تاقانەیەکی شکۆدارە! بەڵام ئەمە هیچ کاتێك دوایین و تاقە سەرچاوەی ئەو نییە. شیعر کە بەجودایی لە هونەری ژیان قایل نابێت، هەر وەکو لە عیشق بەئاشنابووندا، خۆی کارە، خرۆشانی عیشقە، توانایەو، نوێخوازیی نەمر، لەکاری جێبەجێکردنی سەرحەدەکانیشدا عیشق بنەمایەو سەرکێشیش ئاینێتی، جێگایشی هەموو جێگاکانە لەئاسۆی داهاتوودا. شیعر داواکاری ڕەتکردنەوەو "نەبوون" نییە. لەگەڵ ئەوەیشدا چاولەڕێی ئیمتیازاتەکانی ئەم سەدەیە نییە. وا بەستەی چارەنووسی تایبەتی خۆیەتی و لە هەموو مەبەستێکیش ڕەهایە. خۆی بەهاوسەنگی ژیان دادەنێت، کە چاوەڕوانی ڕێنماییەکیشی لێناکرێت. شیعر بە ئامێزێك، بە بەشێکی گەورەی چامەیەکی زیندە، هەموو ڕابردوو و ئێستاو ئایندە، هەموو مرۆو سەرووی مرۆو هەموو بۆشایی دونیاو ئاسمانی جیهانیٚ بەیەکجاری دەگرێتەوە. ئەگەر لەنووتەکی و نادیاریی گازاندە بکەن، ئەم سیفەتە لەخودی تایبەتی ئەودا، کە ڕۆشنایی بەخشینە، بیٚ بوونە، ئەم تاریکیە کاری شەوێکە شیعر ئەرکی دۆزینەوەی لەئەستۆدایە. لەڕۆح و نهێنیەکدا کە بوونەوەری مرۆیی تیایدا نووقمە. دەربڕینی شیعریی هەمیشە لەتاریکیەوە دوورەو ئەم دەربڕینەیش لە زوبانی زانست ڕازاوەتر نییە. بەم شەقڵە، شاعیر، بەوابەستەییەکی تەواوەوە بەوەی کە هەیە، بۆ ئێمە بەنەمری و تاقانەیی بوونەوە پەیوەندی پەیدا دەکات، وانەی وی وانەی گەشبینییە. لە تێنواڕینی ئەوەوە یاسایەکی هارمۆنی بەسەرتاسەری جیهانی شتەکاندا فەرمان دەردەکات. لێرەدا ڕەوا نییە شتێك بێتە ئاراوە زاتەن لەپێودانگی مرۆییەوە وەدەردەکەوێت. خێراترین گۆڕانکارییەکانی مێژوو بێجگە لە نەوای کەشێك، دەرگایەکی پانوپۆڕتری دەورانی پەیوەستی و تازەگەریی نییە. "خواوەندانی سزادەر"[(2)] یش کە بەمەشخەڵە بڵندەکانەوە بە مەیداندا تێدەگوزەرێن و بێجگە لە ساتێکی مەسەلە فرە درێژو ڕەوانەکان ڕوون ناکەنەوە. شارستانێتییە پێگەیشتووەکانیش هەرگیز لەپەروای خەزاندا نامرن، بەڵکە کاژ دەگۆڕن. تەنها کرۆکیی "جمود" هەڕەشاوییە.

شاعیر کەسێکە شێرازەی دابمان بۆ دەپچڕێنێت. بەو جۆرەیش کە ئەو، سەرباری خۆیشی، بەڕووداوە مێژووییەکانەوە پەیوەندی پەیدا دەکات. هیچ خاڵێکی داستانی ژاناوی دەوران بۆ وی نامۆ نییە، پێویستە شاعیر تاسەری ژیانی ئەم زەمانە هەستەوەرە بەڕوونی بە هەمووان بڵێت.

چونكە سەردەمێ كەڕێ دەباتە سەردەمێكی نوێتر، گەورەو تازەیە، ئێمەیش شانازیی زەمانی خۆمان باوێژینە ئەستۆی كێ؟

مێژوو ڕۆژێك دەمامكی زبر خوویی لەسیما هەڵدەماڵێت و، بەدەستی بڵندەوە ئیشارەی ئاشتی یان خواوەندێتی ئاسیایی و توندو تیژترین سەمای تێكدەریشی دەكات و دەڵێت:

"سڵ مەكە! سڵ مەكەو دوو دڵ مەبە! چونكە ڕاڕایی بێ بەروبووم و ترسناكە. بەئاوازێكی هاوكێشەوە دەستی نوێخواز مەبەسەر دەستەیەك مرۆڤ، پابەند لەكاری سازاندندا، شەقڵێكی نوێ دەگرێتە خۆ، چێتر گوێڕایەڵ بكە. ئەوە ڕاست نییە كە دەڵێن ڕەوایە ژیان خۆی ڕەت بكاتەوە. هیچ زیندەوەرێك نییە لە نەبوونەوە پەیدا بێت یاخود گیرۆدەی وی بێت، بەلام هیچ شتێك وێنەو بارتەقای خۆی لەڕێڕەوی لێشاوی بێبڕانەوەی هەستیدا ناپارێزێت. كارەسات لەخۆدا گۆڕان و دەعجان بوون نییە. ئازاری ڕاستەقینەی سەدەكەمان لەشەباقەیەكدایە كە لەنێوان مرۆی نا هەتا هەتایی و مرۆی هەتا هەتاییدا هەموو كاتێك لەپتر بووندایە.

ئایا مرۆیەك لەلای چیایەكەوە بەڕۆشنایی گەیشتووە. لەلایەكەی دیكەدا خۆی دووچاری تاریكی دەكات و؟ ئایا پێگەیشتنی زۆرە ملێی ئەو لە كۆمەڵگایەكی یەك نەكەوتوو و سەرنەكەوتوو پێگەیشتنێكی كاڵ نییە؟.."

لە ئەستۆی شاعیردا نەبڕاوەیە كە لەنێوانی ئێمەدا بۆ قەریحەی دوو فاقی مرۆ گەواهی بدات. واتە لەبەرامبەر ڕۆحی ئەودا ئاوێنەیەكی هەستەوەر تر بۆ دەسەلاتە مانەویەكانی وی ڕاگیربێت. یانی هەتا لەم سەدەیەشدا، "دۆخێكی مرۆیی" شایان تر بۆ مرۆی تەندروست بخوازێت. یانی سەرەنجام، لەجیهاندا، بەپێوادانگێكی بەربەرین تر، ڕۆحی كۆمەڵ بەڕەوتی هێزی مانەوەیەوە ببەستێتەوە.. ئایا لەبەرامبەر هێزی ناوكێكدا، چرای گوڵینی شاعیر بۆ ئەم مەبەستە سەرو زیادە؟ بەڵێ ئەگەر مرۆ گوڵ بەیادەوە هەڵبخات.

بۆ شاعیر ئەوە بەسە كە ویژدانی بێ ئارامی سەردەمەكەی خۆی بێت.

## پەراوێز

1–ووتارێكە شاعیری گەورەی فەرەنسەوی سان ژۆن پێرس لەكاتی وەرگرتنی خەلاتی نۆبڵ لە ساڵی 1960 لە ئینستیتیوتی فەرهەنگیی ئیستۆكهۆلم دا پێشكەشی كردووە. ئەم ووتارە "مستەفا ڕەحیمی" كردوویەتی بە فارسی و لە ژمارە 2ی ساڵی 1978ی "جزوە شیعر" دا بلاوكراوەتەوە_ وەرگێراوە.

2–*furies* بەگێڕانەوەی ئەفسانە، كچانی زەمین و فەرمانداری سزادانی گوناهەكانی مرۆن، پرچیان بەوێنەی مارە. دەستێكیان مەشخەڵ و دەستەكەی تریان خەنجەری تیایە.

## سەرچاوە

گۆڤاری (جزوەء شعر) ژمارە (2) ساڵی 1978.

# فایلی ژمارە
# سەبارەت بە دەوڵەت

- دەوڵەتی هاوچەرخ دەوڵەتی دامەزراوەکانە

د. حەسەن نەبشەر تەیب

لە عەرەبییەوە: رەووف بێگەرد

- ئیسلام و دەوڵەتی مۆدێرن

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- بەجیهانیبوون و دەوڵەت

جەلال ئەمین

لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵلا

- حکومەت، دادپەروەریی و مافی مرۆڤ

ئار. ئەی. هێڵ

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

- تێڕامانێك لە دەوڵەت

نیرا چاندۆك

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

# دەوڵەتی هاوچەرخ دەوڵەتی دامەزراوەکانە

د. حەسەن ئەبشەر تەیب
لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

## تیۆری دەوڵەت

مرۆڤ هەر بە سروشتی خۆی گیانەورێکی کۆمەڵایەتیە و بەغەریزە دەیەوێت لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا بژی، ئەمەیش– هەر لە سەرەتاوە – بوونی دەوڵەتێك دەسەپێنێت بۆ ڕێکوپێك خستنی نەتەوە کە هەموو لایەنەکان گوێ ڕایەڵی ڕێسا گشتییە هاوبەشەکانی بن، بۆیە بە بیرکردنەوەیەکی لۆژیکیانە هەر کۆمەڵگەیەك بیەوێت خۆی لە ئاژاوە و بێ سەرەو بەرەیی بپارێزێت پێویستە لە سایەی دەستەڵاتی دەوڵەتدا بژی. وەك هارولد لاسکی *Harold laski* دەیسەلمێنێت کە: "ئەگەر بتەوێت هاودەمیەکی ئاسوودە و میهرەبان بپارێزیت دەبێت خۆت بە کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی گونجاوەوە ببەستیتەوە، چونکە تەنیا بە ئارەزوویەکی کوێرانە ناتوانیت لەو کێشە جۆراوجۆرانە خۆت ڕزگاربکەیت کە لە ئەنجامی چالاکیەکانی کۆمەڵێکی شارستانی دێنە گۆڕێ. تەنانەت ئەگەر متمانە لەسەر بەهرەو توانای چەند کەسێك هەبێت بۆ کارکردن، هێشتا هەر دەبێت ڕەچاوی ئەو داب و پێوانانە بکرێت کە خەڵکی لەسەری ڕاهاتوون و لە شێوە سیستماتیکیەدا کۆمەڵگە قبووڵی کردووە، تا بەو هۆیەوە هەق لە ناهەق جیابکاتەوە. تیوری ئاژاوەی فەلسەفی هەرگیز نابێتە واقیع، لەبەرئەوەی خەڵکیی بۆ بەدیهێنانی ئارەزوە دژوارەکانیان ڕێگای جیاواز لە بەردەگرن. چونکە هەوڵی ئاشتیانە بۆ پارێزگاری کردنی ژیانی ئاسایی خەڵك ڕێگا لە بڕیاری تاك ڕەوانە دەگرێت، بە تایبەتی لەو مەسەلانەدا کە کۆمەڵگە بۆمانەوەی خۆی بەشتی جەوهەریی دەزانێت، بەو مانایەی لە نوختەیەکی دیاریکراودا سیفەتی ئۆتۆماتیکی لەکاردەکەوێت و دەبێتە کردەیەکی بێهودە، دەبێت لەسەر دانیشتوان بکرێتە مەرج کە بۆ بەدیهاتنی ژیاریەکی هاوبەش و کۆك شێوازی کۆمەڵگەیی بۆ هەڵسوکەوتیان قایل بن، نابێت وایش بدرێتە قەڵەم کە نەمانی ئەو جۆرە ئوتوماتیکیەتە ڕێگا لە ئازادی دەگرێت، بە پێچەوانەوە، ئەوە زامنی هەرە سەرەکی بەدیهێنانی ئازادیە. ئەگەر ئەو ڕاستیەمان قبووڵ

بێت کە کەس ناتوانێت بە تەنیا بۆ خۆی بژی، دەبێت کۆمەڵێك یاسا و ڕێسا هەبن پەیوەندی و ڕەفتاری کۆنترۆڵ بکەن. ئازادیەکەیشی تاڕادەیەکی زۆر لە سنووری پاراستنی ئەو یاسایانەدایە، چونکە ئەو ڕێسایانە سنووری پێویست بۆ پاراستن و دڵنیابوونی دادەنێن، هەروەها تەندروستی و ئاستەکانی مادی و ڕۆحی ژیانی دەپارێزن. لە ڕاستیا دەوڵەت دوا وێستگەی یاساییە بۆ ویستی کۆمەڵگە. ئەو وێنەیە ڕەسم دەکات کە ڕێکخراوەکانی تری تیا دەرئەکەون. هەموو ئەو چالاکیە مرۆڤیانە کۆنترۆڵ دەکات کە کاری چاودێری کردنیان پێ چاکە[1]".

لە گەوهەردا دەوڵەت ڕەگەزی سەرەکی سازدانی کۆمەڵگەیە ئەو قەوارە گرنگەیە کە لەناوەوەیدا هەموو قەوارەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و یاسایی و ئابووری و کلتوری ئاوێتە دەبێ و چالاکیە جۆر بە جۆرەکانی کۆمەڵگە دەخەملێنێت. بەم پێیە دەوڵەت یەکەیەکی (الوحدة) بنچینەیی دنیای هاوچەرخە، هەروەك د. عەبدولخالق عەبدوڵلا ئاماژەی پێ دەکات: "لەگەڵ ئەوەدا کە یەکە سیاسیەکان لە دنیای هاوچەرخدا زۆرن، بەڵام دەوڵەت یەکەی بنچینەییە تیایدا. ژمارەی دەوڵەتە سەربەخۆکان لەم دنیا هاوچەرخەدا (150) دەوڵەتە، لە کاتێکدا کە ساڵی 1945 لە (50) دەوڵەت تێنەدەپەڕی. هەریەکێك لەم دەوڵەتانە سەربەخۆییەکی ڕەهای هەیە و خۆی بڕیار لەسەر بەرژەوەندیە نەتەوایەتیە باڵاکانی خۆی دەدات. هەریەکەیشیان هێزێکی مادی و مەعنەوی تایبەتی هەیە کە بەهێزێکی کاریگەر و سەرەکیی دادەنرێت لە سیاسەتی نێو دەوڵەتیدا.

دەوڵەت دەسەڵاتی ئابوری و جوگرافی و نیشتەنی و سیاسی تەواوی بەسەر ئەم سەردەمەدا هەیە. هەموو بەشێکی سەر زەوی لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکدایە، هەموو تاکێکی دانیشتووی ئەم دنیایە بەستراوە بە دەوڵەتێکەوە، کەسیش ناتوانێت بێ مۆڵەت وەرگرتن یان بێ بەڵگەی ڕەسمی لە دەوڵەتێکەوە بچێتە دەوڵەتێکی ترەوە – وەك لە سەردەمەکانی تردا دەیکرد – مرۆڤی سەردەم تووشی سەرگەردانی و دان پیانەنان دێت ئەگەر بە شەرعی ئیلتزامێکی یاسایی بۆ دەوڵەتێك نەبێت کە لە ئامێزی دەگرێ و دان بە بوونیدا دەنێت. کەواتە دەربەست بوون بە دەوڵەتێکەوە بووە بە یەکێك لە هەرە پێویستیەکانی ژیانی سەردەم. هەر دەوڵەتە لەم چەرخەماندا بە ڕەسمی و شەرعی دان بە لەدایکبوون و مەرگی مرۆڤدا دەنێت، هەروەها بەوەی کە لە سەرزەویدا دەژی[2].

بەڕای زۆرێك لە زانای سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوڵەت بریتیە لە: "کۆمەڵێك بە سەربەخۆیی لە هەرێمێکدا بژین" لە پێناسەیەکی وردتردا دکتۆر محەمەد عەلی محەمەد ئەوە دەسەلمێنێت کە دەوڵەت "کۆمەڵە کەسانێکی سەربەخۆن بەردەوام پێکەوە دەژین، هەرێمێکی دیاریکراویان هەیە و پەیوەندی سیاسی پێکەوەی بەستوون، سەرچاوەی پەیوەندیەکە هاوبەشی کردنی هەموانە لە گوێڕایەڵی بۆ دەسەڵاتی مەرکەزیی، ئەو دەسەڵاتەی بۆ هەریەکێکیان ئازادی و ماف دابین دەکات[3].

لەچوار چێوەی ئەم ڕوانینانەوە بۆ گەوهەری دەوڵەت، دەتوانین بڵێین دەوڵەت لەسەر چوار کۆڵەکەی سەرەکیی دادەمەزرێت کە ئەمانەن:

**یەکەم:** گردبوونەوەیەکی مرۆیی یان نیشتەنیەتی:

مەبەست ئەو کۆمەڵە کەسەیە کە پێکەوە نیشتەجێن و گونجانێکی وایان بۆ خۆ دروست کردوە کە دەستەبەری یەکیەتی وڵات و بەدیهاتنی

ئامانجــە هاوبەشــەکانیانە، تێــزە تەقلیدیــەکان مەبەستی گونجان وا لێك دەدەنەوە کە دەبێت ئەو کۆمەڵەیە یەك ئەتنی، یەك زمان، یان هەردووکیان بێت. بەڵام پێشکەوتە شارستانیەکان لە چەمکی دەوڵەتدا ئەوەی سەلماند کە ئەو تێزانە لە لایەنی فیکری و کردەییەوە کەم و کورتیان تیایە. چونکە واقیعی سەردەم ئەوەی دەرخستوە کە ئەم مەرجە تەقلیدیانە لە وڵاتانێکی وەك ئەمریکا و کەنەدا و هەندێکی تردا دەستەبەر نابن. ئەوەی دەکەوێتە بەرایی ئەو گونجاندنەوە لە شناسی دەوڵەت و جەوهەرەکەیدا یەکیەتی بەرژەوەندی و هەوڵدانە بۆ ئامانجــە هاوبەشــەکان کــە ئەنجامەکــەی هاوچارەنووسیە.

**دووەم:** هەرێم

ئەو پارچە زەویە سنووردارەیە کە دەکەوێتە ژێــر دەســەڵات و تایبەنمەندیــەتی دەوڵەتــەوە، دانیشــتوەکانی تیــادەژین و، چــوار چــێوەیەکی جوگرافیە بۆ بواری پیادەکردنی دەسەڵاتەکانی. دیارە ئەو چوار چێوەیە تەنیا زەویەکە ناگرێتەوە، بەڵکو بە هەمان ئەندازە ئاسمان و ئەو دەریایانەی نــاو هــەرێمیش دەگرێتــەوە کــە نووســاون بــە کەنارەکانی دەوڵەتەوە.

**سێیەم:** سەروەری

مەبەست لە سەروەری دەسەڵاتی باڵای دەوڵەتە و مافە رەواکانیەتی لە بریاردان و داواکردن لە هاونیشتمانی کە پەیرەویان لێبکات و فەرمانەکان بەجێبێنێت. ئەمەیش لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەو بریارانە تەعبیر لە کۆمەڵێك بەرژەوەندی کۆمەڵگە دەکــەن لــە چــوار چــێوەی تایبەتمەندیــەکانی دەوڵەتەکەی هەرێمدا، ئەم دەسەڵاتە باڵایانە لە کۆمەڵێك بنەما و پرنسیپەوە سەرچاوە دەگرن کە ئامانجیــان بــەدیهێنانی مەبەســتەکانی دەوڵــەت و رێکخســتنی پەیوەنــدی نێــوان تــاك و قــەوارە ناوخۆییەکەیە، ئەو بنەما و پرنسیپانە ئاسایی لەو دەستوورەدا دەسەلمێنرێت کە نمایندەی ئەو بنەماو رێسایەیە کە دەسەڵات رێك دەخات لە چوارچێوەی ئۆرگانی و ئەرك بەجێهێنانــدا. لە لایەکی ترەوە مەبەســت لــە ســەروەری ســەربەخۆیی سیاســی و پاشکۆیی نەکردنی دەوڵەتە بۆ هیچ دەسەڵاتێکی دەرەکی، بەڕادەیەك کە ئازادبێت لە دانانی بەرنامەی سیاسی خۆی و هەرچیەك پەیوەندی بە ویستیی ئازادانەی خۆیەوە هەیە لە دانان و جێبەجێ کردنی سیاسەتەکانی لە هەموو بوارێکدا.

**چوارەم:** حکوومەت:

ئامرازی دەوڵەتە لە بەدیهێنانی ئیرادە و بە جێهێنــانی دەســەڵات و ئەرکەکانیــدا، حکوومــەت هەموو ئەو دەزگایانە دەگرێتەوە کە دەوڵەت پشتیان پــێ دەبەســتێت لــە رۆنــانی سیاســەت و جێبــەجێ کردنیانــدا. هــەروەها گــوێڕادێریی رێســا گشــتیە هاوبەشەکان لەلایەن هاونیشتمانیەوەو، زامنکردنی رادەیەکی باشی مەدەنیەت بۆ ئەندامانی کۆمەڵگە.

بە پێی ئەم چەمکە کامڵە حکوومەت تەنیا لە دەزگاکانی جێبەجێکردندا کورت ناکرێتەوە. بەڵکو بــە هــەمان رادە دەزگاکــانی دەســەڵات دانــان (تەشریعی) و دەسەڵات راپەڕاندن (تەنفیذی)یش دەگرێتــەوە. حکوومــەت لــە جەوهــەر و شــێوەیدا لایەنی هەرە گرنگی سیستماتیزە کردنی دەوڵەتە کە کــاری بــەڕێوەبردن و رێکخســتن و گونجانــدنی کاروباری کۆمەڵگە ئەنجام دەدات. لەم روانگەیەوە حکوومەت وەك دکتۆر عەلی شەریف دەیسەلمێنێت: "حکومەت کۆی ئەو هەیئەتانەیە کە فەرمانڕەوایی

دەکەن یان دەوڵەت بەڕێوە دەبەن، واتا دەسەڵاتە گشتیەکان لە دەوڵەتدا، بەم پێیە دەسەڵاتی دانان و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و دەسەڵاتی قەزایی دەگرێتەوە.. دەتوانین بڵێین حکومەت ئامێری دەوڵەتە لە پرۆسەی پیادەکردنی دەسەڵات و ڕاپەڕاندنی سیاسەت و بەرنامەکانی"(4).

شایانی وتنە کە زاراوەی حکومەت، بەلای هەندێکەوە تەنیا دەسەڵاتی ڕاپەڕانی دەوڵەتە بێ لە دەسەڵاتەکانی تر. واتا حکومەت کورت کراوەتەوە لەسەر قەوارەی سیستماکی بۆ دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن، ئەمەیش لە خۆیدا تەسك کردنەوەی بوار و مانای زاراوەی حکومەتە.

## دەوڵەتی دامەزراوەیی

لە قۆناغی یەکەمی سەرهەڵدانی دەوڵەتدا سیما هەرە دیارەکەی لەسەر چەند ئەرك گەلێکی تاڕادەیەك دیاریکراو بنیات نرابوو. کە دیارەکانی ئەمانەن: زامن کردنی ئاسایشی ناوخۆ و بەرگری کردن، پاراستنی ڕژێمێکی دیاریکراو بۆ پەیوەندی لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگە و پاراستنی بەرژەوەندیە هاوبەشەکاندا: ئەم بۆچوونە کە دەربارەی ئەرکەکانی دەوڵەتە لە هەر قۆناغێکدا ورده ورده بەرەو پێش چوە، ئەمەیش بە پێی گۆڕانەکانی کۆمەڵگە و ئەو پێویستی و ئارەزوانەی پەیوەندیداربوون. هەر ئەمەیش وایکردوە کە لەم سەردەمانەدا دەوڵەت سەربکێشێتە ناو زۆربەی چالاکیە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیریەکانەوە کە جاران بە دەستپێشخەری و هەوڵی تاك ئەنجام دەدران.

ڕۆڵی دەوڵەت لە کۆمەڵگەی هاوچەرخماندا هێند گەورە بووە کە لە هەندێك حاڵەتدا دەبێتە دەسەڵاتی باڵاو ڕێکخەری هەموو ئەرکە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و روناکبیریەکان. ئەمە وای کردوە کە هەندێك بیرمەند بڵێن ئەم سەردەمە سەردەمی دەست تێوەردانی دەوڵەتە، چونکە دەوڵەت بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوان ئەچێتە ناو کاروباری کۆمەڵگەوە.

دەوڵەتی هاوچەرخ لە ڕێگای حکومەتەوە کە خۆی لە دەزگاکانی سیاسی و دانان و قەزایی و ڕاپەڕاندندا دەبینێتەوە ئەو کارە زۆر و هەمە جۆرانە دەکات. لێرەوە ئەو ڕاستیە جەوهەریە دەردەکەوێت کە سیمای هەرە دیاری دەوڵەتی نوێ لەوەدایە کە دەوڵەتی دامەزراوەکانە، بەو مانایەی بینای دەوڵەت و ڕەگاوێژی گەشەکردن و شارستانیەتی نوێ تەواو پشت بە توانا و چالاکی دامەزراوەکانی دەبەستێت.

ئەم توانا و بەهرە شاراوە و شیمانەییانە (محتمل) لە دەزگا میریەکاندا– ئەو کاتەی کە توانا و بەهرەکان هاتنە دی – وای لە بیرمەندی کارامە ئەلفرید مارشال *A.Marshal* کردوە کە بڵێت: "بەڕێوەبردنی حکوومی – بەو پێیەی بەرجەستەیەکی کامڵی دەوڵەتی دامەزراوەییە – گەورەترین دەستکەوتی مرۆڤایەتیە، بۆیە شایانی ئەوەیە هەوڵی تەواوی بۆ بدرێت تا کارەکانی بە چاکی بەڕێوە بچێت. وەلێ دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە بە بیانووی کات و شوێنەوە نەیکەینە مۆڵگەی بێ توانا و بێ بەهرەکان.

ئەوەی لەم وتەیە ڕابمێنێت سێ بەرئەنجامی گرنگی دێتە دەست کە ئەمانەن:

**یەکەم:** سیستمی دامەزراوەیی تاقە هەڵبژاردەیەکی ئاقڵانەیە بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە، هەروەها بۆ خستنەگەڕی هەموو بەهرەو تواناکان و چاك بەکاربردنیان بۆ بەدیهێنانی گەشە کردن و نوێ کردنەوەیەکی شارستانیانە. دکتۆر عەلی خەلیفە کواری زیاتر جەخت لەسەر تێزەکە دەکات و

دەڵێت: "بڕوا بوون بە کاری دامەزراوەیی وەرچەرخانێکی گرنگە لە ڕێڕەوی هەر کۆمەڵگەیەکی دواکەوتودا، چونکە هەرکاتێك ئەندامانی کۆمەڵگە هوشیار بوون و، بەرچاویان لە ڕووی ئەو مەترسیانەدا ڕوون بوو کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگەکەیان بوەتەوە و دوو دڵیەکی بابەتیانە لەناو ئەندامانی کۆمەڵگەکەدا بڵاوبوەوە، ئەوسا لەوە دەگەن کە ناتوانن وەك تاك لە ڕووی مەترسیەکاندا بوەستن و ژیانیان بپارێزن، بۆیە پەکخستنی هەوڵ و تێکۆشان و چڕ کردنەوەی لە چوارچێوەی کاری دامەزراوەییدا تاقە دەرووەیەکی ئاقڵانەیە بۆ دەربازکردنی کۆمەڵگەکەیان لە چڕنووکی دواکەوتویی، چونکە بەهۆی دامەزراوە و هەر لە ڕێگای ئەوەوە هەوڵەکانی کۆمەڵگە ڕێکدەخرێت و بەردەوامی دەدرێتێ و دەستکەوتەکانی کەڵەکە دەبن و توانای پاراستنی دەستکەوتەکانیش زیاد دەکات. دەتوانێت هەر لە ڕێگەی دامەزراوەکانەوە دیدی بۆ ژیان و پرنسیپی بیرکردنەوەی و شێوازی کارکردن گەشە و درەوشاوە تر بکات. هەروەها ئیرادەیەکی کۆمەڵگایەتی پێویستی هەبێت بۆ گەشەپێدانی پرۆسەی ئابووری — کۆمەڵایەتی گشتگیر و جەخت کردن لەسەر بەردەوامبوونی. کارکردن بە سیستمی دامەزراوەیی ڕەتکردنەوەیەکی شارستانیانەی شیاوی هەر کۆمەڵگەیەکە کە بیەوێت لە دەست دوا کەوتن و پاشکۆیەتی ڕزگار بێت. چونکە کە دامەزراوەیەکی بەرپرس هاتە گۆڕێ و، ئەرکی سەرشانی تاکەکان بۆ مەبەستی گۆڕین لە سیفەتی تاکیەوە بوو بە دەزگای بیر و کارکردن، لەم حاڵەدا کۆمەڵگەکە پلەی دەرك پێکردنی دامەزراوەیی هێند بەرز دەبێت کە گۆڕانەکەی بۆ دەبێتە کارێکی هەرە پێویست[5].

لەم ڕوانگەیەوە کە ئامانج گەشەپێدان و ڕەگاوێژی سیستمی بە دامەزراوەیی کردنە وەك ئامرازێکی سەرەکیی بۆ دروست کردنی دەوڵەت و بەدیهێنانی ئەو گەشەکردن و شارستانیەتە نوێیە، هەوڵدان بۆ بەرەو پێشبردنی ئیداری — بە حوکمی ئەوەی تواناکان بە هەند دەگرێت و سیستمی بە دامەزراوەیی کردن پەرە پێ دەدات — دەبێت بە گرنگتر بگیرێت و بایەخی لەوانی دی زیاتر بێت لە ستراتیژی دروستکردنی دەوڵەت و پلانە ئامانجدارەکان بۆ زامنکردنی بنەما و چالاکیە سەرەکیەکانی گەشەکردنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیری، مەرجی سەرەکیش هەر بەردەوامە: مەبەست و کاریگەریی هەوڵی بەرەو پێشبردنی ئیداری لە گەورە ڕاگرتنی توانا و دەوڵەمەندکردنی سیستمی بە دەزگایی کردن کاتێك بەرجەستە دەبێت کە بەرنامەیەکی داهێنەرانە بخرێتە بەر دەست و کاری بۆ بکرێت دوور لە نەقڵ و لاسایی کردنەوە، کە بە هۆی ئەو سیستمە ئیداریەوە داهێنان لە شێوازی دامەزراوەییەکدا بکرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ بنەماکانی ژینگە و ئەوەی کە شارستانیەتی نوێ دەیخوازێت، هاوکات لەگەڵ ئەو شتانەی کات و شوێن دەیڕەخسێنن.

**دووەم:** سیستمی دامەزراوەیی چالاك بەرجەستەکردنێکی زیندوی بیرەو پرنسیپێکی کامڵە بۆ ڕێکخستن و شێوازی کار. واتا ئامێرێکی هونەری بێ لایەن نیە، بەڵکو و دەربڕینی بیرێکە دەربارەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەیی و بەرەنجامی قەناعەت و خەونەکانی کۆمەڵگەیە لەو شێوازەی کە گەشەپێدان و شارستانیەتی نوێیی ئێستا و ئایندە دەیخوازێت.

لێرەوە گرنگیی جەخت کردن لەسەر شوناسی شارستانی لە سیستمی دامەزراوەییدا

دەردەکەوێت، ئەمەیش لە خۆیدا تاڕادەیەك توانایەکی داهێنەرانەی زۆر دیاری دەوێت بۆ بەرجەستەکردنی بۆچوونە فیکریە ڕەسەنەکان کە تەعبیر لە بنەمای کلتوری شارستانی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە دەکەن و، ئەو ئەرك و پرنسیپی کارانە دەستنیشان دەکەن کە دەبێت دامەزراوەکان بۆ بەدیهاتنی ئامانجی گەشەپێدان و نوێ کردنەوەی شارستانی لەبەریبگرن.

**سێیەم:** کە دەڵێین نابێت ئیدارەکانی میری بۆ ئەو کارانە تەرخان بکرێن کە بۆی ناشێت، مەبەستمان ئەوەیە کە ئەرك و سروشتی کاری حکومەت کۆمەڵێك سنووری هەیە و دەبێت بپارێزرێن، هەرە دیاریان پلەی هوشیاریی ژینگەیە، هەروەها قەناعەتی سیاسی و چالاکی کۆمەڵایەتی و تواناکانی ئابووریە. ئەوەیش کە دەبێتە بەرئەنجامیان لە پلەی ئاوێتە بوون یان دژوارییی لە نێوان ئامانج و سیستەم و شێوازی کارەکانی ئیدارەی حکوومەت لەلایەك و بنەماو پێکهاتەکانی ژینگە لەلایەکی ترەوەیە، ئەم سنووردارکردنە زۆرە کە کاردەکاتە سەر سروشتی ئەرکەکان کە دەشێت ئیدارەی حکومەت بەجێی بێنێت پرسیارێکی جەوهەری دەهێنێتە پێشێ: ئەرکە سەرەکیەکانی ئیدارەی حکوومەت لەبەر روناکی کات و شوێندا چین و بنەما و پێکهاتەکانی ئەو جۆرە ژینگەیە کامەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە گرنگە فەرامۆش کراوە، یان لە چاکترین گریمانەدا دواخراوە، لە زوربەی ولاتە گەشە کردووەکاندا، بۆیە دەبینین بەردەوام بەرئەنجامەکان لە کاتی هەڵکشاندا فراوان بوون و لە کاتی داکشاندا هاتوونەتە خوارێ چ لە ئەرکەکانی ئیدارەی حکوومەت و چ لە قەناعەتی یەك بە دواییەکی حکومەتەکاندا. ئەم گۆڕانە جۆراوجۆر و زۆرجاریش دژبەیەکە لە ئەرکەکانی ئیدارەی حکومەتدا و لە زۆر لە ولاتانی گەشەسەندودا، بوەتە هۆی ئاستەنگی لە گەشەکردنی دامەزراوەیی بەرپرسیاردا کە لەسەر ئاراستەیەکی فیکری و کارە دیاریکراوەکان دامەزراوە. چونکە بازنگەی کاری ئیدارەی حکوومەت هێند فراوان بووە ئەو ئەرکانەیشی گرتۆتەوە کە شیاوی کردنی ئەو نین، بۆیە ئەو توانا و ئیمکاناتەی لە باربردوە کە دەکرا دەستەبەری بەدیهێنانی کۆمەڵێك کاری گرنگ بن لەبەر رووناکی هەلومەرجەکانی کات و شوێندا. ئەم راستیەیش هەمیشە ئامادەیەکە: ئێمە ناتوانین بۆ هەموو حاڵەتێك چارەسەرێکی ئامادەکراومان هەبێت بۆ گرفتی ئەرکەکانی ئیدارەی حکوومەت. بەڵکو چارەسەرەکان لەسەر ئیرادەی کۆمەڵگەیی بنیات دەنرێن – کە چالاکیە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و روناکبیریەکان دەگرێتەوە – هەروەها بە بڕوابوونی بە دانان و لەبەرچاوگرتنی دیدێکی فیکری و کردەیی یەکگرتوو کە سیمای واقیعیەت و بەردەوام بوون و نوێخوازی لە خۆگرتبێت لە چوارچێوەی هەلومەرجە پێویستیەکانی شوێن و کاتدا، وێنایەکی مەنهەجی و ستراتیژی بۆ ئەرکەکانی ئیدارەی حکوومەت لەبەرگرتبێت لە چوار چێوەیەکی تەواو کامڵ و ئاوێتە بوون و سازان لەگەڵ کەرتی ئەهلی و کەرتی هەرەوەزی و کەرتەکانی دی کە بەرهەمی داهێنانی کۆمەڵگەکەن.

دەتوانین لەم سێ تێزەوە بگەینە ڕێسایەکی جەوهەری، ئەویش: تواناکانی دەوڵەت لە دروست کردن و جێگیرکردنی سیستەمی بە دەزگایی کردنێکی چالاك و زامنکردنی بەردەوام بوونی بە پلەیەکی بەرزی بەهرەمەندی و چالاك نایەتەدی تەنیا لە ڕێی تێکۆشانێکی داهێنەرانە و خوڵقاندنی دوور لە نەقڵ و لاسایی کردنەوە نەبێت. ئەمەیش بە

ئیرادەیەکی کۆمەڵگەیی ئازاد و پێگەیشتوو دەکرێت کـە کـەڵك لـە میراتـی شارسـتانی و، فاکتـەرەکانی بـوونێکی پێویسـت و، هۆکـاری تـازەی شارسـتانی وەربگرێت. بۆ ئەوەی بتوانێت ئەرکەکانی ئیدارەی حکوومەت و سیستمی کارەکەی لە ئاوێتە بوون و رێککەوتنی لەگەڵ بنەماکانی ژینگە و دەرهاویشتە و داخوازیەکانی شوێن و کاتدا دیاری بکات.

## هەڕەشە هەمیشەییەکانی قەوارەی بە دەزگایی کردنەکانی دەوڵەت

کــە رۆڵـــی ســـەرەکی و هـــەرە گرنگـــی حکوومـەتمانزانی و ئـەو دەزگایانـەی ئـەو رێکیـان دەخـات وەك ئـامێرێکی بــزۆك بــۆ دەوڵــەتێکی هاوچەرخ بۆ گەلاڵەکردنی ئیرادەیەکی کۆمەڵگەیی و بەجێهێنانی سیاسـەتە گشـتیەکەی لە هەموو بوارە جیاوازەکانی کاروباری کۆمەڵگەدا، لەم حاڵەدا توانا و بەهرەمەندیـــەکانی دەوڵـــەتی هەنووکـــەیی و ئایندەیی بەسـتراوەتەوە بـە جێگیرکردنـی حاڵـەتی لێهـاتوویی و چـالاکیەکی بـەردەوام و گرێـدراو بـە هەموو دامەزراوە جیاوازەکانەوە. ئەمەیش هەروا بە ئاسـانی نایەتـە دی، بـە تایبـەتی ئەگـەر بڕوانینـە کاریگەریی کۆمەڵێك رەگەزی جیاواز کە بەردەوام لە هەڵبــەز و دابــەزی ئــەرێ و نەرێــدان بەرانبــەر بــە لێهـاتویی و چـالاکیەکانی دامــەزراوەی دەوڵەتــدا. گرنگترینی ئەو رەگەزانە ئەمانەن:

**یەکـــــەم:** ئــەو گۆڕانــە خێرایانــەی لــەم سەردەمەدا روودەدەن.

دنیــای ئــەمرۆ لــە گــۆڕان و بــەرەو پــێش چوونێکی فرە جۆریدا و لە هەموو بوارێکی ژیانی سەردەمدایە، وەك د. عەبدولخالق عەبدوڵلا ئاماژەی پێداوە: "لە هەرە دیاردە جیاوازەکانی ئەم سەردەمە سـیفەتی خێراییـە کـە لـە سـەردەمەکانی پێشـودا نـەبووە و، ئـەوان زیـاتر سـیفەتی یـەك جـۆری و خاویان پێوە دیارە. ئەمە سەردەمی دنیایـەکی هـەرە خێــرای گۆڕانــە، کــە مــرۆڤ بەشــێوەیەکی بــالا و نامـــاقووڵ هانکـــە هـــانکی دوای نوێخـــوازی و تازەگەریــە، گــۆڕانییش تــەنیا بــە تێکڕاییــەکی (معـدلات) خێـرا تـەواو نابێـت، بـەڵکو تەنانـەت بـە پێوانەی کۆمەڵگە پیشەسازی و پێشکەوتوەکانیش گۆڕان سەرسووڕهێنەر و مەزن و بەردەوامە. مرۆڤی ئــەم ســەردەمەیش ناتوانێــت خێــرا لەگــەڵ ئــەو گۆڕانانـەدا خۆی بگونجێنێت کە هەموو بوارەکانی ژیــانی گرتۆتــەوە و، ئــەو بــوارە زۆرانــەیش کــە پەیوەنــدیی بــە ســەر پشــکی و هەڵبــژاردنی بوونەوە هەیە"[(6)].

لەبـەردەم ئـەم گۆڕانـە خێـرا و بەردەوامـەی لـە سیســتمی سیاســی و ئــابوری و کۆمەڵایــەتی و روناکبیری ئەم سەردەمانەدایە و تیایدا دەژین و، لە بەرهەم و شێوازی کار و جۆری بەکاربردندا هەستی پێدەکــەین. هــیچ دەوڵــەتێك ناتوانێــت دوور لــە کاریگــەریی ئــەو گــۆڕان و پێشــکەوتنانەدا بــژی. لێرەوە بایـەخی ئـەو پێکـەوە ژیانـە دەردەکـەوێت کە لە نێوان قەوارەی بە دەزگایی بوونی دەوڵـەت و ئـەو گـۆڕان و پێشـکەوتنانەدا بـەدی دێـت. نـەك تـەنیا لەسـەر ئاسـتی توانـای خۆگونجانـدن، بـەڵکو و بـە بـەدیهێنانی ئاینـدە بینیـەك کـەزامنی شـان بەشـان رۆیشتنی ئەو گۆڕانە و خۆ ئامادەکردنە بۆی.

هــەروەك د. قوســتەنتین زریــق دەڵێــت: "ئــەم گۆڕانـە خێـرا و گشـتگیرە، کـە رووبـەرووی هـەموو گـەلان و بـوارە جیاوازەکـانی ژیـان بوەتـەوە، ئـەو کەسـەی بیـەوێت رەفتـارێکی هاوچەرخانەی هـەبێت دەبێـت ئـەو توانایانـە بـە دەسـت بێنێـت کـە هێـزی رووبەرووبوونـەوەی مەترسـیەکانی ئـەو گۆڕانانـەی هەیە و زامنی مانـەوە و پێشکەوتنە، لەوانە توانای

جوولان و خۆگونجاندن و توانای جیاوازی کردن له نێوان جۆره جیاوازەکانی گۆڕان و شێوەکانیدا. چونکه ئەو گۆڕانانه هەیانه جەوهەری و هەیشیانه رووکەشه، دوا مەرجیش توانای پێشبڕکێ کردنه لەگەڵ گۆڕانەکەداو خۆ بۆ ئامادەکردنیەتی. چونکه تەنیا هاوشانیەتی و خۆگونجاندن بەس نیه، لەبەرئەوەی ئەو دوانه له پاشکۆیەتی و ملدانی ئەو هێزانه ڕزگارت ناکەن که گۆڕان دروست دەکەن و کاریگەریان لەسەری هەیه. بۆیه گرنگی ئایندەبینی لێرەوه دەردەکەوێت هەروەها نەخشه و پلان و داهێنان لەمەو لەوه و بواری تری روانین و بیر و کار کردندا[7].

ئایندەبینی له چوار چێوەی ئەم هەموو گۆڕان و بەرەو پێشچوونەدا، واتا لێکۆڵینەوه و بایەخدان بەو بەرئەنجامه کەڵەکەبوەی رووداو و گۆڕانەکان که له کۆمەڵگەوه سەرچاوەی گرتوه یان له شوێنی ترەوه هاتۆته سەری، هەروەها هەوڵدان بۆ داهێنان و دۆزینەوه ئاینده ئەڵتەرناتیڤەکان که دەشێ بێنه دی، ئاوێته بوونه پۆزەتیڤەکان بۆ قەوارەی به دەزگایی کردنی دەوڵەت. لەگەڵ بەرەوپێشچوون و گۆڕانه خێراکان. ئەوەیش که ئەو ئاوێته بوونه بەدیدێنێت بۆ پێشوازی کردنی ئاینده. هەموو ئەمانه بایەخی لێکۆڵینەوه ئایندەییەکان دەردەخات که پێش هەر شتێك هەوڵی وێناکردنه جیاوازەکانی ئایندەیه به پێی هەلومەرجی جیاواز که پەیوەندیی به واقیع و رەگی مێژوییەوه هەیه، هەروەها ئەوەی بشێ بێتەدی و شێوازی جیاواز له بەکاربردندا و پلەی هوشیاری به مەسەلەی ئایندەو ئامانجه ئاشکراکان و، ئەو کاره کردەییانەی کۆمەڵگه دەگۆڕێت بێ ئەوەی تاکەکان له ئاسەواری به ئاگابن، ئەو پەیوەندی ئاڵ و گۆڕکردنەی له نێوان بنەما و پەیوەندی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و شارستانی باوی ناوخۆ و هاوشێوەکانی دەرەوەیشدا هەیه..هتد. هیچ ڕێگایەکی تر نیه بێجگه له خۆتەیار کردن به زانست، واتا باسێکی والاّ و چڕ له بواری لێکۆڵینەوه ئایندەییەکاندا[8].

**دووەم:** دانه دواوەیەکی زۆری سەرچاوه سروشتیەکان که بەرئەنجامی بەکارهێنانی ئەو سەرچاوانەیە له بەروبوومی پیشەسازی فرەو جیاواز لەلایەن کۆمەڵگه هاوچەرخەکانەوه، چونکه چاوچنۆکیەکی بەکارهێنانه هەیه که بوەته سیمایەکی دیاری سیستمی ئەم سەردەمە.

ئەمه ئاسایی بەرەو حەقیقەتێکمان دەکاتەوه که سەرچاوەکان کەم دەبنەوه و ترسی نەمانیان زۆره. بێجگه لەوەی که دەوڵەته تازه پێگەیشتوەکان له ڕژێمی ئابووری دنیاوه تووشی بارێکی ئاڵۆز هاتوون، هەروەها له دیارده نێگەتیڤه جۆراو جۆرەکانیەوه که له هەڵئاوسان و بەرزبونەوەی نرخ و سەرکەوتنی قەرز و شتی تردا خۆی دەنوێنێت. بەرانبەر بەم گوشاره ئابووریه زۆره، زوربەی دەوڵەته تازه پێگەیشتوەکان چاریان نەماوه بێجگه له کەمکردنەوەی قەبارەی خەرجیه گشتیەکان، به تایبەتی خەرجیه رەوان و گۆڕانەکان (الجاری و التحویلی) ئەمەیش وەك پێویست نایەتەدی تەنیا له ڕێگای سیاسەتێکی گشتیی کامڵەوه نەبێت که بزانێت خەرجیەکان چۆن دەکات، بەجۆرێك که قەبارەی خەرجیه حکوومەتیەکان و هۆی تەرخان کردنی و سەرچاوەی هاتنەکەی دیاریبکات. ئەمەیش لەبەر ڕوناکی هەل و مەرجی ئابوری و ئیداریی بەمانا دامەزراوه کامڵەکەی.

**سێیەم:** زیادبوونی بەردەوامی ئامانج و ئارەزووی هاونیشتمانی بۆ زۆرکردنی پرۆژەکانی حکومەت له هەموو بوارەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و روناکبیریدا، بوه به هۆی فره کردنی شێوازی

بەرهەمهێنان و کارگوزارییەکان و ئەمەیش لە خۆیدا لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لە دەزگاکانی حکومەتدا گەشەکردن زیاد دەبێت تا ئەو ڕادەیەی لە زۆر کاتدا پێکهاتەیەکی تێکەڵ و ئاڵۆزی لێدەکەوێتەوە. ئەم پێکهاتە تێکەڵ و ئاڵۆزکاوە لە قەوارەی دامەزراوەیی دەوڵەتدا پێویستی بە پیاچوونەوە و هەڵسەنگاندنێکی بەردەوام هەیە بۆ دووبارە کردنەوەی ڕێکخستن و دروستکراوەکان، بۆ ئەوەی سنوور بۆ دوالیزمی و لێکچوون لە کارەکاندا دابنرێت و ململانێی بیرۆکراتیەکان بنەبڕبکرێن و دەستەبەری توانا و چالاکی کار ڕاپەڕاندن بپارێزرێت.

ئەم سێ هەڕەشەیە و ئەو پێشکەوتنە زانستی و ئەپستمۆلۆژیە مەزنەی هاتۆتە گۆڕێ و ئەو شۆڕشە زانستی و تەکنیکیەی دەستکەوتی گەورەی لە بەرهەم هێنان و شێوازی کاردا بەدی هێناوە، وایان کردوە کە بایەخدان بە ئیدارەی حکوومەت و بەرەو پێش بردنی قەوارە دامەزراوەییەکانی ببنە مەبەستی سەرەکی. بۆ ئەوەی ببێتە ئامێرێکی کاریگەر لە گەلاڵە کردنی ئیرادەیەکی کۆمەڵگەیی بۆ دەوڵەت و جێبەجێ کردنی سیاسەتە گشتیەکانی لە هەموو بوارەکاندا بە توانا و چالاکیەکی بالاوە.

## جێگیر کردنی ئەو بەرنامە زانستیانەی پەیوەستن بە پێشکەوتنی دەوڵەتی هاوچەرخەوە

لەبەر ئەوەی دەوڵەتی هاوچەرخ وەك ئاراستەکەر و پلاندانەر و گونجێنەری کاروبارە جیاوازەکانی کۆمەڵگە زۆر دەست لە کارەکان دەخات و، دامەزراوە حکومەتیەکەیشی دەورو چالاکی زۆری هەیە بۆبەرێوەبردنی ئەو بوارانەی پەیوەندیان بە سەروەری دەوڵەت و زامن کردنی پاراستن و ئاسایش و عەدالەتەوە هەیە و ئەو پرۆژە گشتیە گرنگانەیش بەرێوە دەبات کە لە ڕاژەی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیریدایە. لەبەر ئەمانە بیری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئیداری بایەخێکی گرنگی بەو دەورەداوە کە دەوڵەت بەرەو پێشەوە دەبات و گەلێك لقی زانستی و فیکری و کردەیی دامەزراوە بۆ شیکردنەوەی ئەو دەورانە و دۆزینەوەی ئەلتەرناتیفی تر بۆ زیادکردنی چالاکیەکانی لە نێوان ئەو زانستە پێشەنگ و تازەیەك نوێیەدا کە بایەخ بەو دەورەمەزنەی دەوڵەت دەدات و ئەو ئاسەوارەیش کە لە کاروبارە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا بەدی دێت، زانستی "توێژینەوە ئایندەییەکان *futurology* و زانستی سیاساتی گشتی *policy science*.

لە نێوان مێژونووسانی زانستی توێژینەوە ئایندەییەکاندا نیمچە ڕایەك لەسەر ئەوە هەیە کە بیرمەندی بەریتانی هـ.ج. ویلز *H. G wells* (1886–1946) دەوری پێشەنگی هەیە لە ڕووناکی خستنە سەر و گەشە پێدانی گرنگیدان بە توێژینەوە ئایندەییەکان لە ڕێی توێژینەوەکانیەوە: "پێشبینیەکان" و "شێوەی شتە ئایندەییەکان" مەبەست لەم تێزانە دۆزینەوەی جۆری ژیانی نەوەکانی ئایندەیە. کۆمەڵێك زانا و بیرمەندی تریش شتی جەوهەریان خستۆتە سەر تێزەکانی هـ.ج. ویلز. وای لێهاتوە ئێستا زانستی توێژینەوە ئایندەییەکان بەو زانستە هاوچەرخانە دادەنرێت کە گەلێك لە لێکۆڵەر و باسکارەکان بایەخی زۆری دەدەنێ.

ئامانجی سەرەکیی زانستی توێژینەوە ئایندەییەکان بینینی ئایندەیە، وەك دکتۆر مەحمود عەبدلفەزل باسی دەکات: "لە بنەڕەتدا هەوڵێکی سووسەکردنە بۆ بینیی هەمەلایەنەی ئایندە و

دۆزینــەوەی پەیوەندیــە ئایندەییــەکان لــە نێــوان شــتەکان و سیســتم و گونجانــدنێکی هەمــەکی و لاوەکــی لــە دنیایەکــدا کــە شــەپۆلی بزاوتــەکانی لەئەوجــدان و پلــەی نایــەقینیش لــە زیادیــە، بۆیــە دەتــوانین دیــدی ئاینــدەبینی وا پێــك بچــوێنن کــە لەســەر تــەپۆلکێکی بــەرز دانیشــتوین و لــە ئاســۆ بەرچاوەکانی ئایندە دەڕوانین. هەرکەسە و بە پێی تەواویی بینین و بیری خۆی. بزاوتی ئایندە بینی جۆرێکە لە هەستی مێژوویی کە یاسایەکی زانستی هەیــە.. بۆیــە توێژینــەوە ئایندەییــەکان هــەوڵی دۆزینەوەی ئەو کووچە و ئاسۆیانەیەتی کە دەشێت لــە ئاینــدەدا چــاوەڕێی بــین، بــۆ ئــەوەی وێنــەی نەخشەکانی ئەو مەلەوانیە گرانەمان لا بێت کە لە دەریاکانی ئایندەدا دەیکەین.

پەیوەندی نێوان ئێستا و ئایندە پەیوەندیەکی دیالەکتیکیە، ئاوێتەیەکی پێویستە.. ئەمەیش لای خۆیــەوە ســنوورێك بــۆ ئــەو هێــز و ئــاڵ و گۆڕانــە دادەنێت کە کاریگەریان لەسەر بزاوتەکانی ئایندە هەیە، چونکە پەردە لەسەر لادان و دۆزینەوەی ئەو هێــزە بزوێنەرانــە (دیــار و نادیاریــان) دەســتەبەری دۆزینـــەوەی ڕێـــڕەوە ئایندەییـــە شـــیاوەکانە و، ئامادەکاری وردەکاریە پێویستەکانی ئایندەیە، بە هەموو پەراوێز و هەڵە و پەروازە خەیاڵیەکانیەوە[9].

دووەم دایــرەی فیکــر و مەعریفــە کــە بایــەخی تایبــەتی بــە دیــاردەی ئــەو گەشــە زۆرە دەدات بــۆ ئــەوەی دەوڵــەت بچێتە نــاو بــەڕێوەبردنی کاروبــاری کۆمەڵگەوە. دایرەی زانستی رامیاری گشتیە *Police seience*. ئــەو کەســەی گــەورەیی و پێشــڕەوایەتی خۆی نواندوە لە جێگیرکردنی بایەخدانی زانستیانە بــە زانســتی رامیــاری گشــتی لــە ســەرەتای ســاڵانی پــەنجادا. بیرمەنــدی ئــەمریکایی هارولــد لاســویل *H.D.lasswell* هەرچەندە سروشتی زانستی رامیاریی گشــتی لــە چوارچــێوە فیکــری و کردەییەکەیــدا پرەنسیپی زۆرە، بەڵام لاسویل تێز و شێوازەکانی لە گەلێك سەرچاوەی زانستی جیاوازەوە ڕەگاژوو کرد کــە بــیری سیاســی و کۆمەڵایــەتی و ئــابووری و بەڕێوەبردن و شتی تریش دەگرێتەوە.

تــەوەرە ســەرەکیەکانی زانســتی سیاســەتی گشتی پشت بە چالاکی دەبەستێت: دروستکردن و دانانی سیاسەتی گشتی، لێکۆڵینەوەی سیاسەت بە ئامــانجی دیــاریکردنی سیاســەتی ئەلتــەرناتیف و دەستخســـتنە ســـەر شـــتی دی بـــۆ پـــرۆژە حکوومەتیـــەکان، تـــەرخان کردنـــی داهـــات و دیــاریکردنی فاکتــەر و شــێواز و ئــەو ئامرازانــەی پێویستە جێبەجێ بکرێن، پاشان هەڵسەنگاندنی رامیــاریی گشــتی لــە پــێش و لــە کــاتی جێبــەجێ کردنیــدا، هــەروەها دوای تــەواوبوونی هــەموو قۆناغەکانی جێبەجێکردنیش.

## پەراوێزەکان

1–هارولد لاسكي: اصول السياسة، الجزء الاول، ترجمة محمود فتحي عمر و ابراهيم لطفي عمر، القاهرة، دار المعرفة، ص 46–51

2–د. عبدالخالق عبدالله، العالم المعاصر و الصراعات الدولية: عالم المعرفة 133 المجلس الوطني للثقافة و الفنون و الاداب 1989 ص .29

3–محمد علي محمد: دراسات في علم الاجتماع السياسي. الاسكندرية، دار الجامعات المصرية 1977 ص.155

4–د. علي شريف: الادارة العامة: النظرية و التطبيق، بيروت، دار النهضة للطباعة و النشر، الطبعة الثانية، ص .81

5–د. علي خليفة الكواري: نحو فهم افضل للتنمية

باعتبارها عملية حضارية. في التنمية العربية، الواقع الـراهن و المسـتقبل. بـيروت. مركـز دراسـات الوحـدة العربية 1984 ص .81

6-د. عبد الخالق عبدالله، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل .71

7-د. قسـطنطين زريـق: الـنهج العصـري: محتـواه و هويتـه، ايجابياته و سلبياته، المستقبل العربي. العدد 69 - نوفمبر 1984 ص .111

8-د. اسماعيــل صــبري عبـــدالله و اخـــرون: صـــور المســـتقبل العربـــي. بـــيروت، مركـــز دراســـات الوحـــدة العربيـــة. الطبعـــة الثانيـــة 1980 ص .13

9-محمـــود الفضـــل: الجهـــود العربيـــة في مجـــال استشراف المستقبل: نظرة تقويمية عالم الفكر. المجلد الثامن عشر - العدد 4 يناير، فبراير و مارس 1988 ص .52-51

## سەرچاوە

کتێبی: الدولة العصرية دولة مؤسسات: د. حسن ابشر الطيب ص 13-28.

# ئیسلام و دەوڵەتی مۆدێرن

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

ئیســـلام و دەوڵـــەتی مـــۆدێرن کتێبێکـــە لـــە نوسینی "عەبدولوەهاب ئەفەندی"یە.. نوسەری ئەم کتێبـە پێـی وایـە چـەمکی دەوڵـەتی ئیسـلامی وەك ئەوەی لە گوتاری ئیسلامی هاوچەرخدا هەیە, هیچ مانایـەکی نییـەو پێویسـتە دەسـت بـەرداری بـین. لەچوارچێوەی ڕەخنـەگرتنی لـە چـەمکی دەوڵـەتی ئیسـلامی, "عەبـدولوەهاب ئەفەنـدی" دەستنیشـانی دوو هۆکـار دەکـات کـە ئیسـلامگەرا هاوچـەرخەکانی دووچـاری قـەیران کـردووەو بۆتـە مایـەی ئـەوەی نـەتوانن خـەونیان لـە هێنانـە ئـارای دەوڵـەتێکی ئیسلامی بهێننـە دی. (نوسـەری ئـەم کتێبـە وای پـێ باشترە لـەبری چەمکی دەوڵـەتی ئیسـلامی دەوڵـەتی موسڵمانان بەکاربەرین). ئەو دوو هۆکارەش بریتین لـە: ڕۆحـی سازشـکاری و ڕیاکـاری ئـەو گروهانـە لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئـــەو ســـتەمکاریەی لەسەدەکانی ڕابردووەوە وەکو میراتیەك ماوەتەوەو لـە فیکـری نوێی ئیسلامیشدا گەشـەی کـردووە. بۆ نموونـــە ئەگـــەر ســـەرنجێکی خێـــرای بزاوتـــە ئیسـلامیەکانی ئـەم سـەردەمە بـدەین: (دەبیـنین کـە ئیسـلامیەکان بەسـەر چـەند گروهێکـی دژ بەیەکـدا دابـەش بـوون و هەریەکـەیان داکـۆکی لـە ڕژێمێکـی دکتاتۆری دەکەن کە لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن.. هەندێ گروهـی ئیسـلامی پشـتیوانی لـە ستەمکاری ئێرانـی دەکـەن، هەنـدێکی دیکەشـیان سـتەمکاری سـعودی یـاخود سـودانی و تەنانـەت عێراقیشـیان بـەلاوە پەسـەندە! ئەمـە لەکاتێکدا گروهێك شك نابـەین کـە سەرکۆنەی ستەمکاری بکات, ئیتر سەرچاوەی ئەو ستەمکاریە هەر چییەك بێت).

دووەمـــین هۆکـــار بـــەبڕوای "عەبـــدولوەهاب ئەفەنـدی" ئەوەیە کـە: (ئیسـلامیەکان ئەولەویـەتیان دا بـــە دژایـــەتیکردن و شـــەڕکردن لەگـــەڵ دوژمنـــە بیانیـــەکان و لـــەم پێناوەشـــدا قوربانیـــان دا بـــەو ڕیفۆرمـــەی پێویســـت بـــوو لـــەناوخۆی وڵاتـــەکانی خۆیاندا بکرێت). ئەم هەڵوێستەشیان بووە مایـەی زیادبوونی گەندەڵی ناوخۆیی و خراپ بەڕێوەبردنی وڵات و هاوکـات چاوپۆشـیکردنیش لـەو زوڵـم و ناهەقیانەی میللەت ڕووبەڕوویان دەبووەوە, ئەمەش بـــە بەهانـــەی ڕووبەڕووبوونـــەوەی هەڕەشـــە دەرەکیەکان. ئەمـە وایکـرد دوژمنـی نـاوخۆ بـێ هـیچ چاودێرو بەرەنگارییەك کاری خۆی بکات. نوسـەری

ئەم كتێبە پێی وایە دوژمنی ناوخۆ سەرچاوەی تەواوی خراپەكاریەكانی دیكەیە (ئەو دوژمنەی بە سەلامەتی جێمانهێشت, بەئومێدی ئەوەی بەسەر دوژمنە دەرەكیەكاندا زاڵبین).. باشترین نمونەیەكیش لەم ڕووەوە بارودۆخی شۆڕشی ئیسلامە لە وڵاتانی ئێران و سۆدان, لەم دوو وڵاتەدا شۆڕشەكانیان هێندەی نەمابوو لەبارچێت, ئەویش بەهۆی پشتگوێ خستنی كێشە ناوخۆییەكان و خۆخەریكردن بەدژایەتیكردنی دوژمنە دەرەكیەكانەوە (ئیتر دوژمنی حەقیقەتی بن یان دروست كراوە).

لەبەشێكی تری كتێبەكەیدا "عەبدولوەهاب ئەفەندی" باس لە ئیشكالیاتی دیكەی فیكری ئیسلامی هاوچەرخ دەكات, بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە بابەتی دەوڵەتەوە هەیە, ئەویش بەگەڕانەوە بۆ سەر بنەما تیۆریە ئیسلامیە تەقلیدیەكان كە باس لەچەمكی دەسەڵات و كەسی فەرمان ڕەوا دەكەن و گوێڕایەڵی و ملكەچی كردن لەلایەن میللەتەوە بۆ كەسی حوكمڕان بەكارێكی پێویست دەزانن, ئەویش لەترسی ئەوەی نەك ئاشوب و هەرا دروست ببێت. هەروەها ڕەخنە لەو بڕگەیەش دەگرێت كە ئەو تیۆریایە تەئكیدی لێدەكاتەوەو پێیوایە دەبێت كەسی فەرمانڕەوا لەڕووی زانست و تەگبیرو خواپەرستیەوە چاكترین كەسێك بێت. ئەو پێی وایە لەم تیۆریایەدا كەموكوڕیەكی زۆر هەیە كە بەرهەمی دەستی زانایانی ئیسلامەو دەكرێت زیاد لەشوێنێكەوە ڕەخنەی لێبگیرێت. یەكەم لەو ڕووەوەی كە پێیان وایە دەبێت خەلیفەی موسڵمانان چاكترین كەسێكی ئومەتی ئیسلامی بێت و لە هەموشیان داناتربێت و هەروەها لە سەركردایەتیكردن و ڕێنوێنیكردنی خەڵكدا شوێنی پێغەمبەر (د.خ) بگرێتەوە. ئەمە بۆ خۆی كارێكی هەڵەیە, چونكە دەبێتە مایەی ئەوەی خەڵكی نەتوانن لە كەسی فەرمانڕەوا بپرسنەوە, بەتایبەتی كاتێك ئەو خەڵكانە لەڕووی زانست و تەگبیرو خواپەرستیەوە كەمترین لە كەسی فەرمانڕەوا. لەلایەكی ترەوە, كێشەیەكی گەورە لەو مۆجیاریەدا هەیە كە زانایانی ئیسلام تەئكیدیان لەسەر كردۆتەوە, ئەویش ئەوەیە: (پێویستە لەسەر موسڵمانان گوێڕایەڵی تەواوی كەسی فەرمانڕەوا بكەن, بەمەرجێك ئەو كارەیان نەبێتە مایەی بێ گوێلیكردنی خواوەند).

"عەبدولوەهاب ئەفەندی" لێرەدا سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەكێشێت كە چەمكی (گوناە و بێ گوێلیكردنی یەزدان), چەمكێكی بەرتەسك و ئاڵۆزەو زانایانی ئیسلام پاوانكردنی دەسەڵات و بەكارهێنانی سەروەت و سامانی میللەتیان بەشێوەیەكی نارەوا لەلایەن حوكمڕانانەوە بەگوناهێكی گەورە نەداوەتە قەڵەم, گوناهێك كە پێویست بەوە بكات خەڵكی لێیان ڕاپەڕن و گوێڕایەڵی دەسەڵات نەكەن و تەنانەت شۆڕشیشیان لەدژ بەرپا بكەن.

لێرەوە ئەو پێی وایە كە پێكهێنەرەكانی تیۆریای ئیسلامی تەقلیدی سەرچاوەی هەموو ئەو ئیشكالیات و ناكۆكیانەیە كە لەناو فیكری نوێی ئیسلامیدا هەیە, هەروەها سەرچاوەی ناكۆكی زۆر لەڕەوتی ئەو دەوڵەت و خەلافاتی ئیسلامیەشە كە بەدرێژایی مێژوو لەئارادا بوون, بەجۆرێك مومارەسەكردنی حوكم شتێك بووەو ئەوەشی لەدەقە تیۆریەكاندا هەبووە شتێكی تر بووە.

جەوهەری تیۆری تەقلیدی ئیسلامی دەربارەی حوكمكردن ئەوەیە كە پاوانكردنی دەسەڵات شەرعیەتی فیعلی دەبەخشێتە كەسی فەرمانڕەواو فوقەهاكانیش پاساوی گوێڕایەڵی كردنی كەسی

فەرمانڕەوایان بەوە هێناوەتەوە کە ڕاپەڕین و شۆڕشکردن لەدژی دەسەڵاتی خەلیفە, بەڵاو ئاشوبی بەدواوەیە, زیاد لەوەی کە بەرامبەر ناهەقی و ستەمکاریەکانی بێدەنگی بکەین. لەمەش خراپتر ئەوەیە کە گەورە فوقەهاکانی وەك: "ئیمامی غەزالی و ئەلماوردی" گەیشتنە تیۆریزەکردن بۆ ئەوەی (نەك تەنها دەبێت لەگەڵ حوکمڕانێکی ستەمکاردا هەڵبکەین و بێدەنگی لەڕەفتارەکانی بکەین, بەڵکو پێویستە ئیعتراف بە شەرعیەتی دەسەڵاتیشی بکەین). لەو نمونانەی "عەبدولوەهاب ئەفەندی" دەیهێنێتەوە, بۆ نیشاندانی ئەو کەلێن و دورابیەی لەنێوان دەق و واقیعدا هەیە, ڕستەیەکی "عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان"ە, کاتێك یەکەم وتاری خۆی لە کەعبەدا دا, پاش دەست بەسەرداگرتنی شاری مەککە لەلایەن "حەجاج"ەوەو کوژرانی "عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر". لەو ووتارەیدا "عەبدولمەلیك" بە هەڕەشەیەکەوە ڕوودەکاتە گوێگرەکانی و دەڵێت: (ئێوەومانان ناچارمان دەکەن وەکو پیاوچاکان و ڕابەرانی بەر لەخۆمان ڕەفتار بکەین, کەچی ئێوە شوێن پێی ئەوان هەڵناگرن, سوێند بەخودا گوێم لە هەر کەسێك بێت بڵێت لەخوا بترسە, ئەوا لەگەردنی ئەدەم).

## چەمکی دەسەلات و خەلافەت

بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی "عەلی عەبدولڕازق" (ئیسلام و ئسولی حوکم), هەڵلایەکی فیکری گەورەی نایەوە کە تا ئێستاش کۆتایی نەهاتووە. "عەلی عەبدولڕازق" ئەوەی ڕەتکردەوە کە دەسەڵاتی سیاسی لە ئیسلامدا هەبێت و سوور بوو لەسەر ئەوەی دەسەڵاتی پێغەمبەر (د.خ), دەسەڵاتێکی ڕۆحی بووەو سستمی خەلافەت لەشەرعدا واجب نییەو هیچ دەقێك و دەلیلێکی شەرعیش ئەوە ناسەلمێنێ و پاڵپشتی ناکات, بەڵکو ئەم مەسەلەیە جێهێڵدراوە بۆ موسڵمانان تا بەئازادانە چی بەگونجاو دەزانن لەو بنەماو بەهایانەی لەکاروباری دنیاییاندا بەگشتی و لەبواری سیاسیدا بەتایبەتی بەکەڵکیان دێت, بۆ خۆیانی هەڵبژێرن و کاری پێبکەن.

"عەبدولوەهاب ئەفەندی" پێی وایە ئەو پەرچە کرداره توندەی لەدژی "عەلی عەبدولڕازق" دروست بوو, فیکری ئیسلامی لە مشتومڕێکی پڕ سوودو بەبڕشت بێبەشکرد کەدەیتوانی بەشێوەیەکی هەمەلایەن چاو بەبابەتی دەوڵەتی ئیسلامی بگێڕێت. لەو کاتەوە ئیتر فیکری ئیسلامی لەناو تیۆریا تەقلیدیەکاندا کۆتکراو نەیتوانی ڕووبەڕووی ئەو مەسەلەیە بێتەوە (وەکو ئەوەی لەفیکری ئیخوانەکاندا دەیبینین, هەر لە حەسەن بەنناوە تاسەید قوتب). کێشەکەش لەوەدایە کە ئەو دیدو بۆچونە تەقلیدیانە سەبارەت بە دەسەڵات و سستمی حوکمڕانی هاتۆتە بواری پراکتیزەکردنەوە, بەتایبەت لە ئەزموونی حوکمڕانی وڵاتانی وەك: (سۆدان و ئێران و ئەفغانستان)دا. هەروەها "عەبدولوەهاب ئەفەندی" ڕەخنەیەکی توند لە ئەزمونی بزاوتە ئیسلامیە هاوچەرخەکان دەگرێت و سەروەختێك دێتە سەر هەڵسەنگاندنی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی سەرکردە دیارەکانی شۆڕشی ئێرانی, پێی وایە ئەوانە نەبونە نمونەیەك کە چاویان لێبکرێت, بەڵکو ئەوانیش لە ململانێ و کێبڕکێی یەکتریدا بوون کە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ کێشەو ململانێی ئەو گروهانەدا نییە کە ئیسلامی نین.. سەرانی شۆڕشی ئێرانی تەنها لەسەر دەسەڵات و پلەوپایە لەگەڵ یەکتر بەشەڕ نەهاتن و بەتەنهاش پلانیان لەدژی یەکتری نەگێڕا

وەك هـەر كەسـانێكیتر، بـەڵكو كێشـەو ململانێیـان لـەپێناو دەسـكەوتی مادیـدا هـیچ جیاوازییـەكی لەگـەڵ بێباوەڕانـدا نـەبوو، تەنانـەت هەنـدێك جـار لـەوانیش بـەدتربوون. لەسـەروو هـەموو ئەمانەشـەوە فـەرمانڕەوایانی ئێـران، بـەردەوام بوون لەسەر خراپـەكاری و پێشێلكردنی مافەكانی مـرۆڤ و..هتـد، ئەمـەش وایكـرد ئـەزموونی ئێرانـی تەنانـەت لـەو ئەزموونـە ئیسـلامیە تەقلیدیانـەش خراپتربێـت كـە ئایـدیای شـیعەگەرایی بەتونـدی ئیدانەی دەكات.

بەكورتیەكی دەكرێت بڵێین شۆڕشی ئیسلامی و هەڵسـوكەوتەكانی، پرسـیارو گـرفتی دیكـەی سـەبارەت بـە فیكـرو پراكسیسـی ئیسـلامی هێنایـە گـۆڕێ، زیـاد لـەوەی چارەسـەر بـۆ ئـەو شـتانە بدۆزێتـەوەو كێشـەكان یـەكلایی بكاتـەوە. لەلایـەكی تـرەوە شۆڕشـی ئیسـلامی و مومارەسـەكردنی ئـەو شۆڕشـە، ئاشـكرایكرد كـە چ كـەلێنێكی گـەورە لـە تیۆریـای ئیسـلامی تەقلیدیـدا هەیـە، سـەبارەت بـە دەوڵەت و حوكمڕانی و ئەو تیۆرییایەش ناتوانێت لە ئاسـت پێداویسـتی كۆمەڵگـەی موسـڵماندا بێـت. گـرنگترین شـتێك شۆڕشـی ئیسـلامی لـەئێران دەریخسـتبێت، ئەوەیـە كـە هـەموو ئـەو دیسـپلینە دامودەزگاییـەی ئـەو تیۆرییایـە دیـاریكردووە بـۆ ڕێگـەگرتن لـە سـتەمكاری، شـتێكی ئـەوتۆ نییـە. نوسـەر هـەمان ئـەو ڕەخنانـە ئاراسـتەی ئـەزمونی ئیسـلامیەكانی سـودانیش دەكـات و دەڵێـت: (ئەزمونی سودان ئەو كەلێنە گەورەیـەی خستەڕوو كـە لـە چـەمكە تەقلیدیـە ئیسـلامیەكاندا هەیـە، بەتایبـەت لـەبواری سیاسـیدا. ئـەو ئەزمونانـە بەئاشـكرا سـەلماندیان كـە دەبێت بەباشـی بیر لـە تونـدكردنی ئـەو ڕێوشـوێنانە بكەینـەوە كـە بەمەبەسـتی كـۆنترۆڵكردنی مومارەسـەی سیاسـی دەگیرێتـە بـەر، هـەروەها پێویسـتە ڕۆڵـی دامودەزگاكـان كـاراتر بكرێـت، نـەك گرنگـی بـە كەسەكان بدرێت).

لـەڕێی ئـەزموونی _ ئێرانـی و سـودانی و ئەزمونـە هاوشـێوەكانی ئەوانـەوە_، "عەبدولوەهاب ئەفەندی" دەكەوێتە ڕەخنەگرتنی ئایدیای شەخس پەرسـتی و هۆگربـوون بەكەسـایەتیە كاریزمیەكانـەوەو چاوەڕێكردن لێیـان كـە گـۆڕانی ڕیشـەیی دروسـت بكـەن. ئـەو پێـی وایـە بیریـارە ئیسـلامیە هاوچـەرخەكان _ ئەگەرچـی وەهـاش خۆیـان نیشـان نادەن، بەڵام پڕبەدڵ ئارەزووی ئەو (ستەمكارە دادپەروەرە یاخود ئەو مەهدییە دەكەن) كە خواپەرستی و دادپـەروەرێتی تێدا بەرجەستە دەبێت و شوێن پێی پێغەمبەر (د.خ) هەڵدەگرێت، بەمەش سەرزەوی پڕ لە دادپـەروەری دەكات، پاش ئـەوەی نـوقمی سـتەم و نـاڕەوایی بـوو بـوو، لـەم كارەشـیدا پـەنا بـە پشـتیوانی و یارمـەتی ڕاستەوخۆی ئاسمان دەبەستێت.

دواتـر "عەبـدولوەهاب ئەفەنـدی" ڕەخنـەی ئەوەش لە ئیسلامیەكان دەگرێت ڕەزامەندن لەسەر ئـەوەی دەوڵـەتی یاسـایی مـافی ئـەوەی هـەبێت بـە ناچـاری شـت بەسـەر كۆمەڵگـەدا بسـەپێنی، بـەڵام هاوكات لەگەڵ ئەمەشدا بێباكن دەرهەق بە مافی تاكە كـەس و كۆمەڵگـە لـەوەی بەئازادانـە بـژین و هەڵسوكەوت بكەن.

لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: (گروهـە ئیسـلامیەكانی نـاو وڵاتـانی عـەرەب_ ئەگەرچـی لـە كـەمترین مـاف و ئازادییـەكان بێبەشـن_، بـەڵام كـە دەكەونـە كێشـە لەگـەڵ حكومەتەكانـدا لەبەرئـەم مەسـەلەیە نییـە، بـەڵكو لەبەرئەوەیـە كـە ئـەو حكومەتانـە هـەوڵی جـدی نـادەن بـۆ بچـوككردنەوەی ڕووبـەری ئـازادی ئـەوانی تـرو

بێبەشکردنیان لەمافەکانیان و دواجار سەرکوتکردنیان).

لێرەدا پێویست دەکات مەسەلەکەی "د. نەصر حامد ئەبو زێد" لە میسرو گروپەکانی فەرمانکردن بە چاکەو نهیکردن لە خراپە لەولاتی عەرەبستانی سعودی و ڕەفتاری گروپە ئیسلامیەکانی ئێرەو ئەوێ، بە نمونە بهێنینەوە؟

مرۆڤ هێندەی بەسە لاپەڕەی ئەو ڕۆژنامە ئیسلامیانە بخوێنێتەوە کە لەولاتانی عەرەبیدا دەردەچن، تا بزانێت چەند بێ بایەخانە داکۆکی لە ئازادی ئیسلامیەکان و کەسانی تر دەکەن، لەکاتێکدا گرنگی زۆر بەو مەسەلانە دەدەن کە ڕووبەری ئازادیەکان تەسکتردەکەنەوە، وەکو هێرشکردنە سەر ئەو ئاهەنگی مۆسیقیانەی ساز دەکرێن یاخود باسکردنی کچێك کە مەدەنی پۆشەو لەچکی بەسەردا نەداوە.. هەموو ئەمانە پێمان دەڵێن ئامانجی ئەم بزاوتە ئیسلامیانە سەندنەوەی ئەو مافەیە لە هاوولاتی کە ئازادی ئەوەی هەبێت گوناهێك بکات، تەنانەت ئەگەر ئازادی ئەوەشی نەبێت کە بەپلەکانی فەزیلەتدا سەرکەوێت..

دواجار "عەبدولوەهاب ئەفەندی" لەم کتێبەیدا (ئیسلام و دەوڵەتی مۆدێرن) دەگاتە ئەوەی بڵێیت: (چەمکی دەوڵەتی ئیسلامی)، ئەو چەمکەی گوتاری نوێی ئیسلامی باسی لێدەکات، نەك هەر تەنها پێویستی بەپێداچونەوەیەکی گشتی و هەمەلایەن هەیە، بەڵکو پێویستە لەزاراوەکانی گوتاری سیاسی وەدەربنێین، بۆ ئەوەی تەندروستی و ئەقلانیەت بگەڕێتەوە بۆ ئەم گوتارە. چاکترین ئەلتەرناتیڤی چەمکی (دەوڵەتی ئیسلامی)، ڕەنگە دەوڵەتی موسڵمانان یاخود قەوارەی سیاسی ئیسلامی بێت، یان هەر دەستەواژەیەکی دی کە ڕەنگدانەوەی ئەو حەقیقەتە بێت کە ئەو دەوڵەتەی پێویستە موسڵمانان هەوڵ بۆ هێنانە ئارای بدەن، مۆدێلێکی دیاریکراو نییە لەسەرەوە بۆمان بێتە خوارێ، بەڵکو شتێکە بەرهەمی ئیرادەی ئازادانەی نەتەوەیەو بەویست و خواستی تاکەکەس و گروهە جیاجیاکانی ئەو کۆمەڵگایە دێتە بەرهەم.

## سەرچاوە

ماڵپەڕی (الجزيرة نت).

# بەجیهانیبوون و دەوڵەت

جەلال ئەمین
لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

## یەکەم
## بەجیهانیبوون دیاردەیەکی کۆنە یاخود نوێ؟

بەکارهێنانی دەستەواژەی بەجیهانیبوون (*Globalization*) لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا بەربڵاوبوو, بەتایبەتی پاش داڕمانی یەکێتیی سۆڤییەت, ئەگەرچی ئەو دیاردەیە بەو ڕادەیە نوێ نییە کە دەستەواژەکە هێمای بۆ دەکات, چونکە توخمە سەرەکییەکانی بیرۆکەی بەجیهانیبوون: زۆربوونی پەیوەندیی ئاڵوگۆڕکاری نێوان نەتەوەکان" جا ئاڵوگۆڕکردنی کاڵاکان بێت یاخود خزمەتگوزارییەکان, گوێزانەوەی سەرمایە داراییەکان, بڵاوبوونەوەی فیکرو زانیارییەکان, کاریگەربوونی نەتەوەیەك بە بەهاو دابونەریتەکانی نەتەوەکانی دیکە, چەندین سەدەیە دنیا پێیان ئاشنایە, بەتایبەتی لە سەردەمی دۆزینەوە جوگرافییەکانی کۆتایی سەدەی پانزەهەمەوە, واتە نزیکەی پێنج سەدە. لەو کاتەوە پەیوەندییە ئابووری و کولتوورییەکانی نێوان دەوڵەت و نەتەوەکان لە بەهێزبووندایە, بەدەر لە ماوەیەکی کورت کە دەوڵەتەکان گۆشەگیربوون و چوونەتەوە خۆیان و تێکڕای بازرگانی نێودەوڵەتی و گوێزانەوەی سەرمایەی دارایی پاشەکشەیکرد (بۆ نموونە: ئەوەی لە سییەکانی ئەم سەدەیەدا ڕوویدا). هەروەها بێجگە لە چەند کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو کە دنیا گۆشەگیریانکردن یاخود خۆیان لەبەر ئەم یان ئەو هۆیە خۆیان لە جیهان دابڕی (وەك ئەوەی لە سی ساڵی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر/ تشرینی یەکەم لە یەکێتیی سۆڤییەت ڕوویدا, یان ئەوەی پەنجا و شەستەکانی چین و ناوەڕاستی ئەم سەدەیەی یەمەن..هتد).

کەواتە دیاردەکە بەلای کەمەوە تەمەنی پەنجا ساڵ دەبێت و سەرەتاو سەبەبێی بەتوندی گرێدراوی گەشەکردنی تەکنۆلۆژیای پەیوەندی و بازرگانییە, هەر لە دۆزینەوەی قیبلەنماوە بیگرە

تاکو دەگاتە مانگە دەستکردەکان. پێویستە دەرك بەم ڕاستتیە بکرێت و جەغتی لەسەر بکرێتەوە, بەڵام گرنگیشە دان بەوەدا بنێین کە لە سی ساڵی دواییدا گۆڕانکاری گرنگ و نوێ بەسەر ئەو دیاردەیەدا هاتووە, لەوانە:

1–دارمانی ئەو شورە بەرزانەی هەندێك نەتەوەو کۆمەڵگە بەهۆیەوە خۆیان لە بەجیهانیبوون دەپاراست و ڕاپێچکردنی ناوچەی گرنگی ئەم جیهانە, کە بەم یان بەو ڕادەیە دابڕاوبوو, لەلایەن شەپۆلی بەجیهانیبوونەوە. بێگومان گرنگترینی ئەو نەتەوانە, نەتەوەکانی ئەوروپای خۆرهەڵات و چین بوو کە گۆشەگیریی خۆویستەکیان کۆتاییهات, یاخود بەم یان بەو شێوازە ناچارکران دەست لە گۆشەگیری و دابڕان هەڵبگرن.

2–زۆربوونی بێشوماری پلەی هەمەڕەنگیی ئاڵوگۆڕکردنی کاڵاو خزمەتگوزارییەکان لەنێوان نەتەوەکاندا, هەروەها هەمەڕەنگیی ئەو بوارانەی وەبەرهێنان کە سەرمایە داراییەکان لە وڵاتێکەوە بۆ ئەوی دیکە ڕوویانتێدەکەن. بەو جۆرە, وەك ئەوەی لە سایەی کۆڵۆنیالیزمی نوێدا ڕوویدەدا, چیدی شت ناردنەدەرەوەی دەوڵەتێکی "تازەپێگەیشتوو" تەنیا لە بواری کەرەستەیەکی خاودا گیرناخوات, هاوردنەکانیشی لە ژمارەیەکی دیاریکراوی کاڵادا قەتیس نابێت و وەبەرهێنانی بێگانەش لە بواری بەرهەمهێنانی ئەو کەرەستە خاوەو گەشەپێدانی ژێنگەی بنچینەیی پێویست بۆ ئەو بەرهەمهێنانە پەنگناخواتەوە, بەڵکو ئەو ناردنەدەرەوەو هاوردنانە زۆرو هەمەڕەنگ بوون, هەروەها ئەو بوارانەی سەرمایەی دارایی بۆ بەدەستهێنانی دەرفەتی قازانج ڕوویانتێدەکات, زۆرو فرەجۆر بووە.

3–ڕیژەی دانیشتوان لەناو هەر کۆمەڵگەو نەتەوەیەکدا, کە کار لە جیهانی دەرەوە دەکات و لەلایەن ئەویشەوە کاری تێدەکرێت,لە ڕادەبەدەر زیادیکردوە. بۆ نموونە, میسر لە دوو سەدەی پێشوودا بە ماوەی وەهادا تێپەڕیوە کە ڕێژەی بازرگانی دەرەکی بە بەراورد لەگەڵ داهاتی نەتەوەیی لەوەی ئێستا زیاتر بوە, تێکڕای لێشاوی سەرمایەی داراییش بە بەراورد لەگەڵ تێکڕای وەبەرهێنان لەوەی ئێستا زۆرتربوە, کەچی ڕێژەی دانیشتوان زۆر کەم لەژێر کاریگەریی ئەو پەیوەندییە نێودەوڵەتیانەدا بووەو زۆرینەی دانیشتوان, تەنانەت ئەوانەش کە بەشداربوون لە بەرهەمهێنانی کاڵای سەرەکیی ناردنەدەرەوەدا: (لۆکە), لە شێوەی ژیان و بیرکردنەوەدا دابڕاوبوون لە دنیای دەرەوە. ئەگەرچی ئەوە وەك خۆی نەمایەوەو 1/6ی (شەش یەکی) دانیشتوان ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ تەنیا لە گەشتوگوزار سودمەندبوون و ڕێژەیەکی هاوشێوەش پارەیان لەو کەسوکارانەوە بۆ دەهات کە لە دەرەوەی میسر کاریاندەکرد, کەچی هاوردەکان چووە ناو هەموو ماڵێکەوە, تەنانەت ماڵی هەژارترین جوتیارەوە, جا لە تەلەفزیۆنەوە بیگرە تا دەگاتە جلشۆری کارەبایی و سەلاجەو پانکە.

4–هەتا ماوەیەکی نزیك ئاڵوگۆڕکردنی کاڵاو سەرمایەی دارایی توخمی زاڵبوو بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتەکاندا, ئینجا ئاڵوگۆڕکردنی فیکرو زانیارییەکان بوە توخمی زاڵی پەیوەندییەکە, یاخود بوە ئەو توخمەی بەخێراییەکی زۆر گەشەدەکات. کەواتە سی ساڵی دوایی, ئەو سەردەمە بوو کە تیایدا هاوردنی فیکرو بەهاکان پشتبەستوونەبوو بە قەبارەی بازرگانی یان قەبارەی شاڵاوی کەسەکان یان سەرمایە داراییەکان, بەڵکو هاوردنێکی ڕاستەوخۆ بوو لە ڕێگەی پەیوەندیکردن بە سەرچاوەی ئەو

فیکــرو بەهایانـــەوەو تەنانـــەت لـــە شـــوێنی ئارامگرتنی خۆیاندا.

5–کۆمپانیـا فرەڕەگـەزەکان ( *Transnational Corporations*) چـالاکترین‌و کـاراترین ئـامرازی مسـۆگەرکردنی گوێزانـەوەی کالاکـان، سـەرمایە داراییەکان، فیکرو زانیارییەکانە، بەڵکو بالادەستە لە بواری ئەو گوێزانەوەیەدا. ئەو پەیوەندییانەی نێوان نەتەوەو دەوڵەتەکان بۆ چەندین سەدە لە ڕێگـەی ئـەو کۆمپانیایانـەوە ڕووی‌ـدەدا کـە بەنێودەوڵەتی ناودەبرێن، بەڵام چالاکییان تەنیا لە سنووری چەند دەوڵەتێکی دیاریکراودا بوو، یان لە نێوان دەوڵەتی بنچینەیی‌و دەوڵەتی کۆلۆنیکراودا بـوو، وەك ئـەوەی کۆمپانیـا فرەڕەگـەزەکان ئیمـڕۆ ئەنجامیدەدەن، هەموو دنیای نەدەتەنیەوە، جا ئەمە لە بواری بەدەستهێنانی خزمەتگوزاریدا بێت یان دابەشـکردنی پرۆسێسـەکانی بەرهـەمهێنان یاخود ساخکردنەوە.

6–ئەوە خەسڵەتەی لەم باسەماندا گرنگە، ئەو گۆڕانکارییـە هەسـپێکراوەیە کـە لـە دەیـان سـاڵی دواییدا بەسەر شوێنگەی دەوڵەت لە پەرەسەندنی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگەکاندا هاتوە.

سـەرەتای بـەجیهانیبوون، بـەر لـە پێـنج سـەدە (ئەگـەر بەڕاسـتی بکرێـت سـەرەتایەکی بـۆ دیاریبکرێـت)، گرێـدراوی سـەرهەڵدانی دیـاردەی دەوڵـەتی نەتـەوەیی بـوو، چـونکە لـەو کاتـەدا گەشـەکردنی تـەکنۆلۆژی‌و زۆربـوونی بەرهـەمهێنان پێویسـتی بـە فراوانکردنـی سـنووری بـازاڕ هـەبوو هەتا سەرتاپای نەتەوە بگرێتەخۆی. ئەمە لەکاتێکدا کـە پێشـتر بـە سـنووری ناوچـە یـان هـەرێمێك دیاریکرابوو. بەو جۆرە دەوڵەت جێی دەرەبەگایەتی گرتـەوە، پادشـا شـوێنی دەرەبـەگی گرتـەوە، لایـەنگریی دەوڵـەت‌و پادشـا شـوێنی لایـەنگریی ناوچـەو دەرەبـەگی گرتـەوەو چـیتر "پادشـا"، وەك ئـەوەی لـە سـایەی سیسـتەمی دەرەبەگایەتیـدا ڕوویدەدا، کەسایەتیەکی پەراوێزکراوو گاڵتەپێکراو نەبوو، بەڵکو شایانی ڕێزلێگرتن بوو و"بوە سێبەری خـودا لەسـەر زەوی"و خـاوەن دەسـەڵاتگەلی ڕاستەقینەو ئامرازگەلی تەواو بۆ کارپێکردنی ئەو دەسـەڵاتانە. هـەروەها پەرەسـەندنی تـەکنۆلۆژی‌و زۆربـوونی بەرهـەمهێنان پێویسـتی بـە هەڵمەتبردنـە سـەر بـازارە دەرەکییـەکان هـەبوو. ئەمـەش پێویستیکرد دەوڵەت سوپایەکی بەهێزی هەبێت بۆ کێبڕکێکـردن لەگـەڵ دەوڵەتـەکانی تـرو لـەپێناو بەدەستهێنان‌و پاراستنی بازاڕگەلی دەرەکیی نوێدا، واتە ناوچە کۆلۆنیکراوەکان. قەبارەی بازاڕەکان لە یـەکێك لـە قۆناغەکانـدا گـەرەك بـوو بـۆ سـەرهەڵدان‌و پەرەسـەندنی هێـزی دەوڵـەت، بـەڵام پەرەسـەندنی قەبارەی بازاڕیش لە دەیان ساڵی دواییدا بوە هۆی دەرکـەوتنی سـەرەتای پاشەکشەی هێـزی دەوڵـەت. ئەمـەش هـۆی ئـەو لاوازی‌و پەککەوتەییەیـە کـە وردەوردە بەدیمـەنی پادشـا یـان سـەرۆکەوە دەبینری‌و پێدەچێت هێزگەلی دیکە هاتبنەئاراوە کە لەوان بەهێزترن‌و ئەگەرچی لە پلەی خۆیاندا ماون‌و بریقـەداری کەسـێتی تەقلیـدیان پاراسـتوە، بـەڵام لەڕاستیدا بێ هێزو دەسەڵاتن.

وەك چۆن پـێش پێـنج سـەدە دەوڵـەت وردەوردە شـوێنی دەرەبەگایـەتی گرتـەوە، ئیمـڕۆش کۆمپانیـا فرەڕەگەزەکان وردەوردە شوێنی دەوڵەت دەگرنـەوە، لێرەشـدا هۆکارەکـە هـەر هـەمان شـتە: گەشـەکردنی تـەکنۆلۆژی، زۆربـوونی بەرهـەمهێنان‌و پێویسـتی بوونی بازاڕی فراوانتر. واتە چیتر سنووری دەوڵەتی نەتەوەیی سنووری بازاڕی نوێ نییـە، بەڵکو گشت دنیا بۆتە بواری ساخکردنەوە، جا ساخکردنەوەی کـالای تـەواو دروسـتکراوبێت یـان سـاخکردنەوەی

پێداویستی و توخمەکانی بەرهەمهێنان و ساخکردنەوەی فیکرو زانیارییەکان. بەو جۆرە کۆمپانیای بەرهەمهێن بازیدا بەسەر شورەکانی دەوڵەتداو ئەو شورانە بەهای بەکردەوەی خۆیان لەدەستداو زیاترو زیاتر بوونە شورەی ڕواڵەتکار، جا ئەوە لە بواری ئاستەنگە گومرگییەکاندا بێت یان سنووری کارپێکردنی سیاسەتگەلی دراوو دارایی، دەسەڵاتی سیاسی، بڵاوکردنەوەی فیکرو زانیارییەکان و لایەنگری و گوێدێری. ئەو کۆمپانیایانە، بەهۆی وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆ لەناو ئەو دەوڵەتەی هەڵمەتیان بۆ دەبات یان لە ڕێگەی ڕێککەوتنامەی هاوشێوەی گاتەوە، سنوورە گومرگییەکان دەبەزێنن. هەروەها ئەو کۆمپانیایانە لە ڕێگەی خۆدزینەوە لە سیاسەتگەلی دراوو دارایی دەوڵەتەوە یان بەهۆی توانای سەپاندنی هەر سیاسەتێکەوە کە بیانەوێ بەسەر خودی دەوڵەتدا، وەك ئەوەی پێیدەوترێ بەرنامەکانی جێگیرکردنی ئابوری و چاکسازیی هەیکەلی، دەتوانن سنووری سیاستەگەلی دراوو دارایی ببەزێنن. سەبارەت بە سنووری دەسەڵاتی سیاسیش، ئەوا ئەو کۆمپانیایانە وەك ڕابردوو (ئەگەر پێویست بووبێت دەوڵەتێك بە یەکێکی دی بگۆڕێت) بە هەڵمەتبردنی چەکدارانە ئەنجامی نادەن، بەڵکو لە ڕێگەی گۆڕینی سەرۆکێك بە سەرۆکێکی تر، ڕابەرێك بە ڕابەرێکی دی یاخود بەهۆی هێشتنەوەی هەمان سەرۆك یان ڕابەرو ناچارکردنی بە گرتنەبەری ڕێگەی ویستراو ئەنجامدەدەن. دەربارەی سنووری بڵاوکردنەوەی فیکرو زانیارییەکانیش، ئەوا لە ئەستۆی سێتەلایتەکان و مۆنیتەری کۆمپیوتەرەکانە. لەبارەی سنووری لایەنگری و گوێدێریشەوە، ئەوا بێجگە لەوەی بەشێوەیەکی سروشتی و هەنگاوبەهەنگاو، ئەنجامی گۆڕانی سەرچاوەی پارەپەیداکردن و قازانجکردن، وەلاوەدەنرێت، ئەوا لە ڕێگەی کۆششی هۆشمەندی مەبەستداریشەوە بیروڕاگەلی وەهاوە دەهێنرێتەئاراوە کە لایەنگری کۆن: لایەنگری نیشتیمان یان نەتەوە لەناودەبەن و لایەنگری نوێ لە شوێنیان دەدەنێن، وەك بیرۆکەی "کۆتایی ئایدیۆلۆژیا"، "کۆتایی مێژوو"، "گوندی جیهانی" و "پشتپێکبەستنی دوولایەنە"..هتد کە دەشێت لەگەڵ هەموو نەتەوەکان بەکارببرێن، یان بیرۆکەی "ڕۆژهەڵاتی ناوەراستبوون" و دەربڕینی ئەوەی ئێمە "عەرەب نیین، بەڵکو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیین"..

کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان بەتەنیا ئەم گۆڕانکاری و دەستکارییانە ناهێننەئاراوە، بەڵکو پەنادەبەن بۆ کۆششی دامودەزگاو دامەزراوەکانی تر، لەوانە: دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتیەکانی وەك سندوقی دراوو بانقی نێودەوڵەتی، دامودەزگا جۆربەجۆرەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان کە لە بوارەکانی پەرەپێدان و کولتووردا کاردەکەن، دامودەزگاکانی موخابەرات لە دەوڵەتە مەزنەکان، ئامڕازە جۆربەجۆرەکانی کاریگەریخستنە سەر ڕای گشتی، وەك ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەلکترۆنی و تۆڕەکانی تەلەفزیۆن و دامەزراوەکانی بەخشینی خەڵاتە نێودەوڵتیە گرنگەکان یاخود ئەوانەی لە بواری مافەکانی مرۆڤدا کاردەکەن..هتد. هەروەها ئەو کۆمپانیایانە کۆششدەکەن بۆ خستەگەڕی بیریارو نووسەرانی وڵاتە جۆربەجۆرەکان بۆ تیۆریزەکردن و بانگەشەکردن بۆ بیروڕاکانی بەجیهانیبوون و بەگەردوونیبوون و جەغت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لایەنگری بۆ نەتەوە یان نیشتمانێك لە پاشماوەکانی ڕابردوون و چاکترە فەرامۆش بکرێن و لەبیربکرێن.

بێگومـان ئـەم دیمەنـە گشـتییە لـە یەکـەمین چرکەسـاتەوە سەرنجڕادەکێشـە, مەبەسـت دیمـەنی پاشەکشەکردنی گشتیی ڕۆڵی دەوڵەتو لاوازبوونی شکۆمەندیی و دەستهەڵگرتنی وردەوردەی لە پایـەی خۆی بۆ دامەزراوگەلی تر کە ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزدەبن, ئەوانـەش کۆمپانیـا کەتـە فرەڕەگـەزەکانن. گومـانی تێدانییە ئەم وێناکردنە گشتییە ڕاستە, بەڵام نابێت بەتەنیا پێی قایل بین, بەڵکو پێویستە قوڵبینەوە بۆ دۆزینـەوەی ڕاستیی ئـەوەی بەسـەر دەوڵـەت دێـت: ئایـا ئـەو پاشەکشـەیە هـەموو فرمانـەکانی دەوڵـەت دەگرێتەوە یـان پەیوەندیی بە هەندێکیانەوە هەیە؟ ئایا ئەو پاشەکشەیە هەموو دەوڵەتـەکان دەگرێتـەوە یـان زیـاتر هەنـدێك دەوڵـەت دەگرێتـەوە؟ ئایـا پاشەکشـەی دەوڵـەت لـە وڵاتێك هاوشـێوەی ئـەوەی وڵاتێکـی دیکەیـە؟ لـە کۆتاییشـدا ئایـا پاشەکشـەی ڕۆڵی دەوڵەت بۆ ئێمەی عەرەب چ واتایەکی هەیە؟

## دووهەم

## پاشەکشەی هێزی دەوڵەت یان گۆڕانی فرمان؟

ڕامـان لـەوەی بەسـەر ڕۆڵـی دەوڵەتـدا هـاتوە, لـە کـاتی دەرکـەوتنی سـەردەمی دەوڵـەتی نەتەوەییـەوە پێش پێنج سەدە, ئەوەمان بۆ دەردەخـات ئەو ڕۆڵـە لە سەردەمێکەوە بۆ یـەکێکی دیکە هەمیشـە ڕوو لـە گـۆڕان بـوەو ئـەوەی ئێسـتاش ڕوودەدات دەشـێت وەك گۆڕانی ڕۆڵـی دەوڵـەت تێبڕوانـرێ و دەشـکرێت وەك پاشەکشەی گشتی و لاوازی سەیرییبکرێت.

مـارکس بەهەڵـەدا نەچـووبوو کاتێـك دەیـووت, دەوڵـــەت هەمیشـــە ئـــامرازی دەســـتی چـــینە چەوسێنەرەکانە بۆ زاڵبوون بەسەر چینەکانی تردا, یان ئامرازی چینە باڵادەستەکانە بۆ هێنانەدیی ئەو ئامانجانـەی هێنانـەدییان پێویستی بەبەکارهێنانی ئـەم یـان ئـەو شـێوەی زۆربۆهێنـان هەیـە, بـەڵام هەڵسـانی دەوڵـەت بـە خزمـەتکردنی چـینە باڵادەسـتەکان هەمیشـە پێویسـتی بەئەنجامـدانی هـەمان کارگـەل و جێبـەجێکردنی هـەمان فرمانگـەل نییە, یاخود بەلای کەمەوە بەهەمان پلە پێویستی بە هەموویان نییە. دواتریش فرمانەکانی دەوڵەت بە درێژایی سەردەمەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتوە, یان بـەلای کەمـەوە بـەگۆڕانی هەلومەرجـەکان گـۆڕان بەسەر گرنگیی ڕێژەیی هەریەکێکیاندا هاتوە.

پێویسـت بـوو دەوڵـەت لـە سـەردەمی سەرمایەداریی بازرگانیدا, کە سەردەمی دەرکەوتنی دەوڵـەتی نەتـەوەیی بـوو, چـالاکانە دەسـتوەرداتە ئـابووریی نەتـەوەیی تـازە پەیـدابوو. پێویسـت بـوو سـەرەتا بەیەکخسـتنی بـازاڕی نەتـەوەیی, ئـەو ئابوورییە نەتەوەییە دامەزرێنێ, ئینجا کۆسپەکانی بـەردەم گوێزانـەوەی کاڵاکـان لـە ناوچـەیەکەوە بـۆ ئـەوی دیکـە لابـرێن و ئاسایشـی پێویسـت بـۆ ئـەو گوێزانەوەیە مسۆگەربکرێت, ڕێگـەی دروستبکرێ و جۆگـە هەڵکەنـدرێ, شـورەیەکی گـومرگی بـە چـواردەوری دەوڵەتـدا بنیـاتنرێ بـۆ پاراسـتنی پیشەسـازیی تازەپێگەیشـتوو لـە کێبڕکێـی ئـەو دەوڵەتانـەی هاوکـات بەهـەمان کـار هەڵدەسـتان. هـەروەها دەوڵەتـەکان چالاکانە دەستیانوەردەدایە خـودی پرۆسێسـی بەرهـەمهێنان و ئـەو مەرجانـەیان دەسـەپاند کـە پێویسـت بـوو لـە بەرهـەمهێنانی کاڵا پیشەسـازییەکاندا ڕەچـاوبکرێن. شـان بەشـانی ئەوانە, سوپای بەهێزیان دادەمەزراند بۆ کردنـەوەی کۆڵـۆنیی نـوێ بەمەبەسـتی سـاخکردنەوەی بەرهەمەکانی خۆیان.

لـە سـەردەمی شۆڕشـی پیشەسـازیدا ئـەوە پێویسـت نـەبوو, بۆیـە ڕۆڵـی دەوڵـەت لـە ڕوی دەسـتێوەردانی ڕاسـتەوخۆوە لـە پرۆسێسـی بەرهەمهێنانـدا پاشەکشـەیکردو گونجاوتربوو ئەوە

بۆ بڕیاری خودی خاوەنکارەکان جێبهێڵرێ. هەروەها ڕۆڵی دەوڵەت لە بواری پاراستنی بەرهەمهێنەکانی خۆی لەدەست کێبڕکێی دەرەکی پاشەکشەیکرد, بەتایبەتی لەو دەوڵەتانەی ئەنجامی باڵادەستبوونی خۆیان بەسەر ئەوانی دیکەدا سڵیان لە کێبڕکێ نەدەکردەوە. بەو جۆرە دروشمی "ڕێگەی بدەرێ کاربکات, ڕێگەی بدەرێ تێپەڕێ" بەرزکرایەوە, کە مەبەستی ئەوە بوو دەوڵەت واز لە بەرهەمهێنەکان بهێنێ و ڕێگەبدات بازرگانی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی ئازادبێت. وێڕای ئەوانە دەوڵەت بەردەوامبوو لەسەر فرمانی بەرەنگاربوونەوەی هەر هەوڵدانێك بۆ بەرزکردنەوەی کرێکان. دەوڵەت بەوەفا مایەوە بۆ پەیامی هەمیشەیی خۆی, کە خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی چینە باڵادەستەکان بوو, بەڵام کاری گونجاوی لە کاتی گونجاودا ئەنجامدەدا. کاتێکیش سەردەمی کۆلۆنیالیزمی نوێ لە نیوەی دوەمی سەدەی پێشوو و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هاتەئاراوە, دەوڵەت بازووی خۆی نیشانداو هەڵسا بە ئەنجامدانی ئەرکی نوێی ویستراو کە بریتیبوو لە: لەشکرکێشی بۆ کردنەوەی کۆلۆنیی نوێ و داگیرکردنی وڵاتی دوورەدەست و چونە جەنگەوە بۆ ڕێگرتن لەوەی دەوڵەتەکانی تر لەبری ئەو کۆلۆنی بەدەستبێنن یان وڵاتی دیکە داگیربکەن. هاوکات ئەرکی خرۆشاندنی هەستی نیشتیمانی و چەسپاندنی هەستی لایەنگری بۆ نەتەوەو دەوڵەتی گرتەئەستۆو هەڵسا بەوێناکردنی بەرژەوەندییەکانی چینێك وەك بەرژەوەندیی نەتەوەیەك, ئەمەش بۆ ئاسانکاریکردن بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی لەئەستۆی بوون. بێگومان لەم ماوەیەدا دەوڵەت بەردەوامبوو لەسەر چەوساندنەوەی چینی کرێکاران, ئەگەرچی ئەنجامی ئەو زیادەبەرهەمەی کۆلۆنیەکان بەدەستیانهێنابوو ڕێگەی بە هەموولایەك (خاوەنکارو کرێکاران) دابوو ئاستی بژێویی خۆیان بەرزبکەنەوە. ئینجا دەوڵەت ڕێگەی بە سەندیکاکانی کرێکاران دا سەرکەوتنی هەستپێکراو بەدەستبێنن و ڕێگەی بە پلەیەکی بەرزتری دیموکراتی سیاسی دا کە هەلومەرجی جیاواز ڕێگەی پێ نەدەدا.

دۆخەکە نەگەیشتە ئەو ئاستەی دەوڵەت سەرلەنوێ داهات لە بەرژەوەندیی چینەکانی خوارەوەدا دابەشبکاتەوە, چونکە کۆلۆنیالیزم هەستا بە بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی ئەو چینانە بێ ئەوەی دەستوەرداتە دابەشکردنەوەی داهات. کاتێك هێزی بەرهەمهێنانی دەوڵەت لە کۆتایی یەکەمین جەنگی جیهانیەوە پەرەیسەندو چیتر بازاڕی نیشتیمانی و بازاڕەکانی دەرەوە لە توانایاندا نەما لەخۆیبگرن, ئەو دەستتێوەردانە بوە کارێکی گرنگ, چونکە بەبێ دابەشکردنەوەی داهات لە بەرژەوەندیی چینەکانی خوارەوەدا, ئەو بازاڕانە بەس نەبوون بۆ لەخۆگرتنی ئەو زیادبوون و پەرەسەندنە. بەو جۆرە دەوڵەتی کینزی و دەوڵەتی ڕۆزڤێڵت (دەوڵەتی خۆشگوزەرانی) سەریهەڵدا کە شێوازەکەی لە سییەکانەوە تاکو کۆتایی شەستەکان بەردەوامبوو. ئەو دەوڵەتەی بێگومان بەهێزبوو, بەردەوامبوو لەسەر لەشکرکێشی و خرۆشاندنی هەستی نەتەویی و لایەنگری نیشتیمان (بەتایبەتی پێش و لەکاتی دوەمین جەنگی جیهانیدا), بەڵام ئیتر چەوساندنەوەی کرێکاران یەکێك نەبوو لە ئەرکە بنچینەییەکانی, بەڵکو بەپێچەوانەوە خەسڵەتە بنچینەییەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی بریتیبوو لە نازهەڵگرتنی کرێکاران و گوێدان بەویستی سەندیکاکانیان, چونکە ئەوە

یەکێك بوو لە پێداویستییەکانی ساخکردنەوەی فراوانی بەرهەمە ڕوو لە زۆربوەکانی.

وێڕای دابەشکردنەوەی داهات لە بەرژەوەندیی چینەکانی خوارەوەدا، یەکێك لە پێداویستیەکانی ساخکردنەوەی فراوانی بەرهەمەکان ئەوەبوو دەوڵەت لە ئاستێکی فراواندا ئەرکی کڕیاریش بگرێتەئەستۆی خۆی. بەو جۆرە دەوڵەت خۆی بوە سەرچاوەیەکی گرنگی داواکاری بەرهەمە ڕوو لەزۆربوەکان و هەندێك لە پیشەسازییە بنچینەییەکان بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمەکانی خۆیان پشتیان بەو داواکاریانە دەبەست کە ڕاستەوخۆ لەلایەن دەوڵەتەوە دەهاتن. ئەمەش پێویستی بە سیاسەتێکی دارایی چالاك و کارامە هەبوو کە خۆی لە بەرزکردنەوەی ئاستی دەستکەوت و خەرجییە حکومییەکاندا دەبینییەوە. ئەمە وێڕای سیاسەتێکی دراوی چالاك کە دەوڵەت لە ڕێگەیەوە کاریگەریی دەخستە سەر قەبارەی وەبەرهێنان و بەکاربردن.

نزیکەی سی ساڵێکە ئەنجامی گەشەکردنی تەکنۆلۆژی لەلایەك و لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە پێشەسازییانەی ئەنجامی دوەمین جەنگی جیهانی دووچاری کاولکاریی زۆر ببوون سەرکەوتوانەو سەرلەنوێ بێنەوە گۆڕەپانی کێبڕکێکردن لەسەر بازاڕەکان و کەرەستە خاوەکان، گۆڕانێکی گرنگ بەسەر پێداویستیەکانی بەرهەمهێنەکاندا هاتوە، چونکە لە کۆتایی شەستەکاندا ئەو گەشەکردنە تەکنۆلۆژییەی لەماوەی سی ساڵی پێشوودا (لە ماوەی دەستپێکردنی جەنگەکەوە) ڕوویدابوو، بازاڕە نیشتمانییەکانی لەوە تەسکترکردەوە هەموو ئەو بەرهەمانە بگرنە خۆیان کە توانستە تەکنیکییە نوێکان بەرهەمیاندەهێنان. بازاڕە نیشتمانیەکانیش

ئەو کاتە تەنگیان پێهەڵچنرا کە دەوڵەتەکانی ئەوروپای خۆرئاواو یابان سەرلەنوێ بنیاتی ئەوەیان نابوەوە کە جەنگ کاولیکردبوو و کەتبوونە کێبڕکێوە لەگەڵ یەکتری و لەتەك ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. خابوونەوەی تێکڕای پەرەسەندن لە دنیای خۆرئاوا، لە سەرەتای شەستەکانەوە، لە بنچینەدا بەرهەمی ئەو دوو هۆکارە بوو. وەڵامدانەوەی پێویستیش، دەستپێکردنی سەردەمی کۆمپانیا کەتە فرەڕەگەزەکان بوو، کە بۆ ڕزگاربوون لە بەرتەسکی بازاڕی نیشتیمانی ڕیانکردە سەتاسەری دنیا بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هەڵمەتە ئابوورییە دەرەکیەی دەکرایە سەر خاکەکەیان، هەڵمەتبەرنە سەر خاکی ئەوانی دیکەو بەرهەمەکانی گەشەکردنی تەکنۆلۆژی بەکاربەرن بۆ ئەوەی دنیا بەگشتی بکەنە بازاڕی خۆیان. ئەمەش نەك تەنیا وەك بازاڕێك بۆ بەرهەمە تەواو دروستکراوەکان، بەڵکو وەك بوارێك بۆ سیستەمێکی نوێی دابەشکردنی کار کە تەنیا ڕووناکاتە تابیەتمەندبوون لە بەرهەمهێنانی ئەم یان ئەو کالادا، بەڵکو تایبەتمەندبوون لەم یان ئەو بەشی کالاداو جێهێشتنی بەشەکانی دیکەی پڕۆسێسی بەرهەمهێنان بۆ ناوچەکانی دیکەی جیهان.

بەخەیاڵدا نەدەهات ئەوانە ڕووبدەن و گۆڕانی نوێ و گرنگ بەسەر فرمانی دەوڵەتدا نەیەت. بۆیە دەوڵەتی ڕێگانی یان تاتشەری جێگەی دەوڵەتی کینزی یان دەوڵەتی خۆشگوزەرانی گرتەوەو پێچەوانەی ئەوەی ئەنجامدا کە دەوڵەتی خزمەتگوزاری ئەنجامیدا. ئێستا مەبەست ئەوە نییە نازی کرێکاران هەڵبگیرێ، لەپێناو فراوانبوونی بازاڕدا (چونکە ئێستا دەرفەتەکانی فراوانبوونی بازاڕ لە بنچینەدا لە جیهانی دەرەوەیە)، بەڵکو

خواستراو سەرکوتکردن و جڵەوکردنی کرێکارانە. هەروەها مەبەست دابەشکردنەوەی داهات نییە لە بەرژەوەندیی چینەکانی خوارەوەدا، چونکە ئەمەش کەمتر پێویستە بۆ پێداویستییەکانی ساخکردنەوە. لە سایەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیدا، کە مەبەست فراوانکردنی بازاڕی نیشتیمانی بوو، هەڵئاوسان قبوڵکراوبوو یان بەلای کەمەوە چاوی لێ دەپۆشرا، بەڵام ئێستا کە مەبەست بەهێزبوونی توانستی کێبڕکێکردنە لەسەر بازاڕە دەرەکیەکان، هەڵئاوسان خراپترین شتە. کاتێکیش خودی حکومەت بازاڕێکی گرنگ بوو بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمەکان، فراوانبوونی ڕۆڵی دەوڵەت لە خەرجکردن و کۆکردنەوەی داهاتەکاندا پێویست بوو، ئێستا گەرەکە باجەکان کەمبکرێنەوە (خەرجکردنەکان بەرتەسکبکرێنەوە) لەپێناو ئاسانکاریکردن بۆ کاری کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان بۆ داگیرکردنی دنیا. هەروەها مەبەست ئەو بیروڕایانەیە کە بەهانەی تیۆری بۆ هەموو ئەوانە دێننەوە، وەك بەهانەهێنانەوە بۆ بەرزیی ئاستی بێکاری، چونکە کۆمپانیا کەتە فرەڕەگەزەکان زیاتر خەڵکی لە دەرەوە دەخەنە کار تاکو لە ناوەوە.

کەواتە دەوڵەت کۆتایی نەهاتوە، بەڵکو گۆڕانی گرنگ بەسەر ئەو فرمانە بنچینەییانەدا هاتوە کە پێویستە ئەنجامیانبدات. مەسەلەکە (بەهەندێك جیاوازیی گرنگەوە) بە گەڕانەوە دەچێت بۆ سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیی سەرەتایی، کاتێك ئابووریزانە تەقلیدییەکان داوای بەرتەسککردنەوەی ڕۆڵی دەوڵەتیان لە ئابووریدا دەکرد (بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە ئیمڕۆ ئادەم سمیس و ڕیکاردۆ لە فیکری ئابووریی زاڵ و زانکۆکاندا سەردەمێکی ئاڵتوونی نوێ بەسەردەبەن کە بەدرێژایی پەنجا ساڵی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی بەو جۆرە بەسەریان نەبردوە). کەواتە ئێستا مەبەست ئازادیی بازرگانی و گوێزانەوەی سەرمایەکانی داراییە، ئەوەی ئابووریزانە تەقلیدییەکان داخوازی بوون، تەنانەت ئەگەر ئەوە هەر کۆششێکی دەوڵەتی پێویست بێت بۆ نەهێشتنی ئەو ئاستەنگە بەرزانەی دەوڵەتە جۆربەجۆرەکان بەدرێژایی نیو سەدەی پێشوو دایاندەنا. گات و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی ئیمڕۆ لەسەر هەموو زارێکن، تەنیا لەبەر ئەوەی بازاڕی نیشتیمانی بەس نییە بۆ کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان.

هەروەها یەکێك لە کارە مەترسیدارەکانی دەوڵەتە خۆرئاواییەکان، بەکارهێنانی هەموو ئامرازێکە، کە دەستیان پیایدا ڕابگات، بۆ لێکهەڵوەشانەوەی سیستەمی سۆڤییەت، چونکە لە جیهانێکی وەهادا ناکرێت بازاڕێك بەو فراوانییەی بازاڕی یەکێتی سۆڤییەت و ئەورووپای خۆرهەڵات، وێڕای دەوڵەمەندیی کەرەستەی سروشتی و مرۆیی، لە دەرەوەی چالاکیی کۆمپانیا کەتەکان بمێنێتەوە. سەبارەت بە چەوساندنەوەی کرێکارانیش، ئیمڕۆو لە سەردەمی دوەمین جەنگی جیهانیەوە، لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستە، چونکە کرێکاران ئێستا زیاتر سەرچاوەی گرفت و تەنگپێهەڵچنینن، تاوەکو سەرچاوەیەك بۆ هێزی کڕین و بوارێك بۆ ساخکردنەوەی فراوان، وەك سەردەمی سی ساڵی پاش جەنگ. ئێستا کرێکاران دەبێت ڕێژەی بەرزی بێکاری، کەمبوونەوەی خەرجییەکانی حکومەت و نەهێشتنی دەوڵەتی خزمەتگوزاری قبوڵبکەن، جا ئەگەر خۆویستانە قبوڵینەکەن، ئەوا پێویستە ناچاربکرێن بۆ قبوڵکردن.

ناکرێ هەموو ئەو فرمانانەی دەوڵەت بەهێند وەرنەگیرێت. پێدەچێت فرمانی خزمەتکردنی بەرژەوەندییە نوێکانی چینە باڵادەستەکان کەمتر

لەبەرچاوبووبێت و کەمتر لەوەی سێ ساڵی دوای جەنگ هەراوهوریای لەسەر کرابێ, ئەگەرچی فرمانێکی گرنگیشە. ئەمە بێگومان وێڕای ئەو فرمانانەی دەوڵەت لەو بەشە چارەڕەشەی دنیا پێیهەڵدەستێت کە پێیدەوترێ دنیای پاشکەوتوو.

## سێیەم

## بەجیهانیبوون و دەوڵەتی فشەڵ

وێنای ئەوە ناکرێت دەوڵەت پیشەسازییەکان لە سەردەمێکدا کە لەسەر بناغەی فراوانبوونی نوێ لە خودی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا دادەمەزرێ, لێگەڕێن ئەو وڵاتانە بە خواستی خۆیان چیان ویست بیکەن, ئەمەش بەبێ کاریگەریخستنە سەر سروشت و فرمانی دەوڵەت لە وڵاتە پاشکەوتووەکان ڕوونادات.

سەردەمی دەوڵەتی کینزی و دەوڵەتی خۆشگوزەرانی لە جیهانی پێشکەوتوودا هاوشانی سەرهەڵدانی سەردەمی دەوڵەتی بەهێز بوو لە جیهانی پاشکەوتوودا, چونکە سەردەمی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی سەردەمی جەنگی ساردیش بوو, تیایدا هەر ئوردوگایەك: خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتی, پێویستی بەوە بوو پشتگیریی دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم بکات لە دژی ئۆردوگاکەی تر. بەو جۆرە یارمەتی بەڕادەیەکی بێوێنەو بەلێشاو ڕوویانکردە جیهانی سێیەم. ئەو یارمەتیانەش لە بنچینەدا وەك هاوکاری دەدرانە حکومەتەکان نەك بەشێوەی وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆ یان هاوکاری بدرێنە کەرتی تایبەت. ئەنجامی ئەمەش ڕۆڵی دەوڵەت بەهێزبوو. وێڕای ئەوە, لە ماوەی پەنجاو شەستەکاندا دەوڵەتە پیشەسازییەکان بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمەکان و وەك بوارێك بۆ وەبەرهێنان زیاتر پشتیان بەیەك دەبەست تاوەکو بە جیهانی تازەپێگەیشتوو. ئەمەش لە بنچینەدا بوە هۆی پێکهاتن و پەرەسەندنی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا و زۆربوونی وەبەرهێنانەکانی ئەمریکا لەناو ئەو بازاڕەداو ڕێگەیدا بە ڕۆڵێکی زیاتری دەوڵەت لە جیهانی تازەپێگەیشتوودا, بەڵکو ئەو ڕۆڵەی سەپاند بەسەریدا. هەموو ئەوانە بوونە هۆی سەرهەڵدانی سەردەمی دەوڵەتی بەهێز لە جیهانی سێیەمدا, دەوڵەتێك کە بە دەوڵەتی سەردەمی بازرگانەکان دەچێت (جێی سەرسووڕمانیش نییە ئەو سەردەمە لە جیهانی سێیەمدا بە بازرگانیی نوێ ناوبرا) و دەست دەخاتە هەموو وردو درشتێکی ئابووری و کۆمەڵگەوە, پلانی پێنج ساڵەی بەرزخواز بۆ پەرەپێدان ڕادەگەیەنێ, شورەیەکی گومرگیی بەرز بۆ پاراستنی پیشەسازییە تازەپێگەیشتووەکەی دەسەپێنێ, کۆششێکی زۆر دەکات بۆ ئەنجامدانی پرۆژەگەلی تایبەت بە ژێرخان, زۆرجار پێڕەوی سۆسیالیزم دەکات, واتە دەوڵەت ڕۆڵی چالاکانە دەبینێت لە دابەشکردنەوەی داهاتدا, تەنانەت ئەو دەوڵەتانەی هاوپەیمانی دەوڵەتە سەرمایەدارییەکانیشن ناچارن ئەو جۆرە دروشمانە بەرزبکەنەوە. دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانیش, وەك بانقی نێودەوڵەتی و سندوقی دراو, سەرسوڕماوانە لەگەڵ ئەو بیروڕایانەدا هەڵدەکەن, بەڵکو ڕەزامەندانە باسی سیستەمی پلاندانان و ڕۆڵی گەورەی دەوڵەت لە ئابووریدا دەکەن.

کاتێك ئاقاری جیهانگیریی نوێ, لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا, دەستپێکرد و ئەستێرەی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان درەوشایەوە, پێویست بوو دەوڵەتی بەهێز لە جیهانی سێیەم,

لـــەپێناو هاتنـــەدیی بەرژەوەندییـــەکانی ئـــەو کۆمپانیایانـەدا، جڵـەوکردنی خـۆی بـۆ ئـابووریو کۆمەڵگە خاوبکاتەوە. بەو پێیە پێویست بوو شورە گومرگییـەکان هەڵتـەکێنرێن، سیسـتەمی پلانـدانان ڕەتکرێتـەوە، سۆسـیالیزم ببێتـە وەلاوەنـرێو ئـەوە دەربـــبڕدرێ کـــە دابەشـــکردنەوەی داهـــاتو پشـتگیریکردنی کـالاّ پێویسـتەکان ناکۆکـە لەگـەڵ ڕەچـاوکردنی توانـاو شـارەزاییداو زیانبەخشـە بـۆ پەرەسـەندن. ئـەم ئاقـارە پـاش ڕووخـانی بلـۆکی خۆرهەڵاتو کۆتاییهاتنی جەنگی سارد خێراتربوو، بۆیـە پێویسـت بـوو سـوپاکانیش بچـووکبکرێنەوە یـاخود خـەرجیان کەمبکرێتـەوە. بێگومـان پێویستە ئـەم گۆڕانکارییـە بنەڕەتیـە لـە سیاسـەتێکەوە بـۆ دژەکـەی لەلایـەن خـودی دەوڵەتـەوە ئەنجامبـدرێتو دەوڵەت هەڵسێت بە هەڵوەشاندنەوەی خۆیو بڕوا بەخـــەڵك بهێنـــێ کـــە پێویســـتیان بـــەو نییـــەو دەستبەرداری هەموو فرمانو کارە کۆنەکانی خۆی بێت، هـەتا کۆمپانیا نیودەوڵەتیـە کەتـەکان یـان ئـەو دامەزراوە نێودەوڵەتیانەی بەناویانەوە قسـەدەکەنو لـــە بەرژەوەنـــدیی خۆیانـــدا بیانگرنـــە ئەســـتۆ. سەرەنجام دیمەنێکی نویّ دێتەئاراوە کە بەتاڵ نییە لـە خەسـڵەتی کۆمیـدی: دەوڵـەتێك هـەموو ڕواڵەتـە دەرەکیـەکانی دەوڵـەتی خـاوەن سـەروەریی هەیـەو ڕواڵەتکارانـە هـەموو ئـەو کارانـە ئەنجامـدەدات کـە پێشـتر ئەنجامیـداون، بـەڵام لەڕاسـتیدا فرمانێـك جێبەجێـدەکات کـە دەشـێت لـە "دەستکێشـانەوەو بەدەســــــتەوەدان"دا گیربخــــوات. مەبەســــــت دەستکێشـــانەوەیە لـــە هـــەموو ئەوانـــەی پێشـــتر جڵـەویکردبوونو پێشکەشـکردنیانە بـە بێگانـەکان، ئەمـەش هاوکـات لەگـەڵ پڕوپاگەنـدەکردن بـۆ ئـەو فرمانـەو بانگەشـەکردن بـۆ ئـەوەی بەرژەوەنـدیی گشــتی: بەرژەوەنــدیی نەتــەوە بــە بەرژەوەنــدیی هەژارەکانیشەوە، دەپارێزیّ. بۆ نموونە، کۆمپانیاو پرۆژەکانی سەردەمی دەوڵـەتی بەهێز دەفرۆشـیّ بە کۆمپانیـــا نێودەوڵەتیـــە کەتـــەکانو ناویـــدەنیّ تایبەتمـــەنیکردن یـــان هـــەر نـــاوێکی تـــر کـــە ناســـــنامەی کرێـــار ئاشـــکراناکات، یارمـــەتی پێشکەشکراو بـە هـەژاران دەوەسـتێنیّو ناویـدەنیّ چەســـپاندنی ئـــابووری، دەرگـــا بـــە ڕوی کـــالاّ هاوردەکانـدا دەخاتـە سـەر گـازی پشـت تـا جیگـەی بەرهەمە نیشتمانیەکان بگرنەوەو ناویـدەنیّ سـازانی هەیکەلیو..تادوایی.

ئەم کارە پێویستی بەجۆرێکی تایبـەتی دەوڵـەت هەیـە، دەوڵـەتێك کـە هەڵدەوەشـێنیّو بنیـات نانـیّ، بەڵکو ئەرکی بنیاتنان بۆ ئـەوانی دیکـە جێدەهێڵیّ، دەوڵـــەتێك کـــە چارەنووســـی خەڵکەکـــەی دەداتـــە دەسـتی بێگانـە هـەتا بەخواسـتی خـۆی مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـات. هـەموو ئەوانـە خەسـڵەتگەلێکن دەشێت بە ناوی "دەوڵەتی فشـەڵ" (*The Soft State*) ناوببەرین. ئەمـەش ناوێکـە (گونـار میـرداڵ *Gunnar Myrdal*) لـە کۆتـایی شەسـتەکاندا بـەکاریهێنا، وەك هێمـاکردن بـۆ ئامـادەیی زۆربـەی حکومەتـەکانی دەوڵەتـــە تازەپێگەیشـــتووەکان بـــۆ گەنـــدەڵبوونو پشتگوێخســـتنی دەســـەڵاتی یاســـاو زاڵکردنـــی بەرژەوەنـــدیی تاکـــەکانی بەســـەر بەرژەوەنـــدیی گشـتیدا. بێگومـان ئـەم خەسڵەتانە ئێسـتا زیـاتر لـە ســی ســاڵ لەمەوبــەر لــە دەوڵەتــەکانی جیهــانی سێیەمدا بەرجەستەن.

## چوارهەم
## بەجیهانیبوونو دەوڵەتی زایۆنیست

بەداخەوە ئـەو خەسڵەتانە، خەسڵەتی دەوڵـەتی فشـــەڵ، لـــە زۆربـــەی دەوڵەتـــە عەرەبیەکانـــدا بەدیـدەکرێت، بـەڵام تاکـە دەوڵـەتێکی ناوچـەکە کـە

خاوەن خەسڵەتی پێچەوانەیە, دەوڵەتی زایۆنیستە, چونکە ئەم دەوڵەتە ئەگەرچی فشەڵترە لە زۆربەی دەوڵەتەکانی دەوروبەر, کەچی پێناچێت ملبداتە ئەو ئاقاری بەجیهانیبوونەی ئەمڕۆ دنیای تەنیوەتەوە.

دەوڵەتی زایۆنیست هێشتا دەستوەردەداتە هەموو وردو درشتێکی ئابووریو کۆمەڵگە. لە کاتێکدا دەوڵەتەکانی تر سوپا بچووکدەکەنەوە یان خەرجیی چەککڕین کەمدەکەنەوە, ئەو دەوڵەتە دەستبەرداری سوپاکەی نابێتو بەهێزتری دەکات. ئەو دەوڵەتە ملکەچ نییە بۆ ڕێنماییەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتیو بانقی نێودەوڵەتی یان هیچ بایەخێکیان بۆ دانانێ. ئەگەرچی هانی کەرتی تایبەتی دەداتو پشتگیریدەکات, بەڵام هەمیشە دەیخاتە ژێر بەرژەوەندییەکانی باڵای دەوڵەتەوەو ڕێگە بە ڕەتکردنی ئەو بەرژەوەندیانە نادات. دەوڵەتی زایۆنیست وێناکردنی تایبەتی بۆ بەجیهانیبوون هەیەو هەڵدەدات بیسەپێنێ بەسەر دەوڵەتەکانی چواردەوری خۆیدا, ئەویش وێناکردنی "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستبوون"ە. چونکە پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە ئیسرائیل پڕوپاگەندەی بۆ دەکات بەجیهانیبوونێکی بچووککراوەیە. لەوەش گرنگتر هەموو ئەو بەڵگانەی بۆ بەرگریکردن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەهێنرێتەوە هەر ئەوانەن کە بۆ بەرگریکردن لە بەجیهانیبوون بەکاردەبرێن: مەرجی تواناو شارەزایی, بەرزکردنەوەی تێکڕای پەرەسەندن, خەسڵەتەکانی تایبەتمەندبوونو دابەشکردنی کار, کۆتاییهاتنی سەردەمی ئایدیۆلۆژیا, خەسڵەتەکانی کرانەوە بە ڕووی ئەوی دیکەداو کەوتنە کارلێککردنەوە لەگەڵیدا, چەوتی خۆبەستنەوە بە لایەنگری تەقلیدی نەتەوەو نیشتیمانەوە, چاکەکانی ئاشتیو زیانەکانی جەنگ..هتد. ئەو بەڵگانە بەکاردەبرێن بۆ بەرگریکردن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوون, بەڵام هەمان ئەو بەڵگانەن کە بۆ بەرگریکردن لە بەجیهانیبوونیش بەکاردەبرێن. ئەمە لەکاتێکدا کە دەوڵەتی زایۆنیست تەواو بەپێچەوانەوە کاردەکات: سوورە لەسەر ئایدیۆلۆژیاکەی خۆی, کرانەوە بە ڕووی ئەوی دیکەدا ڕەتدەکاتەوە, دەستبەرداری بایەخپێدانە ئابوورییەکان دەبێت ئەگەر ناکۆکبن لەگەڵ ئامانجە سیاسییەکاندا, دەروەستی لایەنگرییە تەقلیدییەکانە بۆ نەتەوەو نیشتیمانو بەردەوامیش جەنگ دەخولقێنێ.

کەواتە, وەك دەردەکەوێت, ئەوەی بەجیهانیبوون بە دەوڵەتی کردوەو بەردەوامە لەسەر کردنی, لاوازکردنی دەوڵەتە بەشێوەیەکی گشتی, بەڵام بەو مانایە نییە دەوڵەتی هاوچەرخ فرمانگەلی نوێی نییە کە دەبێت لە خزمەتی بەرژەوەندییە باڵادەستەکاندا, کە لە بنچینەدا بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیا فرەڕەگەزە کەتەکانە, ئەنجامیان بدات. ئەمەش مانای ئەوە نییە یەکەمین جارە پاشەکشەکردنی هێزی دەوڵەت ڕوودەداتو لە پێنج سەد ساڵی ڕابردوودا کە بەسەر دەرکەوتنی دەوڵەتی نەتەوەییدا تێپەڕیوە نموونەی نییە. هەروەها مانای ئەوەنییە دیاردەی پاشەکشەکردنو لاوازبوونی هێزی دەوڵەت لەم ناوچەیەی تیایدا دەژین ڕیزپەڕی تێدانەبوە, مەبەست دەوڵەتی زایۆنیستە. کەواتە چۆن ئەم دیاردەیە: دیاردەی پاشەکشەکردنی هێزی دەوڵەت, بەو مانایە هەڵدەسەنگێنین کە دیاریمانکردووەو چۆن هەڵوێستی بەرامبەر دەردەبڕین, بەتایبەتی لەم ناوچەیەی جیهاندا؟

## پێنجەم

## چی بەجیهانی دەکرێت؟

ئەوانەی دیاردەی بەجیهانیبوون پیرۆزدەکەن تووشی هەڵەیەکی کوشندە دەبن, چونکە پێیانوایە یان هەوڵدەدەن وای نیشانبدەن کە بەجیهانیبوون پرۆسێسی "ڕزگاربوون" ە لە دەستی دەوڵەتی نەتەوەیی و کرانەوەیە بە ڕوی ئاسۆی مرۆڤانەی فراواندا, ڕزگاربوونە لە سیستەمی پلاندانی سەپێنراوی ڕەزاگرانو کرانەوەیە بە ڕوی سیستەمی بازاڕی ئازاددا, ڕزگاربوونە لە لایەنگریی کولتووریی تەسکبینو دەمارگیرانەو کرانەوەیە بە ڕوی تاقە کولتوورێکی جیهانیدا کە تیایدا هەموو خەڵكو نەتەوەکان یەکسانن, ڕزگاربوونە لە دەمارگیریی ئایدیۆلۆژیانەی دیاریکراوو کرانەوەیە بە ڕوی هەموو جۆرە بیروڕاکانداو بێ دەمارگیریو گرژبوون, ڕزگاربوونە لە وێنەکانی نائەقڵانیەتی سەرچاوەگرتوو لەلایەنگیریی پێشوەختی نەتەوەیەك یان ئاینێك یاخود ئایدیۆلۆژیایەكو کرانەوەیە بە ڕوی ئەقڵانیەتی زانستو بێلایەنیی تەکنۆلۆژیادا.

بەم جۆرە بەجیهانیبوونمان بۆ وێنادەکرێت, ئینجا باسکردن دەربارەی بەجیهانیبوون هاوشانی ئاخاوتنی زۆر بووە دەربارەی شتی بریقەداری زۆر کە مرۆڤ سەرسامدەکەن, لەوانە: مافەکانی مرۆڤو دیموکراسی, پەنابردن بۆ ئەقڵانیەتو زانست, توانای تەکنۆلۆژیای نوێ بۆ زاڵبوون بەسەر هەر ئاستەنگو کێشەیەکی دێتە سەر ڕێی مرۆڤ, هێرشکردنە سەر دەمارگیری بە هەموو شێوەکانیەوە: ئایینی, نەتەوەیی و ڕەگەزی, بانگەشەکردن بۆ ئەوەی لە هەموو ئەوانەدا ئێمە هەنگاو بەرەو سەردەمێکی نوێی شکۆمەند هەڵدێنین کە گشت بەها مرۆڤایەتیە پایەبەرزەکان تیایدا سەردەکەون, وەك: ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ (بەتایبەتی مافەکانی ژنان), دیموکراسی, ئەقڵانیەت, بابەتیبوونو گەشەکردنی تەکنۆلۆژی. هەموو ئەوانەش وەك بەشێکی لەجیابوونەوە نەهاتووی بەجیهانیبوون وێنادەکرێنو هەرکەسێکیش دژی بەجیهانیبوون ڕاوەستێ وەك دژبوونی ئازادبوون لە هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوە: چەوساندنەوەی دەوڵەت, نەفامیو هەژاریو دەمارگیری وێنادەکرێت.

دنیا زۆر جوان دەبوو ئەگەر هەموو ئەوانە ڕاستبوونایە, بەڵام لەڕاستیداو بەداخەوە ڕاست نینو لەوانەیە پێچەوانەکەیان ڕاستبێت. ئەوەی یارمەتی بڕواکردن بەهەموو ئەو شتانە دەداتو پشتگیریی ئەو هەڵە کوشندەیە دەکات ئەوەیە کە دەستەواژەی بەجیهانیبوون باس لەوە دەکات کە لە ڕواڵەتدا ڕوودەدەنو توخنی ناوەڕۆکی ڕاستەقینەیان ناکەوێت, چونکە قسەی زۆر دەربارەی بەجیهانیبوون دەکرێت, کەچی پرسیاری ئەوە ناکرێت: چی بەجیهانی دەکرێت؟

ڕاستە دنیا بە ڕوی یەکتردا دەکرێتەوەو لەسەردەمی بەجیهانیبووندا خێرایی هاتوچۆو گەیاندن زیاتردەبێت, بازاڕەکان فراوان دەبن, ئاستەنگەکان لەبەردەم گوێزانەوەی کاڵاکان, خزمەتگوزارییەکان, کەسەکان, فیکرو زانیارییەکاندا نامێنێ, بەڵام کەس پرسیار دەربارەی سروشتی ئەو کاڵاو خزمەتگوزارییانە ناکات کە بەخێرایی دەگوێزرێنەوەو قسە دەربارەی جۆری ئەو فیکرو زانیاریانە ناکات کە بەو ئاسانیو شارەزاییە پەخشدەکرێت. بەڵێ گەشەکردنی تەکنۆلۆژی مرۆڤ سەرسامدەکاتو چاوان کوێردەکات, بەڵام تەکنۆلۆژیا لەدوائەنجامدا تەنیا

"شێوازی بەرهەمهێنان"ە. کەواتە چۆن بەخرۆش بێن بۆ گەشەکردنی تەکنۆلۆژیا, واتە شێوازی بەرهەمهێنان, پێش ئەوەی بپرسین ئەوە چییە کە بەرهەمدێنرێ؟ هەڵوێستمان چی دەبێت ئەگەر دەرکمان بەوە کردو بڕوامان هێنا ئەوەی بەجیهانی دەکرێت کاڵا و خزمەتگوزاریی خاوەن سروشتو خەسڵەتگەلی دیاریکراون و کولتوورێکی دیاریکراو بەرهەمیهێناون و هیچ پابەندبوونێکی یاسایی, ئایینی, ئەخلاقی یان هونەری نییە ناچارمان بکات ئەو کاڵاو خزمەتگوزارییانە یان خودی ئەو کولتووره قبوڵ بکەین؟

گریمان توانیم بڕواتان پێ بهێنم کە هەمبەرگەرو کۆکاکۆلا و تەلەفزیۆن و دوش, ئەو جۆره بەرنامە, فیلمانەو خواردن, جلوبەرگ و ئامرازانەی گەیاندن و سەرگەرمکردن, ئەو جۆره پەیوەندییە خێزانی, کۆمەڵایەتی و جنسیانەو ڕێکخستنە سیاسییانەو هەموو ئەو شتانەی دیکە کە بەجیهانی‌دەکرێن پێشوەخت بەسەرماندا نەسەپێنراون و بکرێت مێشکی مرۆڤ بە ڕوی کاڵاو خزمەتگوزاری و پەیوەندی و ڕێکخستنی زۆر جیاوازدا بکرێتەوە (بێگومان مێشکی مرۆڤ دەکرێتەوەو لە ژیوارەکانی پێشوودا ڕوویداوە)و سەخت بێت یان مەحاڵ بێت دان بەوەدا بنێین کام جۆر لەو بەرهەمو پەیوەندی و ڕێکخستنانە باشترینیانە, ئەوا چۆن داوەریی بەجیهانیبوون دەکەین؟ ئایا بەو ئاسانییەی پروپاگەندەی بۆ دەکرێت قبوڵیدەکەین یان مەسەلەکە پێویستی بە دان بەخۆداگرتنی زیاتر هەیە؟

لەڕاستیدا بەجیهانیبوون, بەجیهانیبوونی شێوازێکی دیاریکراوی ژیانەو هیچ ناچارنیم قبوڵیبکەم و جێبەجێیبکەم, بەربلاویی بڕوای قبوڵکردن و جێبەجێکردنیشی دەگەڕێتەوە بۆ دەگمەنی ورۆژاندنی تایبەتمەندیی و پەیوەندیی هەیە بە کولتوورێکی دیاریکراوو تێڕوانینێکی دیاریکراوەوە بۆ ژیان و گەردوون (واتە لە ڕاستیدا پەیوەندیی هەیە بە ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراوەوە). ئەو مەسەلەی تایبەتمەندییە بەدەگمەن دەوروژێنرێت, لەبەر درێژیی سەردەمی کنەکردنی ئەو شێوازی ژیان (چونکە سەرەتای دیاردەکە دەگەڕێتەوە بۆ پێنج سەدە بەر لە ئێستا), هەروەها لەبەر توندوتیژیی کنەکردنەکەو خێرایی لە دەیان ساڵی دواییداو بەهۆی بوونی بەرژەوەندییەکی حاشاهەڵنەگری ئەو خاوەن کولتوورو بەرهەمانەی بەجیهانی‌دەکرێت لە ئاشکرانەبوونی تایبەتمەندییەکەی و بەکارهێنانی هەموو جۆرەکانی زەبری مادی, سیاسی, دەروونی و ئەقڵی بۆ ناردنی هەمووشتێکی تایبەت بەشێوەی مرڤانەو گشتی.

کاتێک بۆمان دەرکەوت و بڕوامان بەوە هێنا بەجیهانیبوون بەجیهانیبوونی شێوازێکی دیاریکراوی ژیانەو ئامرازی سەرەکیی کۆمپانیا فرەڕەگەزە کەتەکانە کە بەتواناو شارەزاییەکی بێوێنە بەجیهانیبوون پراکتیزەدەکەن, دەرکمان بەوە کرد هەموو ئەو ئاخاوتنانەی بەجیهانیبوون وەك پرۆسێسی "ئازادبوون" لە هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوە وێنادەکەن, تەنیا خەیاڵپلاوین و هیچی تر.

ئەو ئازادییە چییە کە پاش ڕزگاربوونمان لە دەسەلاّتی دەوڵەت بەڵێنی بەدەستهێنانی دەدەین؟ ئایا کتومت ئەو "ئازادی"یە نییە کە جۆرج ئۆرویل لە ڕۆمانی 1984دا باسیدەکات؟ من هیچ فرمێسکێکم بۆ پاشەکشەی دەسەلاّتی دەوڵەت هەڵنەدەڕشت, ئەگەر نەمزانیایە ئەوەی جێی دەگرێتەوە کۆمپانیا فرەڕەگەزە کەتەکانە. کەواتە چ

گەرەنتیەك هەیە بۆ ئەوەی ئەو ئازادییەی لە سایەی ئەو کۆمپانیانەدا بەدەستیدێنم مەزنترو فراوانترە لەوەی لە سێبەری دەسەڵاتی دەوڵەتدا بەدەستم دەهێنا؟ ئایا پێویستم بەوەیە ئەوەتان وەبیربێنمەوە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی نوێ چۆن مامەڵە لەگەڵ ئازادیی بیروڕاو بیکردنەوەدا دەکەن یان کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان چۆن مامەڵە لەگەڵ ئازادیی و پێگەی ژناندا دەکەن و تا چەند لەگەڵ جیاوازیی ڕاستەقینەی بیروڕادا هەڵدەکەن؟

ئایا کاتێك سیستەمی پلاندانانی سەپێنراو لەلایەن دەوڵەتەوە پاشەکشەدەکات، بەڕاستی لە پلان ڕزگارمان دەبێت یاخود پلانێك بە یەکێکی دیکە دەگۆڕین؟ ئایا وێنای ئەوە دەکرێت کۆمپانیای کەتە، کە لە ژمارەیەکی زۆر دەوڵەتی دنیا کاری بەرهەمهێنان و ساخکردنەوە ئەنجامدەدات و کەرەستەی خاوو هێزی کار لە هەموو جێگەیەکی دنیا دەکڕێ، پەنا بۆ پلاندانان نەبات؟ ئایا پلانەکانی ئەو کۆمپانیایانە کەمتر لە پلانەکانی دەوڵەت دەستوەردەدەنە ئازادیمان؟ ئایا هیچ بەربەستێك لەئارادادەبێت ئەگەر ئەو کۆمپانیایانە ویستیان بەجۆرێك پلان بۆ ژیان و شێوازی بیرکردنەوەمان دابنێن کە تەبایە لەگەڵ ئامانجەکانی خۆیان لە بواری بەرهەمهێنان و ساخکردنەوەدا؟ ئایا لەسایەی دەسەڵاتی ئەو کۆمپانیایانەدا چاوەڕوانی چ دیموکراسیی و ڕێزگرتنێکی مافەکانی مرۆڤ دەکرێت؟

نهێنیی ئەو سووربوونە سەیرە چییە لەسەر بایەخدان بە پلوورالیزمێکی ڕواڵەتکارانە بۆ بیروڕادەربڕین کە لەڕاستیدا تەنیا ژمارەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان، تەلەفزیۆنەکان و حیزبە ڕێگەپێدراوەکان زۆردەکات، بەڵام هەموو ئەو ڕۆژنامەو کەناڵەی تەلەفزیۆن و حیزبانە لەڕاستیدا ئەوە دووبارەدەکەنەوە کە تەبایە لەگەڵ ستراتیژی کۆمپانیا فرەڕەگەزە کەتەکاندا؟

ئینجا چۆن ئەوەی ڕوودەدات بە کۆتاییهاتنی ئایدیۆلۆژیا ناوزەددەکرێت؟ ئەی هەموو ئەوانەی سەبارەت بە شکۆمەندکردنی بەجیهانیبوون، تەکنۆلۆژیا، بەکاربردن، بەرزکردنەوەی ئاستی پەرەپێدان دەوترێن و شەوو ڕۆژ گوێمانی پێ دەئاخنرێ چییە؟ ئەو تێگەیشتنە زۆر دیاریکراوە دەربارەی مانای ئازادیی و دیموکراسیی و پێشکەوتن کامەیە؟ ئایا ئەوانە ئایدیۆلۆژیایەك نین کە ئاشکرا دەمارگیریی و تەسکبینیی و هەڵنەکردن لەگەڵ هەر تێڕوانینێکی جیاوازدا دەخاتەڕوو؟

دوایش ئایا ئەقڵانیەت و بابەتێتی هەموو ئەوانە لەکوێدایە؟ جیاوازییەك هەیە کە نابێت پشتگوێیبخەین، ئەویش جیاوازیی نێوان بابەتێتی یاسای زانستی و ئەقڵانی و پرنسیپەکانی ماتماتیك و فیزیایە کە ڕێگە بە دروستکردنی بۆمبێکی ئەتۆمی دەدات لەگەڵ بڕیاری بەکردەوە دروستکردنی ئەو بۆمبە، نێوان ئەو پرنسیپە زانستیانەی ڕێگە بە بەرهەمهێنانی تەلەفزیۆن یان کامێرای خاوەن توانای تایبەتی دەدات لەگەڵ ئەو بڕیارانەی دەریدەکەم بۆ ئەوەی داخۆ تەلەفزیۆن یان شتێکی دیکە بەرهەمدێنم! واتە ئەو کامێرایە بەکاردێنم بۆ وێنەگرتنی دیمەنی سروشت یاخود ڕیسواکردنی یەکێك لە شاژنە جوانەکان. دەکرێت مرۆڤ پرنسیپەکانی زانست دەقاودەق جێبەجێبکات بێ ئەوەی ئەقڵانی بێت، هەروەها دەکرێ مرۆڤ ئەقڵانی بێت بەبێ ئەوەی خاوەنی زانستی زیاتر بێت لەوانی تر. کەواتە ئەقڵانیەتی ئەو شێوازی ژیانە لەکوێدایە کە بەجیهانیدەکرێت؟ ئەقڵانیەتی ڕێکخستنی ئەو شارانە لەکوێدایە کە ئۆتۆمبیلی تایبەتی کۆڵەکی

پشـتێتی و ئێسـتا بەجیهانیدەکرێت؟ ئەقڵانیـەتی پەیوەندییـە خێزانیـەکان لەکوێدایـە کـە ئێسـتا بەجیهانیدەکرێت؟ هـەروەها ئەقڵانیـەتی پێگـەی ژن لـە کوێدایـە؟ ئەقڵانیـەتی هەڵبـژاردنی بابەتـەکانی (*CNN*) بڵاویاندەکاتەوە لەکوێدایە؟

ئەگـەر بێینـە سـەر خـودی ناوچـەی عـەرەبیمان، پلـەی زیـادبوونی ئـەو ئازادییـە چـەندە کـە مرۆڤـی عـەرەب لـە سـایەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتبووندا، بەبـەراورد لەگـەڵ ئـەوەی ئێسـتا، بەدەسـتیدێنێ؟ بەتـەواوی دیمـەنی ئـەو ئازادییـە چـاوەڕوانکراوە چۆنە لـە سایەی ئەم ڕێکخسـتنە نوێیـەی بـەخودی بەڵگـەکانی بـەجیهانیبوون بانگەشـەی بـۆ دەکرێـت؟ بـەڵێ، ڕاسـتە ڕاکێشـانی ئـاوی نیـل بـۆ ئەوپـەڕی ڕۆژهــەڵاتی میســر، لــە ســیناو نزیکــی ســنوری نێودەوڵـەتی میسـر، پێویسـتی بـە جێبـەجێکردنی پرنسیپەکانی زانستی پێشکەوتوو و بەکارهێنانی تــەکنۆلۆژیای زۆر پێشــکەوتوو هەیــە، بــەڵام ئەقڵانیــەتی ئــەوە لــە چــیدایە ئــەو ئــاوە بــۆ ئیسرائیل ڕابکێشرێ؟

بەڵێ ڕاستە پێویستە کـەرتی تایبـەتی ئازادبێت لـە هەڵبـژاردنی ئـەو کاڵایـەی بەرهەمیـدێنێ و ئـەو ئـامرازەی بـۆ بەرهـەمهێنانی بەکاریـدێنێ و شـوێنی بەرهـەمهێنان و ساخکردنەوەکەشـی، تەنانـەت ئەگـەر ئیسرائیلیش بێت، چونکە هەموو ئەوانە دەبنە هۆی زۆربـوونی بـڕی بەرهـەمهێنراوو چاککردنی جـۆری بەرهەمەکان بەپێی پرنسیپەکانی ئابووریزانی، بەڵام چی لە سیستەمی دەستێوەردانی دەوڵەت ئەقڵانیترە بـۆ ئـەوەی ئـازادیی مامەڵـەکردنی کـەرتی تایبـەت لەگــەڵ ئیســرائیل جڵــەوبکات، هــەتا ئیســرائیل ئــەو بەڵێنانــە جێبــەجێبکات کــە دوایــەتی بــە فەڵەستینیەکان؟

ئەقڵانیـەت چـەمکێکی زۆر فـراوانتر لـە چـەمکی زانست و پێداویستییەکانی ئەقڵانیەتیش فراوانترو هەمەلایــەنترە لــە پێداویســتییەکانی گەشــەکردنی تــەکنۆلۆژی. بــەجیهانیبوون بــوارێکی فــراوان بــۆ کــارپێکردنی زانســت و پێشــکەوتنی تــەکنۆلۆژی دەرەخســێنێ، بــەڵام دەشــێت لــە ئەقڵانیــەت دوورمانبخاتەوە.

## شەشەم
## ئایا بەجیهانیبوون حەتمییە؟

دوا پەناگە کە لایـەنگرانی بەجیهانیبوون پـەنای بـۆ دەبـەن بەڵگـەی حەتمیەتبوونـە، چـونکە کاتێـك دادەمێــنن بــۆ بەڵگەیــەك تــا بــەناوی ئــازادی، خۆشــگوزەرانی مرۆڤانــە، ئــەخلاق و جــوانی و ئەقڵانیەتــەوە بــەرگریی لــە بــەجیهانیبوون بکــەن، پەنادەبەن بۆ ئەم دەربڕینـە: پێویستە قبوڵیبکـەین، چونکە هیچ چارەیەکی ترمان نییە.

دەبێـت سـەرەتا هێمـا بـۆ ئـەوە بکـەم کـە ئـەم بەهانەیە تەواو جیاوازە لەگـەڵ شێوازەکانی دیکـەی بەرگریکردن لە بەجیهانیبوون و ناکرێ ئەمەو ئەوانە تێکەڵ بەیەك بکەین، چونکە دەربڕینـی حـەتمیبوون لەڕاسـتیدا نـە بەرگریکردنـە لـە بـەجیهانیبوون و نـە شــکۆمەندکردنێتی، بــەڵکو دەربــڕی بێهیواییــە بەرامبــەر هــەر هەوڵــدانێك بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی، لەگـەڵ ئەوەشـدا پـێم باشـە گفتوگـۆ لەسـەر ڕاسـتیی خودی ئەم هەڵوێستە ڕشبینە بکەم.

زۆر شــیاوە بــڕوای وەهــا بڵاوبێتــەوە کــە دیاردەیەك حەتمییەو ناکرێ خـۆی لێ لابدرێ، تـەنیا لەبـەر ڕاهـاتنی درێژخایـەن و جێگیربـوونی ئـەوە لـە هۆشمەنـدیی مرۆڤـدا کـە دیاردەکـە بەشـێکە لـە سروشتی مەسەلەکان و سەختە بێ ئەو وێنـای دنیا بکرێــت. بــەبڕوای مــن گرنگیــی لــە ڕادەبــەدەری

دەرككــردن بــەوەی بــەجیهانیبوون جیهــانیبوونی ژیواریك یان كولتوریكی دیاریكراوەو دەرككردن بە تایبەتمەنـدیی ئـەو ژیـوارە لێرەدا بەدەردەكـەوێ، چونكە بڕوابوون بەوەی بەجیهانیبوون دیاردەیەكی بێلایەنی نێوان ژیـوارو كولتوورەكانـە، یـان بـەوەی ژیـواری خۆرئـاوایی ژیـواریكی مرۆڤانـەی گشـتییە نـەك یـەكێك لـە دەرهاویشـتەكانی ڕۆشـنبیرییەكی دیـاریكراو، دەبێتـە هـۆی چەسپاندنی ئـەو بڕوایـەی پێیوایــە بــەجیهانیبوون دیاردەیــەكی حەتمییــەو نـاكرێ خـۆی لـێ لابـدرێ. دەشێت ئـەو دوو بڕوایـە چەوت بن، وەك لەوەوبەر هەوڵمداوە ڕوونیبكەمەوە، چــونكە بــەجیهانیبوون جیهــانیبوونی ژیــواریكی تایبەتیــە، ئــەو ژیــوارەش دەربــڕی ڕۆشــنبیریی نەتەوەیــەكی دیــاریكراو یــان ڕۆشـنبیریی كۆمەڵـە نەتەوەیــەكی دیــاریكراوە. ڕاســتە ئــەم ژیــوارە ڕۆژگـاریكی دورودرێـژە، نزیكـەی پێـنج سـەدەیەكە، ئامرازی وەهای بۆ ڕەخساوە خۆی بسەپێنێ بەسـەر ئەو نەتەوانـەی تـردا كـە بەرهـەمهێنی نـەبوون، بـەڵام ئــەوە بەتــەنیا وای لێناكــات شایســتەی خەســڵەتی "مرۆڤایــەتیبوون" یــان "جیهــانیبوون" بێــت، بــە واتــەی ئاسـایی بـەكاربردنی ئـەم نازنـاوە. هـەروەها تایبەتمەندی لێ داناماڵێ، چونكە داننـان بـەوەدا كە ژیواریكی دیـاریكراو (یـان كولتووریكی دیـاریكراو) دنیـا ڕاپێچـدەكات، مانـای داننـان نییـە بـەوەدا كـە ئەوە بەرهەمی گشت دنیایەو مانای داننانیش نییە بەوەدا كە شایستەی ئەوەیە گشت دنیا ڕاپێچ بكات یان دەبێت ڕاپێچ بكات.

دەشــێت ئــەوە قبوڵبكــەین كــە گەشــەكردنی زانستو تەنانـەت پەرەپێدانی تـەكنۆلۆژی حـەتمین، چونكە هـەردووكیان دەربـڕی مـەیلێكی سروشـتییە لای مــــرۆڤ بــــۆ دۆزینــــەوەو خۆشەویســــتی ئاگاییخواســــتن و كەمكردنــــەوەی جۆرەكــــانی كـوێرەوەری، بـەڵام قبـوڵكردنی ئـەم یـان ئـەو وەك دیاردەیــەكی حــەتمی ناچــارمان ناكــات ئــەوە قبوڵبكــەین كــە ژیــواری خۆرئــاوا دیاردەیــەكی حەتمییە. بۆ نموونـە، دەشێت وێنـای پێشكەوتنێك لـە زانسـتو تـەكنۆلۆژیادا بكـەین، بـەبێ بـوونی ئامانجی قازانجی بێسنوور، ئامانجی شكۆداركردنی بەرهەمهێن، هێنانەدیی زیـاترین ڕادەی جڵەوكردنی سروشـــت، بەدەســـتهێنانی بـــەرزترین پلـــەی سەربەخۆیی خۆیی یان كـەمترین پلـەی بڕوابوون بە میتافیزیقا..هتـــد. هـــەموو ئەوانـــە نیشـــانە بنچینەییەكانی پێشكەوتنی زانستی و تـەكنۆلۆژیی خۆرئــاوان. بانگەشــەكردن بەپێچــەوانەی ئــەوەوە داننانە بە كەم ئەندێشەییەكی مەترسیداردا، بـەڵكو سـوكایەتیكردنە بـە تـوخمی مـرۆڤ، چـونكە ئـەوە دەسـەپێنێ كـە مـرۆڤ توانـای هێنانـەدیی شـتێكی باشتری نییە.

لــە فیلمــی بــەناوبانگی "ویڵبــوون بــەدوای ئاڵتونـدا"(*Gold Rush*)ی شارلی شاپلندا دیمـەنێكی ناودار هەیە كە تیایدا شارلی شاپلن لەگەڵ قەڵوێكی چاوچــنۆك لــە كوختەیــەكی لوتكــەی شــاخێكەو گەردەلولی بەفر ڕێی لـێ گرتـوون بێنـە دەرەوە، چۆن برسێتی زۆریان بۆ دێنێ، لەبەرئەوەی چەند ڕۆژێكە نانیان نەخواردوەو بەهۆی گەردەلەلەكەوە دەرفـەتی خـوارد پەیـداكردنیان لێ گـیراوە. لـەم دیمەنـدا ئـەوە بەدیدەكــەین چــۆن شــارلی شــاپلن هەوڵــدەدات پێڵاوەكەی بكوڵێنێ و بە چەقۆو چنگاڵ دەست بە خواردنی بكات، كەچی هاوڕێ قەڵەوەكەی مرخی لە شـارلی شـاپلن خۆشـكردوە، بۆیـە كاتێـك دەڕوانێتـە شــاپلن وەك مــرۆڤ نایبینــێ، بــەڵكو وەك مریشــك سەیریدەكات. واتە برسێتی وای لە پیاوە قەڵەوەكە كردوە شارلی شاپلن تەنیا وەك مریشك ببینـێ. ئەمـە كتومت ئایدیۆلۆژیایـە: چۆن مەسـەلەكان دەبینیـت؟

وەك چۆن ئەو پیاوە قەڵەوە هەرچییەك بكات ناتوانێ بڕوام پێ بهێنێ كە شارلی شاپلن مریشكە نەك مرۆڤ, ئاواش لایەنگرانی ژیواری خۆرئاوا هەرچییەك بڵێن ناتوانن بڕوام پێ بهێنن كە شێوازی ڕوانینیان بۆ مەسەلەكان تاقە ڕێگەیە. ئەوانەی ئێستا دەڵێن دنیا بۆ هەتاهەتایە ئایدیۆلۆژیای جێهێشتوەو تەنیا لۆژیكی بازاڕو ئابوریو تەكنۆلۆژیا لەئارادایە, شتێكمان پێدەڵێن كە لە فیلمی "وێڵبوون بەدوای ئاڵتوندا" هەیە, ئەویش ئەوەیە كە شارلی شاپلن مریشكەو هیچی تر. هەروەها ئەگەر پیاوێكی دەوڵەمەند بەریتە شوێنێكی دڵگیری كەناری دەریا پێتدەڵێت: ئەم شوێنە دڵگیرە بۆ بنیاتنانی ئوتێلێكی پێنج ئەستێرە. ئەگەر بیبیتە تایلاندو لەسەر ڕێگە كچێكی جوانی دوانزە یان سیانزەساڵیتان بینی پێتدەڵێت: ئەم كچە سەرچاوەیەكی چاكە بۆ پارەپەیداكردن, ئەگەر لە ماڵی لەشفرۆشان بیخەیتە كارەوە. ئەمە بانگەشەی ئەو كولتوور یان ژیوارەیە كە پێیوایە پێویستە دنیا ڕاپێچ بكات, چونكە كولتوورو ژیوارێكی بێلایەنەو دەربڕی مەیلی گشت مرۆڤایەتیە.

یەكێك لە خەسڵەتەكانی ئەم ژیوارە هەڵوەشاندنەوەخوازییە, ئەوەی پیاوەكەی فیلمی "وێڵبوون بەدوای ئاڵتووندا" دەیەوێ لەگەڵ شارلی شاپلنی بكات, ژیواری خۆرئاوا گەرەكیەتی هەموو شتەكان هەڵوەشێنێتەوە بۆ توخمە سەرەتاییەكان. ئەمەش ڕێبازێكی سوودبەخشە ئەگەر مەبەست ناسینی ئەو توخمانەبێت كە لێیان پێكدێن, یان ئەوە بێت ئامێرێك دروستبكرێت یاخود بەرهەمهێنان كاراتربكرێت, یان ئەوەبێت كە سروشت جڵەوبكرێت, بەڵام ڕێبازێكی مەترسیدارو زیانبەخشە ئەگەر ئەوە بەسەر شتە زیندووەكانی وەك مرۆڤو خێزانو كۆمەڵگەدا بسەپێنێ, چونكە بێگومان ئەوە دەبێتە هۆی زیاتر جڵەوكردنی مرۆڤو خێزانو كۆمەڵگە, بەڵام بەپێویست باشترین ئامانج نییە. لەبەرئەوەی بەرهەمهێن بۆ ئەوەی جڵەوی بەكاربەرەكان بكاتو گشتیان بكاتە مریشكێك كە بەئاسانی قوتدرێت, سودبەخشە تاك لە خێزانو نەتەوەو ژینگەكەی خۆی داماڵێ, ئەمەش جارێك بەناوی تاكخوازیو جارێك بەناوی ئازادیی كەسێتیو جارێك بەناوی ڕۆشنگەریو جارێكیش بەناوی فیمینیزمو ئازادیی ژنانەوە. هەموو ئەوانە وا وێنادەكرێن كە بەرهەمی ژیوارێكی مرۆڤانەی گشتینو هەموان پابەندن بە شوێنپێهەڵگرتنی, چونكە دەربڕی مەیلێكی سروشتیە لە مرۆڤدا, بەو پێیەش بڵاوبوونەوەی حەتمیەو دەبێت زوو یان درەنگ هەموولایەك ملكەچی بن. من بە پێچەوانەوە پێموایە زۆربەی ئەوانەی ئەو ژیوارە دەیەوێ بڵاویانكاتەوە تەواو ناكۆكە لەگەڵ بەهێزترین مەیلە سروشتییەكانی مرۆڤداو هەڵوەشاندنەوەی مرۆڤ بەو جۆرە بە پڕۆسێسی كوشتن دەچێت.

ئینجا دەشێت دیاردەیەك بەلای كەسێكی دیاریكراو یان نەتەوەیەكی دیاریكراوەوە حەتمی بێت, بەڵام بەلای كەسێكی دیو نەتەوەیەكی دیكەوە حەتمی نەبێت. لەوانەیە بڵاوبوونەوەی ئەم ژیوارەو زیاتر چەسپاندنی دیاردەیەكی حەتمی بێت بەلای ئەو نەتەوانەوە كە بەهۆی خەسڵەتی تایبەتی ئەو نەتەوانەوە یان بەپێی هەلومەرجی سروشتیو مەیلی تایبەتی دایانهێناوە, واتە بڵاوبوونەوەو زیاتر چەسپینی لە ئەوروپای خۆرئاواو ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا دیاردەیەكی بەڕاستی "حەتمی" بێت, بەهەمان شێوەش گەورەبوونی كۆرپەكە بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێكی گەورە حەتمی بێت. هەروەها هەمان شت, بەپلەیەكی كەمتر,

دەشێت بوترێت، سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی ئەو ژیوارە بۆ نموونە لە ئەمریکای لاتی یان ئەوروپای خۆرئاوا، بەڵام کەمتر حەتمیە بۆ ڕوسیای ئاسیایی یان یابان کە تاکو ئێستا تەواو چۆکیان پێ دانەدراوە. هەروەها هەرگیز ڕاست نییە بۆ کولتوورە زۆر جیاوازەکانی وەك کولتووری چین و هیندو عەرەب. جێی سەرسوڕمانیش نییە چین هەوڵبدات شتێك دابهێنێ کە جیاوازبێت لەوەی یابان بۆ نموونە لەگەڵ ژیواری خۆرئاوا کردی یان گاندی لە هیندستان خەریك بوو سەرکەوتن بەدەستبهێنێ لە داهێنانی شتێکی تەواو جیاواز لەگەڵ ژیواری خۆرئاوادا. هەروەها جێی سەرسوڕمانیش نییە عەرەب بەو ڕادە بەرزە بەرەنگاری ژیواری خۆرئاواو بازاڕی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ببێتەوە، بەرگرییەك کە هەندێك پێیانوایە سووربوونە لەسەر پاشکەوتوویی، بەڵام پێموایە خۆڕاگرییەکە شایانی دەستخۆشیکردن و پشتگیریکردنە.

هەروەها دانانی بەجیهانیبوون بە دیاردەیەکی حەتمی لەڕاستیدا دانانی مرۆڤە بەوەدا کە هیچ وزەیەکی پێ نەماوە بۆ بەرگریکردن، واتە هەموو کۆششەکانی مایەپووچ بوون و ئامادەیە بۆ خۆبەدەستەوەدان. جا ئەگەر ئەوە بڕیاری هەندێك بێت، ئەوە بەو مانایە نییە دەبێ ئەوانی دیکەش پابەندبین. بەهەرحاڵ زاڵمانەیە بڕیارێك بە حەتمی دابنرێت کە جگە لە نەمانی وزە یان بەپەلەیی پاداشتدان زیاتر هیچی تر تاوناداتەوە. زاڵمانەیە، چونکە باری شکستەخواردنی نەوەیەك دەخاتە ئەستۆی چەندین نەوەی داهاتوو.. ئەگەرچی دەشێت بابەتی هەرەسهێنان و خۆبەدەستەوەدان بەلای نەوەیەکەوە بەکردەوە حەتمی بێت، بەڵام بەپێویست حەتمی نەبێت بۆ نەوەی منداڵەکان و منداڵی منداڵەکانم. ئەوانە مافی خۆیانە داوای ئەوە لە نەوەی ئێمە بکەن ڕازی نەبین بەلای کەمەوە شتێك بفرۆشین کە دەشێت چاکبکرێ و سەرلەنوێ بنیاتبنرێتەوە. بۆ نموونە، کەمال ئەتاتورك لە تورکیا کەوتە ئەم هەڵەیەوە، کاتێك بەپەلە خۆی دا بەدەستەوەو هەرەسهێنانی لەبەردەم ژیواری خۆرئاوادا ڕاگەیاندو نەوەکانی پاش خۆی هەتاکو ئیمڕۆ هەوڵدەدەن ئەو هەڵەیە ڕاستبکەنەوە کە ئەو تێیکەوت.

گریمان بڕیارمان دا بەرگریبکەین، واتە بەرەنگاری بەجیهانیبوون و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستبوون ببینەوە، ئەوا دەبێت وریابین بەرامبەر بەوەی لەو بەرگرییەدا پشت بە شتێك نەبەستین کە بەکردەوە بەجیهانیکراوە، مەبەست لێرەدا دەوڵەتە. بانگەوازکارانی خۆڕاگری بەرامبەر بە ئاقاری بەجیهانیبوون و بەرەنگاربوونەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوون، کە بەبڕوای من یەکێکە لەو دیمەنانەی بەتایبەتی بۆ ناوچەی عەرەبیمان ڕەنگڕێژکراوە، تووشی هەڵە دەبن پێیانوابێ لەو خۆڕاگرییەدا دەوڵەتەکەیان پشتگیریان دەکات، چونکە دەوڵەتەکانیان دراوەتە دەستەوەو بەجیهانیکراون. ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی دژی ئاقارەکانی بەجیهانیبوون و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستبوون هێشتا گوتاری خۆی ئاراستەی دەوڵەت دەکات، تاوێك هانای بۆ دەبات، تاوێك ڕەخنەی لێ دەگرێ و تاوێکیش بەهەڵوێستێکیدا هەڵدەدات کە جۆرێك لە ئازایەتی تێدایە، بەبێ ئەوەی ئەوە ببینێ کە دەوڵەتەکانمان ئاشکراو ڕوون ڕایەنگەیاندوە کە بەکردەوە چوونەتە پاڵ ئۆردوگای بەجیهانیبوون. کەواتە ئایا ئاخاوتنمان لەگەڵ ئەو دەوڵەتەدا کات بەفیڕۆدان نییە؟ ئێمە بەردەوامین لەسەر ئەو بڕوا چەوتە کە دەوڵەت هێشتا بێلایەنە، وەك ئەوەی چێژ لەو بڕوایە

وەربگـــرین، چـــونکە دەمانـــەوێ خـــۆ لـــە ڕووبەڕووبوونـــەوەی ڕاســـتی بپـــارێزین، بۆیـــە بەردەوامین لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەت، وەك ئـەوەی دەوڵـەتێکی بێلایـەن بێـت لـەنێوان ئێمـەو بەجیهانیبووندا، بەشێوەی جاران کە وەك بێلایەن لـەنێوان چـینەکاندا سـەیرمانکرد. چـاکتروایە دان بـەوەدا بنـێین دەوڵـەت لەناوچـەی عـەرەبیمان لەواقیعداو بەداخەوە چالاکترین و کاراترین ئامڕازی بەجیهانیبوونە.

## سەرچاوە

العـــرب والعولمـــة، بحـــوث ومناقشـــات النـــدوة الغكرييـة التـى نظمهـا مركـز دراسـات الوحـدة، مركـز دراســات الوحــدة العربيــة، بـيروت. الطبعــة الثالثــة نيسان 2000، ص 153-170.

# حکومەت, دادپەروەریی و مافی مرۆڤ

ئارِ. ئەی. هیلْ
لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

ئـەم بابەتـە پەیوەنـدی نێـوان دادپـەروەریی و حکومەت دەخاتە روو, بەشێك لـەو تێڕوانیانـە تاقی دەکاتــەوە کــە فەیلەســوفە سیاســییە کۆنینــەکان گوزارشــتیان لێکــردووە, وەك رۆســۆ[1] و لــۆك[2], هــەروەها ئەوانــەش کــە تیوریســتە سیاســییە هاوچەرخەکان خۆیان لێداوە, وەك جۆن راوڵز[3] و رۆبێرت نۆزیك[4]. بە بۆچوونی راوڵز, دادپـەروەریی یەکێکـە لـە بنـەڕەتیترین بایەخپێدانـەکانی دەزگـای حکومــەت, لــۆك و رۆســۆ کــۆکن لەســەر ئــەوەی حکومـەت و دادپـەروەریی بـە شـێوەیەکی بنـەڕەتی پێکـەوە پێوەسـتن. وەڵ نۆزیـك و مـاکس ڤێبــەر[5] دەڵێن بایەخپێدانی بنەڕەتی حکومەت دادپەروەریی نییـە, بـەڵکو دەسـەڵاتە. ئـەم باسـە ئارگیومێنـت[6] لەسەر ئەوە دەکات حکومەت کە وەکو دامەزراوەیەك لـە لایـەنی مرۆڤـەوە پێکهێنـراوە و هـەر مـرۆڤیش کـۆنترۆڵی کـردووە, دەوڵــەت خـۆی لـە ملکەچـی بۆچـوونە ئاکارییەکانـە, بـۆ ئـەوەی وەهـا لەگـەڵ مرۆڤـدا بجولێتــەوە کــە خـاوەنی کۆمــەڵێك مـافی دیــاریکراوە, کــە مــافی مامەڵــەی دادپەروەرانــەش یەکێکــە لــەو مافانــە. لەبــەر ئــەوەی حکومەتــەکان ناچارن دادپـەروەر بـن چونکە پێویسـتە مـرۆڤ وەك بوونەوەری ژیر و پاشان وەکو تاك رێز لە مافەکانی بگیرێـت, وەك مـافی ئـازادی و مـافی پـاێزراویی لــە ئـازاردران لـە لایـەنی ئـەوانیترەوە تـا دەگاتـە مـافی موڵکایەتیکردن.

"ئێمــە ئــەم راســتییانە وەك بەڵگەنەویســت وەردەگــرین: کــە هــەموو پیاوەکــان و ژنــەکان بــە یەکســانی ئافەریــدە کــراون: ئافەریدەکەرەکــەیان چەند مافێکی نکولی لێنەکراوی پـێ بەخشیون ... بــۆ پاراســتنی ئــەو مافانــەش حکومەتــەکان دامەزرێنراون..."

ئــەلیزابێت کــادی ســتانتۆن "جاڕنامــەی هەست و سۆزەکان".

ئایـا ئـەرکی سەرشـانی حکومــەت ئەوەیــە دادپەروەرانە رەفتار بکات؟ جۆن راوڵز لە "تیوری دادپەروەرییدا", چەمکی دادپەروەریی بە "یەکەمین

نیکی[7] ناو دەزگای کۆمەڵایەتی لە قەڵەم دەدات" (1971 ل 3) کە حکومەت یەکێکە لە نمونەکانی. لەسەرەتای کتێبەکەیدا بە درێژیی دەربارەی گرنگیی دادپەروەریی و سێنتەرییبوونی دادپەروەریتی لە کۆمەڵگای "چاك رێکخراودا". راوڵز جەخت لەسەر دادپەروەریتی دەکات و پێدادەگرێت لەسەر ئەوەی گرنگ نیە حکومەت و ئەو یاسایانەی لێیەوە دێنە دەرەوە چەند لێوەشاوەو کاران, گرنگ ئەوەیە تاچەند دادپەروەریتی تێیاندا دیار و بەرچاوە, ئەگەر حکومەت یاخود یاساکانی ناو حکومەت دادپەروەر نەبوون ئەوا پێویستە بگۆڕدرێن (گەرچی دواتریش دەڵێت کە لە گوزارشتەکەدا کەمێك پێداگریی کراوەو تۆزێك زیاد لە پێویست خەست کراوەتەوە – 1971, ل 4). ئەو کۆمەڵگا خاوەن ئۆردەرەی رالوڵز باسی دەکات, دوو خەسڵەتی سەرەکی تێدا هەیە:

1. زیاتر بایەخدەدات بە بەرژەوەندی ئەندامەکانی.

2. بە پێی "تێڕوانینی گشتی بۆ دادپەروەریی" رێکخراوە (1971, ل 5).

کاتێك هاوڵاتییان تێڕوانینێکی گشتییان بەرامبەری دادپەروەریی هەبێت "ئەوا تێدەگەن و ئامادەشن بۆ جەخت کردن لەسەر سێتێکی دیاریکراوی پرەنسیپەکان بۆ دەرخستنی ماف و ئەرکە بنەڕەتییەکان, هەروەها بۆ دیاریکردنی شێوازی گونجاوی دابەشکردنی سود و ئەرکەکانی هاریکاریی کۆمەڵایەتی" (1971 , ل5). لەم کۆمەڵگا زۆر چاکەدا بە شێوەیەکی گشتی پرەنسیپەکان لە سەرانسەری کۆمەڵگادا هەمان شت دەبن و لە لایەنی حکومەتیشەوە جێبەجێ دەکرێن. دیارە ئەمە باشترین نوێنەرایەتیکردنی حکومەتە: هەمووان لەسەر پرەنسیپەکانی حکومەت کۆکن و دەوڵەتیش رێك لەو پرەنسیپانە پێکهاتووە.

راوڵز لە دەسپێکی کتێبەکەیدا هێڵکاریی بۆ هێڵە درشتەکانی کۆمەڵگایەکی بە ئۆردەر لەگەڵ سێ پێکهاتەدا دەکێشێت:

1. بەرژەوەندی ئەندامەکانی بەرەوپێش دەبات.

2. بەهۆی چەمکێکی گشتییەوە لەمەڕ دادپەروەریی فەرمانڕەوایی دەکرێت کە ئەویش...

3. لەگەڵ ئەو چەمکەی دادپەروەرییدا کۆکە کە لەسەر بنەمای یەکسانێتی و نەزاهەت دامەزراوە.

دوان لەو سێ پێکهاتە کۆمەڵایەتی ژیارییەی راوڵز, چەمکی دادپەروەرییان تێدایە.

بە بۆچوونی ئەو, پێویستە دادپەروەریی بایەخی بنچینەیی دەزگای حکومڕانیی بێت. بەردەوام لەسەر پێشخستن و داکۆکیکردن لە چەمکی دادپەروەریی وەکو رەوایی و پیشاندانی ئەو پرەنسیپانەی پێوەی پێوەستن. راوڵز بە قەناعەتەوە دەربارەی سێنتەرایەتی دادپەروەریی دەنوسێت, گەرچی فەیلەسوفەکانی تر کۆکن لەسەر گرنگێتی دادپەروەری, بەڵام لەسەر رادەی گرنگێتییەکەی ناتەبان. ئایا دادپەروەریی یەکێکە لەو ئامانجانەی کە پێویست دەکات حکومەت بۆیان تێبکۆشێت؟ ئایا بەدیهێنانی دادپەروەریی دەسکەوتێکی ئاکارییانەیە بۆ حکومەت؟ ئایا دادپەروەری بە نیسبەتی چەمکی حکومەتەوە شتێکی بنچینەییە؟

نوسەرە جیاجیاکان وەڵامی جیاجیایان داوەتەوە بەو پرسیارانە. لای ئەمانوێل کانت دادپەروەریی شتێکی بنچینەییە بۆ چەمکی حکومەت. ئەو پێناسەی دەوڵەت وەکو دەزگایەك دەکات کە لە سایەی "یاساکانی دادپەروەری" دا هەڵدەسوڕێت (1965, ل77). کانت پێی وایە کە

"یاساکانی دادپەروەریی" بە زەروەرەت پێویستن و ئایـــدیای دەوڵـــەتیش وەکـــو ئـــەو یاســـایانەی دادپـــەروەری وەکـــو نمونەیـــەك خزمـــەتی بـــوونی دەوڵەتی راستەقینە لە جیهاندا, دەکات.

لـــۆك حکومـــەت بـــە ئەڵتەرناتیڤەکـــەی هەڵدەســـەنگێنێت, واتـــە حاڵـــەتی سروشـــتی, پێوانەیـەکی ئالۆزیشـی هەیـە: یاسـای سروشـت کـە بریتیە لە عەقڵ و ئیرادەی یەزدان (1947, ل 123). یاسـای سروشـتی توانستەکانی بوون دەداتـە پـاڵی هـەموو مرۆڤێـك "یەکسـان و سـەربەخۆ" (1947, ل 123) ئازادیش بەو شێوەیە لەگەڵ خود و موڵك و سامانەکەیدا دێتەوە کە خۆی بە لایـەوە باشـە. ئیتر تـا ئـەو رادەیـەی کـە دەسـت نابـات بـۆ مافـە دیاریکراوەکـانی مرۆڤەکـەی تەنیشـتی خـۆی ( یـان هەوڵ بـدات لـە خۆیـەوە خـۆی لـە نـاو ببـات). کاتێك مرۆڤێك حاڵەتی سروشتی جێدەهێڵێت, تەنها لەبـەر ئـەوە ئـەو کـارە دەکـات بـۆ ئـەوەی بچـێتەناو کۆمەڵەیەکـەوە, کـە ئـەویش, بـا بڵـێین لـە سـایەی حکومەتێکدایە, کە داکۆکی لـە هـەمان ئـەو مافانـەی دەکـات کـە لـە حاڵـەتی سروشـتیدا هـەیبوون (بـەڵام رەنگـە نـەیتوانیبێت بیانخاتـە گـەڕ). پێویسـتە حکومـەت دادپـەروەر بێـت, بۆیـە, بـۆ ئـەوەی ئـەو مافانـە بپارێزێـت کـە هـەر هاوڵاتییـەك لەگـەڵ خۆیـدا هێناونی بۆ ناو دەزگای سیاسی, ئەگـەر حکومـەت دادپـەروەر نـەبێت, ئـەوا ئەندامـەکانی سـود لـە ئەنـدامێتیی خۆیـان لـەناو حکومەتـدا وەرنـاگرن: چونکە ئەگەر دەرفەتی خۆیان لەناو سروشتدا تاقی بکردایەتـەوە, باشـتریان پێـدەکرا. لـۆك دەڵێـت کـە یـەزدان, سروشـت, هـەروەها بـاوەڕی خـەڵك ئـەو ناوچـەیەیان نیشـانە کـردووە کـە پێویسـتە هـەموو حکومـەتێك تێیـدا بمێنێتـەوە, یـەکێك لەوانـە فـەرمانڕەواییکردنی دادپەروەرانـە لەسـەر بنـەمای یەکسـانێتی و بێلایـەنی: "یەکـەم, بـەهۆی چـەند یاسـایەکی دانـراوی ئاشـکراکراوەوە فـەرمانڕەوایی بکرێن, لە حاڵـەتی تایبەتیدا ئەو یاسایانە جیاجیا نەبن, بەڵکو یەك فەرمانیان بەسـەر دەوڵەمەندیش و بەسەر هەژاریشدا هەبێت, بەسەر پیاوی ناو دادگاو پیـاوی سـەر گاسـندا بەیـەك شـێوە پیـادە ببێـت.." (1947, ل 194).

رۆسـۆ دەنوسـێت کـە پێویسـتە حکومـەتی شـەرعی گوێڕایـەڵی ئیرادەی گشـتی بێـت. پێویسـتە دارشـتنی یاسـاکان و وەگەڕخسـتنی یاسـاکان و دابینکردنی دادپەروەریی لە دادگادا, هەموویان ئەو ئیرادە گشتییە بسەلمێنن. ئیرادەی بەشەکانی خـەڵك تایبەتین, مـرۆ دەسـتی ناگاتـە ئیرادەی گشـتی هـەتا ئیرادەی گەورەترین گروپی شیاو لەبەرچاو نـەگرێت (هـەتا ئـەو گروپـە گـەورەتر بێـت, ئیرادەکـەیان زیـاتر داپەروەرانەیە): لە حاڵەتی هاوڵاتییەکانی ولاتێکدا, ئـیرادەی گشـتی لـە ئـیرادەی هـەموو هاوڵاتییـەکان پێکهاتووە[i]. رۆسۆ وەلامی پرسیاری "چۆن دەزانین کە ئێمە پێڕەویی لـە ئیرادەی گشـتی دەکـەین؟ هـەر خـۆی وەڵام دەداتـەوە, بـەوەی نوسـیویەتی کـە گشتیترین ئیرادە هەمیشە پەیوەندی بە بەرژەوەنـدی گشـتییەوە هەیـە, کـە خەسـڵەتی تایبـەتی ئـەویش چاکی و یەکسـانیی و هاوتاییـە. ئەگـەر فـەرمانڕەوا گوێڕایـەڵی ئـیرادەی گشـتی بێـت, تـەنها هـەر ئەوەنـدەی لەسـەرە دادپەروەرانـە رەفتـار بکـات بـۆ ئـەوەی ئەوئیرادەیـە بـەجێ بگەیـەنێت (1987, ل371). دیسانەوە مەسەلەی دادپـەروەریی هاتـەوە پێشەوە. رۆسۆ پێی وایە کە حکومەتی رەوا شوێنی ئـیرادەی گشـتی دەکـەوێت, کـە نیشـانەی هـەرە سەرەکیشـی دادپەروەرییـە. ئـەو پەیمانـە کۆمەلایەتییـەی ئـەم حکومەتـە دادپـەروەرە دادەمـەزرێنێت, زامنـی ئـەوە دەکـات کـە هـەموو

هاولاتییەکان مامەڵەی دادپەروەرانەی یەکسانیان لەگەڵدا بکرێت — هیچ کردەوەیەك کە لەلایەنی ئیرادەی گشتییەوە بێت، تاکسەرا یان ناڕەوا نابێت.

لەو کاتەدا کە "جێبەجێکەری یاساکان" ئیرادەی گشتی، ئیرادەی پێکەوەیی هەموو هاولاتییان، پیشێل دەکات، ئیتر حکومەت بوونی نامێنێت (1955، ل 64). ئەو کاتە رۆسۆ هەست دەکات کە حکومەتی رەوا زۆر بە توندی شەتەك دراوە بە دادپەروەرییەوە: ئیرادەی گشتی رێنمایی حکومەتی رەوا دەکات، کە ئەویش دادپەروەرییە، کاتێك حکومەت چیتر لە لایەنی ئیرادەی گشتییەوە رێنمایی ناکرێت، ئەوە ئەو حکومەتە چیتر رەوا نیە. لە حکومەتدا دادپەروەرێتی وەکو چۆنایەتی ئیرادەی گشتی دیاریی دەکرێت و بەو کردەوەیە لە قەڵەم دەدرێت کە لەوێوە دەکەوێتەوە. "چی پێویستیترین و رەنگیشە گرانتیرین شت بێت لە حکومەتدا، ئەوەیە بە شێوەیەکی کاراو لێوەشاوە دادپەروەریی بۆ هەمووان دابین بکرێت.." (1987، ل 375).

با دوو شت لێك جیا بکەینەوە: یەکەم، ئایا پێویستە حکومەت دادپەروەر بێت بۆ ئەوەی حکومەتی هەمووان بێت؟ ئەگەر دادپەروەریی بەشی پێناسەکەری حکومەت بێت یاخود پێکهێنەری بنەڕەتی حکومەت بێت، ئەوا ئەو حکومەتەی خەسڵەتی نادادپەروەریی پێوەیە، لەوە دەکەوێت کە حکومەت بێت. حکومەتی نادادپەروەر لە ئارادا نیە، بە سادەیی حکومەت هەیە "کە دادپەروەرە" هەروەها "نا-حکومەت"یش هەیە.. بە پێی لۆك، لەناو ئەو رێگایانەدا کە دەشێت لێیانەوە حکومەت خۆی لەناو ببات، ئەوەیە خۆی لەدادپەروەریی بدزێتەوە: "کاتێك چیتر بەڕێوەبەرێتییەکی دادپەروەریی بوونی نامێنێت بۆ زامنکردنی مافەکانی مرۆڤ ... ئەوا بە دڵنیایی هیچ حکومەتێك نامێنێتەوە"(1947، ل 232). لە حاڵەتێکی وەك ئەمەدا، گەل چیتر قەرزاری گوێڕایەڵیکردنی ئەو حکومەتە نیە کە پێش ئەوەی وای لێبێت بوونی هەبووە. لە تێڕوانینی لۆکدا، ئەو حکومەتەی چیتر دادپەروەریی تێدا نیە، دەتوێتەوەو دەبێت بە نا-حکومەت.

پێناچێت ئەمە وەك تێگەیشتنێکی گەردونییانە وەهابێت. حکومەت لە مانا کۆمەڵایەتی - زانستییە باوەکەیدا بەکارهێنراوە وەکو دامەزراوەیەکی تۆکمە کە کاتێك سیاسەتێکی گەندەڵ و ناڕەواو نادادپەروەر پێڕەو دەکات، لە بەین ناچێت. ئێمە حکومەتەکان وەك دادپەروەر و نادادپەروەر دەپۆلێنین. حکومەتە نادادپەروەرەکان گەرچی دووچاری رەخنەو گازاندە دەبن، بگرە تەنانەت شۆڕشیشیان بەسەردا دەکرێت، ئەوا هێشتاش بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەوە ناکەون کە حکومەت بن. ئایا رێکەوتنێك هەیە لەسەر ئەوەی کە پێویستە حکومەت چی بکات بۆ ئەوەی بە حکومەتی بمێنێتەوە؟

نا، شتی وا نیە. چونکە لە کاتێکدا کە لۆك و رۆسۆ وەهی تریش وا هەست دەکەن کە پێویستە حکومەت بە شێوەیەکی بنەڕەتی پێوەستی دادپەروەریی بێت و بە شێوەیەکی دادپەروەرانە رەفتار بکات، بەڵام رۆبێرت نۆزیك و چەندانی تر، حکومەت دەبەستنەوە بە دەسەڵاتەوە[ii]. بە پێی نۆزیك و ڤێبەر، ئەوەی زۆر گرنگە بۆ حکومەت بۆ ئەوەی حکومەت بێت، بریتیە لە قۆرخکردنی بەکارهێنانی هێز. دەوڵەت ماسولکەی هەیە، هێزی قەدەغەکردنی یاساییانەی هەیە، بۆ ئەوەی وا لەوانە بکات کە لەناو سنورەکانیدا دەژین، بۆ ئەوەی بەو شێوەیە رەفتار

بکەن کە ئەو دەیەوێت, ئەمەش تاکە پێوەستە کە وڵات بە دەسەڵاتەوە هەیبێت.

ئەگەر دەوڵەت بە پێناسە دادپەروەر نەبێت, ئەگەر دادپەروەریی پێوانەیەکی بنەڕەتی حکومەت نەبێت, ئەوا ئایا حکومەت هیچ ئەرکێکی ئاکارییانەی کەوتۆتە سەر شان بۆ ئەوەی دادپەروەر بێت؟ یەکێك کە تیوریستی پەیمان بێت, دەتوانێت ئارگیومێنت لەسەر ئەوە بکات کە حکومەت ئەرکی سەرشانێتی دادپەروەر بێت, بەڵام دەشێت ئەو ئەرکە رەوش و چۆنێتی پەرەسەندنی پەیمانەکە بخاتە روو, نەك سروشتی حکومەتەکە خۆی.

هەرچۆنێك بێت من باوەڕم وایە, کە ئەولەویەتێکی ئاکاریی هەیە بۆ ئەوەی حکومەت دادپەروەر بێت, ئەو ئەولەوییەتە لە سروشتی حکومەت خۆیەوە نەهاتووە, بەڵکو لە هاوڵاتییان خۆیانەوە هاتووە. ئەولەوییەتی ئاکاریی بە هۆی مافەکانی هەر مرۆڤێکەوە لە ناوەوە داخراوە, ئەویش وەکو بوونەوەرێکی عەقڵانی, لە مامەڵەیەکی تایبەتی و خودکۆنترۆڵکردندا ماوەتەوە لە بەرامبەری ویستی ئەوانیتردا. ئەو مافەی من بۆیان دەگەڕێمەوە بچووکترینن — بە تەواویی کاتێك بەراورد دەکرێن لەگەڵ زۆرینەی ئەو مافانەی لە هەندێك کۆمەڵگادا وازیان لێ هێنراوە — بەڵکو ئەوانە چەند مافێکن کە دراونەتە پاڵی مرۆڤ وەکو بوونەوەری ژیر و وەکو ئیختیاری ئاکارییانە.

ئەوان مافگەلێکن کە پێویستە لەلایەنی مرۆڤەکانی ترەوە وەکو تاك رێزیان لێ بگیرێت و کۆمەڵەی هەموو مرۆڤەکانیش بەسەر یەکەوە بە حکومەتیشەوە, رێزیان لێبگرن. هەموو مرۆڤێك لانیکەم ماڤی ئەوەی هەیە وەکو کەس رێزی لێبگیرێت, ئازاردانی لەلایەنی ئەوانیترەوە لێ بە دوور بکرێت, دەستدرێژیی نەکرێتە سەر خود و مۆڵکی. لۆران لۆمانسکی دەنوسێت کە مافە بنەڕەتییەکان نوێنەری سنورکاریکردنی ئاکارییانەن بەسەر کردەوەی ئەوانیترەوە, رێگە لە هەموان دەگرێت کە دەست وەربدەنە پرۆژەی یەکترییەوە , بۆ ئەوەی هەر یەکە بتوانێت برێك ئازادی هەبێت لە شوێنکەوتنی پرۆژە تایبەتییەکانی خۆیدا. یەکە یەکە رێز دەبەخشن بۆ ئەوەی لە بەرامبەردا هەمان رێز وەربگرنەوە (1987, ل 83). رەنگە تێڕوانینی لۆمانسکی دەربارەی کەسەکان وەك "شوێنکەوتووی پرۆژە تایبەتییەکانی خۆیان" کەمێك تام و بۆی خۆراواییانەی پێوە بێت, کە لەوێ ئایدیای سەربەخۆیی تاکەکان لە پێناوی تێرکردنی خوددایە نەك تێرکردنی رۆڵێکی نەژادییانە لە ناوکۆمەڵگایەکی تۆکمەو پێکەوە پێوەستدا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بیرۆکەی ئەوەی کە هەریەکەیان لەبەرامبەری رێزێکی یەکساندان بە یەکتریی, کە بە شێوەیەکی کەلتورییانە مشتومالْ کراوە.

رۆناڵد دۆرکین کۆمێنت لە چەمکە سێنتەرییەکەی راولز دەدات, واتە "دادپەروەریی وەکو رەوایی", بەوەی دەڵێت کە لەسەر ئەو باوەڕەی ئێمە دامەزراوە کە هەموو پیاوان و ژنان خاوەنی "مافێکی سروشتین" کە بایەخ و رێزی یەکسانیان پێدەبەخشێت. ئەوانە شایستەی ئەم مافەن چونکە مرۆڤن و مرۆڤیش توانای هەیە "نەخشە دابنێت و دادپەروەریی بدات" (1977, ل 182). ئێچ. ئێل. ئەی هارت و جۆل فێنبێرگ و جۆن لۆك و رۆبێرت نۆزیکیش پێش وەخت ئەو تێزە پەخش دەکەن کە دەڵێت لانیکەم چەند مافێك هەیە کە پێش مافە گەرەنتیکراوەکانی هاوڵاتیبوون کەوتوون و کاتێکیش حکومەت هەرەس دەهێنێت, ئەوان دەمێننەوە..ئەگەر بتوانین ئەم پێشەکییە پەسەند بکەین, کە مرۆڤ بونەوەری ژیرە توانای

کاردانەوەی ئاکارییانەی هەیە و خاوەنی چەند مافێکی ئاکارییانەیە, ئەوکاتە ئەو بونەوەرانەی کە ئەم مافەیان پێدراوە هەموویان وەك تاکیش و وەك گروپیش بە مرۆڤ لە قەڵەم دەدرێن. ئەمە دەبێت بە بناغەی بۆچوونەکەی من کە دەڵێت حکومەت ئەرکێکی ئاکارییانەی لەسەر شانە بەوەی دادپەروەر بێت.

ئێچ . ئێل . ئەی هارت لە وردبوونەوە وریاکەیدا لە مافە سروشتییەکان "ئایا ماف سروشتی بوونی هەیە؟" چەند جارێك دەستەواژەی "مافی یەکسان" دووپات دەکاتەوە (1955 ل 14, 15, 23, 24) وەسفی ئەو بۆ مافە ئاکارییەکان تاوتویٚ کراوە بۆ :مافی ئەوەی ئازاد بیت" هاوشێوەی "مافی دەستێوەرنەدان" ی لۆمانسکی کە تێیدا هەموو مرۆڤایەتی یەکسانن. (حەزدەکەم لێرەدا پەل بهاوم بۆ مەسەلەی ئەوەی ئایا ئەندامە ناعەقلانییەکان, پێش عەقلانییەکان یان پۆست عەقلانییەکانی مرۆڤایەتی, ئەوانیش هەموویان سود لەم مافە وەردەگرن. من ئارگیومێنت دەکەم کە ئەوانە مافە ئاکارییەکانیشیان هەیە, بەڵام ئەم دەمەتەقێیە زۆر دوورمان دەخاتەوە). هەموو بونەوەرە مرۆییەکان (لێرەدا حاڵەتە گرفتاوییەکان دەخەینە لاوە) مافی لانی کەمی رێزلێگیران و دەسوەرنەدان لە کاروباریان هەیە, بەشێوەیەکی گرنگتر, مافی ئەوەیان هەیە رێزی یەکسانیان هەبێت و بە قەدەر ئەوانیتریش پارێزراوبن لە دەستێوەردان. هەر مروڤێك وەك بونەوەرێکی ژیر و خاوەنی ئیختیار مافی ئەوەی هەیە وەك هەر دانەیەکی تر ئاستێکی رێز لێگیرانی هەبێت: رێزەکە لە سەر بنەمای ئاستی توانایی باو بۆ هەموان دەبێت (لێرەشدا دیسان حاڵەتە گرفتاوییەکان دەخەینە لاوە).

بۆچی ئێمە ئاستەکانی رێزگرتن و دەستێوەرنەدان بە پێی جیاوازیی توانستەکان لێك جیا ناکەینەوە؟ مرۆڤ لە نزیکەی لەسەدا نەوەد و نۆی تاقیکردنەوەکاندا, رێزگرتن و دەستێوەرنەدان پەسەند دەکات. بەڵام رێزگرتن لە لیستی شتەکانی تر دانابڕێت, یاخود وەك خەلاتێك بێت بۆ کارامەیی لەناو هێلکارییەك یان هەڵسەنگاندنێکی پێوانەییدا. بەڵکو لە تێپەڕینی مرۆڤایەتییەوە وەك گرووپ بە ناو دەروازەی پەرەسەندنێکدا دێتە بەرهەم, چونکە مرۆڤ دەتوانێت ئیختیار بکات, بە شێوەیەکی گرنگ دەتوانێت ئیختیاری ئاکارییانە بکات, هەروەها نەخشەو پیلان دابڕێژێت. گرنگ نیە ئەو پیلانانە چەند باش یان خراپن یاخود چەند خۆپەرستانەن یاخود بە پێچەوانەوە, توانستی بنەڕەتی مرۆڤ بۆ هەڵبژاردن و نەخشەدانان زەمینەی مافە ئاکارییەکانە و بۆ هەموو مرۆڤەکانیش یەکسانە. توانست خەسڵەتی هاوبەشی مرۆڤەکانە (من مەبەستم ئەوە نیە بڵێم ئەمە بناغەیەکی بایۆلۆجییانەی هەیە) و هاوتەریب بە مافە ئاکارییەکان, ئەمیش بە یەکسانی بۆ هەموانە.

مامەڵەکران بە یەکسانی یەکێکە لە نیشانەکانی دادپەروەری. راوڵز بیر لە دادپەروەری دەکاتەوە "هەمیشە گوزارشت لە چەشنە یەکسانێتییەك دەکات" (1971 ل 58) جۆن ستیوارت میلیش دەڵێت کە یەکسانی "لە نێوانی بۆچوونەکانی لەمەڕ دادپەروەرییدا دەبینرێت" (1987, ل 474). مامەڵەکرانی دادپەروەرانە, لە یەکێك لە ماناکانیدا بریتیە لە مامەڵەکرانی رەوایانەو یەکسانانە, کە بەشێوەیەکی سروشتییانە لە بچوکترینی ئەو مافە ئاکارییانەوە دەڕژێت کە لە سەرەوە ئیشارەتیان پێدرا. (لێرەدا بە تەنها مەبەستم لە رەوایەتی و یەکسانێتییە لەو رووەوە کە

مافی بنەڕەتی بن، نەك لەو رووەوە کە بریتی بن لە دابەشکردنی سامان وەکو راوڵز باسی لێوە کردووە). پەیوەندیکردن بەوانیترەوە پێویستی بە هاوشانێتی هەیە: شتێکی نابەڕێزانە دەبێت باسی سودمەندبوونی کەسێك بکەین، بەوەی فریوی بدەین و بە پاڵەپەستۆ کاری پیٚ بکەین. دەوڵەت لێرەدا وەك مۆڵگەی مرۆڤەکان وایە، پێوستە بە پێی ئەو پێوەستبوونە هەڵبسوڕێت کە پێویستە ریٚز لە هەموو مرۆڤەکان بگرێت بە پێی بنەمای ناسینی مافەکانیان. لە شوێنکەوتنی ئەم ئامانجەدا، دەوڵەت ناچارە دادپەروەرانە رەفتار بکات، چونکە مامەڵەکردنی یەکێکی تر بە شێوەیەکی بەڕێزانە، بە زاراوەیەکی کانتییانە وەکو ئامانجێك، نەك وەك هۆکارێك بە تەنها، بە سادەیی ئەوەیە بە پێی یەکسانێتی و رەوایی رەفتار بکەین کە ئەمانیش خەسڵەتی دادپەروەرین.

لەوانەیە رەخنەی ئەوە بگیرێت کە ئەگەر حکومەت ناچار بێت بە شێوەیەکی دادپەروەرانە مامەڵەی هەموو کەسێك بکات و لانیکەمی ئاستی رێزگرتن دابین بکات، ئەوا ناچارە مامەڵەی هاوڵاتییەکان و نا ـ هاوڵاتییەکانیش بە هەمان رێگە بکات. هاوڵاتیان و نا ــ هاوڵاتییان ئاسایش و پارێزگارییان لە سایەی یاسادا بۆ دابین بکرێت. بەمەش یاساو رێساکانی حکومەت پەرش وبڵاو دەبنەوەو ئیتر زەحمەت دەبێت بوترێت لە کوێدا وڵاتێك کۆتایی دێت و وڵاتێکی تر دەستپێدەکات، چونکە هەمووان لە سایەی پاراستنێکی تایبەتیدان. ئەم رەخنەیە "لانیکەمی رێزگرتن و مامەڵەکرانی دادپەروەرانە" درێژ دەکاتەوە بۆ مەودایەکی نەپارێزراو. هەبوونی لانیکەمی مافەکان مافەکانی دەنگدان یاخود ئەو سودانەی تر ناگرێتەوە کە لە هاوڵاتیبوونەوە دەست دەکەون. هەر ئەوەندە هاوتای پارێزراویی لە ئازار و مامەڵەکران بە دادپەروەریی دەگرێتەوە.

پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا زەمینەی پاساودانەوەی دەوڵەت لە پاراستنی مافەکانی هاوڵاتییاندا بەهێز و تۆکمەیە یا نا، بۆیە، قۆرت دەخاتە بەردەمی دەوڵەت تا کردەوەی پێویست نەکات بۆ پاراستن و پێشخستنی دەوڵەت خۆیدا، وەك ناردنی هاوڵاتییان بۆ جەنگ، یاخود پیادەکردنی کۆنترۆڵ بەسەر موڵکدا. لە بەرامبەری ئەم ناڕەزاییەدا دەڵێم کە بوونی مافێك گەرەنتی ئەوە ناکات کە تاك هەمیشە رێگەی خۆی دەگرێتە بەر. ئەمە پشت دەبەستێت بەوەی ئایا هیچ کێبڕکێیەکی تر و مافێکی بەهاداری تری یەکسان هەیە کە یەکێکی تر هەیبێت تا قایلبوونێکی دیکە هەبێت لە لایەنی خاوەن مافەکانی ترەوە ئەوانەی دەشێت بە شێوەیەکی کاتی دەسبەرداری بانگەشەی مافی ئەسڵی ببن. بوونی ماف ئەوەش دەگرێتەوە کە نیگەرانییەکانی تاکێك، ئامانجەکانی، بەرژەوەندییەکانی هەموویان لە بەرچاو دەگیرێن و بە وریایی هەڵدەسەنگێندرێن دژی بانگەشە کێبڕکێکەرەکانی خاوەن مافەکانی تر. ئەوە زامنی ئەوە دەکات کە هاوڵاتییان رەوانەی شەڕو شۆڕەکان ناکرێن لەبەر هۆی ناپەسەند یان نادادپەروەرانە، فێڵیان لێناکرێت یان ناکرێن بە جێگای تاقیکردنەوەی گازی خەردەل، یاخود گازی کوشندە، یاخود بۆ ماوەی زۆر تووشی نەخۆشی سیفلیس ببن، یان بیٚ ئەوەی قەرەبوویەکی باش بکرێنەوە و هۆیەکی گونجاویشی دەبێت، لەپڕ خانووەکانیان بڕوخێنرێن بۆ راکێشانی رێگایەکی خێرا. ئەگەر، وەك لۆك و هی تریش ئارگیومێنت دەکەن کە گرنگترین هۆ بریتیە لە باشترین گوزەرانی هاوڵاتییان، ئەوا من هیچ هۆیەك نابینم بۆچی

ئارگیومێنتی ئەوەی پێویستە دەوڵەت مافەکانی هاوڵاتییانی خۆی و بنکەکانی ڕەفتارەکانی بناسێتەوەو دانیان پێدا بنێت لەمەڕ پاراستنی ئەو مافانە، بەشتێکی مەترسیدار دابنرێت.

کەواتە، بەهۆی ئەو مافە ئاکارییانەوە کە لکاون بە مرۆڤایەتییەوە، دەوڵەت ناچارە وەها پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا بگرێت کە لانیکەمی ڕێزگرتن و دەستتێوەرنەدان، یاخود بە شێوەیەکی ڕوونتر دادپەروەریی تێدا هەبێت[iii].

## پەراوێزەکان

1. لە ڕاستیدا ڕۆسو ئیرادەی هەمووان لە ئیرادەی گشتی جیادەکاتەوە. ئیرادەی هەمووان بریتییە لە کۆکردنەوەی ئیرادە تایبەتییەکان پێکەوە، بەڵام ئیرادەی گشتی بریتیە لە چاکەی گشتی و ئەوەی باشترین شتە بۆ هەمووان.. *(Social Contract, 1947, p. 26)*

2. لە ڕووی تەکنیکییەوە نۆزیك زیاتر دەچێتەوە بۆ سەر دەوڵەت نەك بۆ سەر حکومەت، گەرچی تێڕوانینەکانی بەسەر حکومەتەکانیشدا پیادە دەبن.

3. دیسان، ئەم وەسفکردنەی دادپەروەریی پڕاوپڕ نییە، ڕاوڵز پێناسەیەکی تێر و تەسەلتری بۆ دادپەروەریی هەیەو لە چاپێکی دواتردا تۆماری کردووە.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

**1–ڕۆسۆ، جان جاك** *Rousseau, Jean Jacques (1712-1778)* فەیلەسوف و تیوریستی سیاسیی نێوداری فەرەنسایە، نوسینەکانی بە یەکێك لە هۆیەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسە دادەنرێن. لە 28 ی حوزەیراندا لە جنێڤ لە دایك بووەو لە 2 ی تەموزدا لە ئێرمۆنڤێلی فەرەنسا مردووە. باوکی سەعاتچی بووە، باپیری ڕەوکردوویەکی فەرەنسایی پرۆتستانت بووە، ناوی ئیسحاق بووەو کچێکی خەڵکی جنێڤی هێناوە کە ناوی سۆزان بیرنار بووەو بەسەر ڕۆسۆوە ڕۆیشتووە. ڕۆسۆ نوێنەری باڵی چەپی لایەنگیرانی ڕۆشنگەریی فەرەنسییە، وەکو فەیلەسوف و زانای سۆسیۆلۆجیاو زانای ئیستاتیکاو ڕۆماننوس ناسراوە. یەکێکیشە لە گرنگترین تیوریستانی بواری پەروەردە. بانگەشەی کردووە بۆ باوەڕبوون بە یەزدان و نکولیکردن لە سرووش. نوسینە سەرەکییەکانی بریتین لە: وتارێك دەربارەی نایەکسانێتی لە نێوانی مرۆڤەکاندا ـ 1755، پەیمانی کۆمەڵایەتی ـ 1762، ئەمیل یان دەربارەی پەروەردە ـ 1762.

**2–لۆك، جۆن** *Locke, John (1632-1704)* فەیلەسوف و ئابووریناس و سیاسەتمەدارێکی ئینگلیزییە، لە خێزانی پیاوێکی دارتاشدا لە دایك بووە، زانستی پزیشکیی خوێندووەو ڕازگری ژمارەیەك سیاسەتمەداری سەردەمی خۆی بووە، سەفەر و گەڕانی زۆر بووە. دامەزرێنەری قوتابخانەی ئەزمونگەرییە. دیارترین نوسراوی بریتییە لە"وتارێك دەربارەی تێگەیشتنی مرۆیی . 1650"، وتارێك دەربارەی لێبوردەیی ـ 1869، پاشان هەر لە هەمان ساڵدا لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی حکومەتی مەدەنیی نوسیوە. بە بڕوای لۆك ئەزمون تاکە سەرچاوەی بیرە.

3–جۆن ڕاوڵز *John Rawls, 1921-* فەیلەسوفی زانکۆی هارڤاردە. نێودارترین کتێبی "تیوری دادپەروەری – 1971". لە نوسینەکانی تری: دادپەروەریی وەك ڕەوایی – 1957، مانای دادپەروەریی – 1963، تازەترین کتێبیشی: چەند وانەیەك دەربارەی فەلسەفەی ئاکاری – 2000.

4-رۆبێرت نۆزیك *Robert Nozick (1931-2004)* یەکێکە لە فەیلەسوفە دیارەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بیرکردنەوەی هاوچەرخ هەبووە. لە رۆژی 23 ی کانونی دووهەمی 2004 لە تەمەنی 63 ساڵیدا دەمرێت. هەم وەك مامۆستاو هەم وەك بیریاریش ناسرابوو. پایزی بەر لە مردنی، کۆرسێکی دەربارەی شۆڕشی روسی وتۆتەوەو بەنیاز بوو لە بەهاردا دووبارەی بکاتەوە. دوایین کتێبی بریتیە لە ئینڤارییانس: بونیادی جیهانی بابەتی. لە ساڵی 2001 دا لە زانکۆی هارڤارد چاپکراوە. یەکەمین کتێبی بریتیە لە "دەوڵەتی پشێویی و یۆتۆپیا – 1974. ئەم کتێبەی وەك رەخنەیەك دەربارەی کتێبی "تیۆریی دادپەروەری" جۆن راوڵزی هاورێی نوسیوە کە پێکەوە لە هارڤارد وانەیان دەووتەوە. پاشان لە ساڵی 1981 دا کتێبی دووهەمی بڵاو کردۆتەوە "لێکدانەوە فەلسەفییەکان". پاشان کتێبی "ژیانێکی تاقیکراوە – 1989". دواتر کتێبی "سروشتی عەقڵانییەت – 1995, ئینجا "مەتەڵە سۆکراتییەکە – 1997".

**5-ڤێبەر, ماکس** *Weber, Max (economist) (1864-1920)* ئابوریزان و مێژوونوسی کۆمەڵایەتی ئەڵمانییە, بە هەوڵەکانی بۆ خوێندنەوەی مێژووی جیهان و مێژووی ئەوروپا ناسراوە. دیارترین نوسراوی کتێبێکی گەورەی سێ بەرگییە دەربارەی ئاینەکانی خۆرهەڵات کە لە ساڵی 1920دا بڵاوکراوەتەوە.

**6-ئارگیومێنت** *argument* گەرچی دەتوانین لە زمانی کوردیدا وشەی مشتومڕ بەرامبەری ئەم زاراوەیە دابنێین و تا رادەیەکی زۆریش ماناکە دەپێکێت, لە زۆر شوێنیشدا وامان کردووە. وەلێ ئەم زاراوەیە لە ئاخاوتن و دانوساندنە فەلسەفییەکاندا زۆر دوبارە دەبێتەوە, بۆیە جێی خۆیەتی وشەکە بێتە ناو زمانەکەمانەوەو خوێنەری کورد پێی ئاشنا ببێت, بە تایبەتی لەم دواییەدا کە هەندێك لە نوسەرانیش وەکو خۆی بەکاری دەهێننەوە. لە زمانی فەلسەفەدا زاراوەکە مانایەکی بەرینی هەیە, بەڵام دەتوانرێت بوترێت کە لە زمانی فەلسەفەدا زاراوەکە بۆ دەربڕینێك یان تێزێکی لۆجیکییانە بەکاردەهێنرێت کە دەرەنجامێکیشی لەگەڵدایە, واتە بیرکردنەوەو ئاخاوتنێکی عەقڵانییانە کە لە پێشەکییەکەوە یان چەند پێشەکییەکەوە دەستپێدەکات و دەگاتە پێشکەشکردنی بەڵگەو دەستاوێژ بۆ دەرەنجامێکی چاوەڕوانکراو یان چاوەڕوان نەکراو.

**7-نیکی** *virtue* بە یۆنانی دێرین پێی دەوترێت ئارێتێ *arete* ئەوپەڕی چاکی, حاڵەتی بونەوەری مردە کە خۆی لە خۆیدا شایستەی ستایش کردنە, ئەو حاڵەتەیە کە ئەگەر یەکێك هەیبێت بە چاك دادەنرێت, چاودێریی دادپەروەرانەی یاساکان, ئەو خەسڵەتەی کە تێیدا ئەو کەسەی چاکە بەو پەڕی نایاب دادەنرێت, ئەو حاڵەتەی کە دڵسۆزی بۆ یاساکان بەرهەم دەهێنێت. وشەی نیکی و گەردانەکانی (نیك, نیکبوون..) وشەگەلێکی ئاڤێستایی رەسەنن.

## Bibliography

*Dworkin, Ronald. (1977). Taking Rights Seriously. Cambridge: Harvard University Press.*

*Hart, H.L.A. (1955, April). Are There Any Natural Rights? The Philosophical Review, 64, 175-191.*

*Kant, Immanuel. (1965). The Metaphysical Elements of Justice. (John Ladd, Trans.) New York: Macmillan Publishing Co.*

*Locke, John. (1947). Two Treatises of Government. New York: Hafner Press.*

*Lomasky, Loren. (1987). Persons, Rights, and the Moral Community. New York: Oxford University Press.*

*Mill, John Stuart. (1987). On Liberty. In Robert Maynard Hutchins (Ed. In Chief), Great Books of the Western World. Chicago: Encyclopedia Britannica, Inc.*

*Nozick, Robert. (1974). Anarchy, State, and Utopia. New York: Basic Books.*

*Rawls, John. (1971). A Theory of Justice. Cambridge: Mass.: Belknap Press of Harvard University Press.*

*Rousseau, Jean Jacques. (1955). The Social Contract. (Charles Frankel, Trans.) New York: Hafner Publishing Co.*

*Rousseau, Jean Jacques. (1987). A Discourse on Political Economy. In Robert Maynard Hutchins (Ed. In Chief), Great Books of the Western World. Chicago: Encyclopedia Britannica.*

## سەرچاوە

***Government, Justice, and Human Rights***

***R. A. Hill***

***Virginia State University***

***http://www.bu.edu/wcp/Papers/Poli/PoliHill.htm***

# وێستگەکانی سەردەم

# خاوەن بیردۆزانی کلاسیك لەبارەی مۆدێرنێتەوە

جۆرج ریتزەر
لە ئینگلیزییەوە: پەیوەند



لە پێش گفتوگۆکردنی بەرهەمی بیرمەندە هاوچەرخەکانەوە لەسەر مۆدێرنێتە (هاوچەرخێتی) ئەوە یادی خوێنەر دەخەینەوە کە زۆربەی کۆمەڵناسانی کلاسیکی سەرقاڵی شیکردنەوەو رەخنەگرتن بوون لە کۆمەڵگای هاوچەرخ. ئەم شیکردنەوەیە روون و ئاشکرایە، بۆ نموونە لە بەرهەمی چوار خاوەن بیردۆزی کۆمەڵناسی گەورەدا کە ئەوانیش بریتین لە مارکس و ماکس وێبەر و دۆرکایم و سیمیل. ئەمانە هەر چواریان کاریان لەسەر دەرکەوتن و گەشەکردن و بەرزبوونەوەی ئاستی مۆدێرنێتە کردووە.

لە کاتێکدا ئەم چوار بیرمەندە بە چاکی ئاگاداری سوود و کەڵکی مۆدێرنێتە بوون، ئەوەی زیندوێتی بەخشیووە بە کارەکانیان لە هەموو شت زیاتر رەخنەگرتن بووە لەو گیروگرفتانەی کە جیهانی نوێ هێناونێتیە ئاراوە.

بێگومان بە گوێرەی مارکس مۆدێرنێتە لە رێگای یان بەهۆی ئابوری سەرمایەدارییەوە پێناسەکراوە. مارکس پەی بەوە بردووە کە بەرەوپێشەوەچوون لە رێگای گواستنەوەی کۆمەڵگا سەرەتاییەکانەوە بووە بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری. لەگەڵ ئەوەدا لە کارەکانیدا بەشێوەیەکی بەربڵاو خۆی تەرخان کردووە بۆ رەخنەگرتن لەو سیستەمە ئابورییە و کەمووکورییەکانی وەکو "نامۆ بوون و بەکاربردن و.. تاد".

بەگوێرەی ماکس وێبەر کێشەی هەرە ناسراوی جیهانی هاوچەرخ بریتی بوو لە بەرفراوانبوونی عەقڵانیەتی رەسمی لەسەر حسابی جۆرەکانی تری عەقڵانیەت و دەرئەنجامی دەرکەوتووی قەفەزی ئاسنینی عەقڵانیەت. خەڵکی بەشێوەیەکی روو لە زیادبوون لەم قەفەزە ئاسنینەدا زیندانی کراون، لە ئەنجامی ئەوەشدا بەشێوەیەکی پەرەسەندووانە نەیانتوانیوە هەندێ لە سیفاتە هەرە مرۆییەکانی خۆیان دەربڕن. بێگومان ماکس وێبەر پەی بە کەڵکەکانی پەرەسەندنی عەقڵانیەت بردووە - بۆ نموونە هێزی بیرۆکراسی بەسەر شێوازە رێکخراوەییەکانی سەرەتاوە-ی ناسیووەتەوە، بەڵام ئەو زیاتر خەریکی ئەو کێشانە بووە کە عەقڵانیەت هێناونیەتیە ئاراوە.

لە روانینی (دۆرکایم)ەوە، مۆدێرنیتە بەهۆی هاریکاری ئۆرگانی و لاوازبوونی ویژدانی کۆییەوە بووە. لە کاتێکدا هاریکاری ئۆرگانی لەگەڵ خۆیدا ئازادییەکی مەزنتر و توانایەکی زیاتری بەرهەم هێنانی هێناوەتە ئاراوە، دیسان زنجیرەیەك کێشەی دەگمەنیشی خستۆتە روو، بۆ نموونە لەگەڵ ئەم جۆرە لاواز بوونەی ئەخلاقی گشتیدا، خەڵکی ئارەزوویان کرد کە خۆیان ببینن لەگەڵ شەپۆلێکی بێ واتادا بڕۆن لە جیهانی هاوچەرخدا. بە چەند وشەیەکی تر، خۆیان بینیەوە کە ئازار

دەچەژن بە دەستی ئەنۆمی *anomie*یەوە.

چوارەم خاوەن بیردۆزی کۆمەڵناسی کلاسیک کە جۆرج سیمیلە لێرەدا باسی ئەو درێژەپێدانی زیاتر لە خۆدەگرێت، بەشێوەیەکی بەربڵاو ئەوەش لەبەرئەوەیە کە سیمیل تازە و لەم دواییەدا وەکو مۆدێرنیست (لە ساڵی 1992) و وەکو پۆست مۆدێرنیست (لە ساڵی 1993–1997) وەسف کراوە، ئەویش لەبەرئەوەی تا ئەندازەیەك بۆ هەردوو بوارەکە دەگونجێ و جێگای خۆی دەکاتەوە. ئێمە لێرەدا وەکو مۆدێرنیستێك لەبارەی سیمیلەوە دەدوێین و پاشتریش گفتوگۆی ئەو رایە دەکەین کە سیمیل پۆست مۆدێرنیستە.

فریس بای کە لە ساڵی 1992دا جۆرج سیمیل بە مۆدێرنیست دادەنێ ئەو تێڕوانینەی بەلاوە پەسەندە کە سیمیل یەکەم کۆمەڵناسی سەردەمی مۆدێرنێتەیە. سیمیل وا دەبینرێت کە بە شێوەیەکی سەرەتایی توێژینەوەی مۆدێرنیتەی لە دوو ئاستی سەرەکی پەیوەست بەیەکدا کردبێت کە ئەوانیش (شار و ئابوری پارە)ن.

شار ئەو شوێنەیە کە مۆدێرنیتە جەختی لەسەر دەکات یان پێی لەسەر دادەگرێت و روانینی خۆی لە بارەوە چڕ دەکاتەوە، لە کاتێکدا ئابوری پارە داوای بڵاوبوونەوەی مۆدێرنیتە و کارە زیادەکانی دەکات (بڕوانە فریس بای 1992).

پۆگی لە ساڵی 1993دا بیرۆکەی گەوهەری مۆدێرنێتە وەردەگرێت لە ڕوانگەی پەیوەندی بوونیەوە بە پارەوە، بە تایبەتی لە روانگەی فەلسەفەی سیمیلەوە بۆ پارە. وەکو پۆگی دەیبینێت، سێ جۆر روانین لە بارەی مۆدێرنێتەوە لەو بەرهەمەدا گوزارشت دەکرێن. یەکەمیان ئەوەیە کە هاوچەرخیبوون لەگەڵ خۆیدا زنجیرەیەك سوود و کەڵك بۆ مرۆڤایەتی دێنێت بە تایبەتی ئەو راستییەی کە خەڵك دەتوانێت توانای شاراوەی جۆراوجۆر دەربڕێت کە لە کۆمەڵگای پێش هاوچەرخدا دەرنەبڕراون و ئیلغاکراونەتەوە و سەرکوت کراون. لەم رووەوە سیمیل سەیری مۆدێرنیتە دەکات وەکو نمایش کردنێك دەکات کە بریتییە لە بەیانی دەربڕینی تواناکان کە شتێکی گەوهەرین بۆ ڕەگەزی مرۆڤ بەڵام ئەم توانایانە پێشتر دەرنەبڕراون (بڕوانە پیگی 1994 – ل 165).

دووەم سیمیل لە کاریگەری بەهێزی پارە دەکۆڵێتەوە لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا. لە کۆتاییدا جەختکردنی سیمیل دێت لەسەر دەرئەنجامە دژ و ناکۆکەکانی پارە بە مۆدێرنێتە بە تایبەتی نامۆبوون. مەسەلەی نامۆبوون دەمانگێڕێتەوە بۆ مەسەلەی سەرەکی لە بیردۆزی کۆمەڵناسی سیمیلدا بەشێوەیەکی گشتی و هەروەها لە کۆمەڵناسیەکەیدا سەبارەت بە مۆدێرنێتە یان (لە کۆمەڵناسی مۆدێرنێتە)دا و: تراژیدیای رۆشنبیری، درزی فراوانبووی نێوان رۆشنبیری زاتی و مەوزوعی، یان وەکو سیمیل دایناوە "لاوازی ئاستی رۆشنبیری تاکەکەس و بەرزبوونەوەی رۆشنبیری مەوزوعی – (بڕوانە فریس بای 1992 ل 69). لە روانینی فریس بای دا، سیمیل جەخت دەکاتە سەر ئەزموونی مۆدێرنێتە. ڕەگەزی بنەڕەتی ئەو ئەزموونە کە کات و شوێن (بۆشایی) و رووداوی بە پەلەیە کە بەلایەنی کەمەوە لایەنە سەرەکیەکانی بیردۆزە هاوچەرخەکانی

مۆدێرنێتە پێکدێنن. ئەزموونی مۆدێرنیتە لای سیمیل وەکو کاتی پچڕ پچڕ سەیر دەکرێت کە ئەوەش وەکو شتێکی راگوزاری وایە کە تیایدا هەردوو لایەنی نزیك لە یەکی چرکەساتی خێرا و هەستی ئامادەبوون و شوێن وەکو دیالیکتیکی دووری و نزیکی و... رووداو وەکو ئەگەرێك و لە خۆوەیی و رێکەوت دەردەکەون (بڕوانە فریس بای، 1992 ل 163 –164).

لە کاتێکدا بە دڵنیاییەوە شتێکی شیاوە کە سەیری سیمیل بکرێت وەکو پۆستمۆدێرنیستێك، وەکو لە داهاتوودا دەبینین، سیمیل وا دەردەکەوێت کە زۆر شتی هەبێت کە زیاتر پەیوەستن بە تیۆری پۆست مۆدێرنستەوە لە چاو ئەوەی کە لە بواری بیردۆزە کۆمەڵایەتیە *Theory* کلاسیکییەکاندا دەیکات. راستییەك کە دەمێنێتەوە ئەوەیە کە بەلایەنی کەمەوە بەشێوەیەکی گونجاو وەها سەیری سیمیل بکرێت کە مۆدێرنیستێکە. تا ئەندازەیەك بە دڵنیاییەوە، خاڵی زیاتر جێگا سەرنجی سیمیل بە تایبەتی بریتییە لە شار و ئابوری پارە – کە ئەمانەش لە نێو دڵی مۆدێرنێتەدان. بەم جۆرە، تەنانەت لە حاڵەتی سیمیلیشدا و بە دڵنیاییەوە حاڵەتەکانی یان ئەو مەسەلانەی کە مارکس و ماکس ویبەر و دۆرکایم بایەخیان پێداوە، باشتر وایە کە وەها بیر لەو بیردۆزانە بکرێتەوە وەکو ئەوەی بیردۆزەکانی کۆمەڵناسی مۆدێرنیتە بن.

لە ساڵی 1920دا ئەم چوار بیرمەندەی خاوەنی بیردۆزی کۆمەڵناسی کلاسیکی مردبوون. کاتێ ئێمە بەرەو سەدەی بیست و یەك هەنگا و دەنێین، شتێکی ئاشکرایە کە جیهان زۆر جیاوازە لە چاو جیهانی ساڵی 1920دا. کاتێ ناکۆکییەکی تەواو هەیە لەسەر ئەوەی کە سەردەمی پۆست مۆدێرن لەکەیەوە دەستی پێکردووە (گریمانی دیاریکردنی ئەو ساتەی کە دەستی پێکردووە)، هیچ کەس مێژووی ئەو دەستپێکردنە ناباتەوە بۆ پێش ساڵی 1920. ئەم مەسەلەیە یان گۆڕانکارییەکانی جیهان لەو کاتەوە کە گۆڕانکارییەکان ئاسایی و بەردەوامن لەگەڵ ئەوانەی کە پەیوەندیدارن بە مۆدێرنێتەوە، یان زۆر سەرسامکەر و پچڕپچڕن جیهانی هاوچەرخ باشتر وەسف دەکرێت بە زاراوەیەکی نوێ کە ئەویش پۆست مۆدێرنە. ئەم مەسەلە پاشتر گفتوگۆ دەکرێت.

لێرەدا ئێمە بیروڕای هەندێ خاوەن بیردۆزی هاوچەرخ تاوتوێ دەکەین (کەسانێکی زۆری تریش هەن بۆ نموونە لیفیبڤێر 1962–1995، تۆراین 1995 واگنەر 1994، وود 1997) کە لێرەدا بواری لێدوانی کارەکانیان نییە، کە ئەو خاوەن بیردۆزانە بە ڕێگای جۆراو جۆر و بۆ ئاستی جۆراوجۆر وەها سەیری جیهانی هاوچەرخ دەکەن وەکو ئەوەی لە باشترین وەسفکردنیدا بە جیهانی مۆدێرن وەسف بکرێت.

### هێزی لەبن نەهاتووی
### (تێکشکێنەری) مۆدێرنێتە

لە هەوڵێکدا نەك تەنیا بۆ ئەوەی گونجاو بێت لەگەڵ بیردۆزە بنیادییەکەیدا، بەڵکو بۆ دروستکردنی وێنەیەك بۆ زیندوکردنەوەی بیردۆزی بیرمەندە کلاسیکیەکانی وەکو ماکس ویبەر و قەفەزە ئاسنییەکەی، ئەنتۆنی گیدنز (1990، بڕوانە میستروڤیك 1998 بۆ رەخنەیەکی باشتری بیردۆزی گیدنز لەسەر مۆدێرنیتە) وەسفی جیهانی هاوچەرخی کردووە (بەوەی رەگ

و ریشەکانی دەباتەوە بۆ سەدەی حەڤدەی ئەوروپا) بەوەی کە هێزێکی تێکشکێنەری هەموو دژەکانیەتی. بەشێوەیەکی زۆر تایبەتیانە گیدنز ئەم زاراوەیە بەکاردێنێ بۆ وەسفکردنی قۆناغێکی پێشکەوتووی مۆدێرنێتە - کە ئەویش مۆدێرنێتەی رادیکاڵ یان باڵا یان مۆدێرنێتەی قۆناغی دواییە. لەم کارەدا گیدنز دژی ئەوانە گفتوگۆ دەکات کە تەئکیدیان لەوە کردۆتەوە کە ئێمە پێمان ناوەتە سەردەمی پۆست مۆدێرنیزمەوە، سەرباری ئەوە گیدنز ئەگەری هەندێ جۆری پۆست مۆدێرنیزم لە ئایندەدا پێشکەش دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ ئێمە هێشتا لە سەردەمی مۆدێرنیزمدا دەژین، لە روانینی گیدنزدا جیهانی ئەمڕۆ زۆر جیاوازە لە جیهانی خاوەن بیردۆزە کلاسیکیەکانی کۆمەڵناسی. ئەمەی خوارەوە ئەو رێگایەیە کە گیدنز توانا و هێزی لەبن نەهاتوو (تێکشکێنەر)ی مۆدێرنێتەی پێ وەسف دەکات.

دەرپەڕینی مەکینەی وزەیەکی گەورە کە بەشێوەیەکی تەواو وەکو مرۆڤ وایە ئێمە دەتوانین بۆ مەودایەك بیجوڵێنین، بەلام ئەویش هەرەشەی ئەوە دەکات کە لە ژێر کۆنترۆڵی ئێمە دەربچێت و بتوانێت خۆی بەش بەش بکات. هێزی تێکشکێنەری مۆدێرنیتە ئەوانە تێکدەشکێنێ کە لە رووبیدا دەوەستن و لە هەندێ کاتدا وا دەردەکەوێت کە رێبازێکی چەسپاوی هەبێت، کاتی وا هەیە بە شێوەیەکی نائاسایی لە ئاراستەکان لادەدات و ئێمەش ناتوانین پێشبینی بکەین. سەرکەوتن بێ هیچ هۆکارێك بە گشتی نادڵگیرە یان بێ بەرامبەرە، ئەوەش ئاسایی شتێکە لەوانەیە مایەی ئاسودەیی بێت و بارگەکرابێت بە تێرامانێکی هیوابەخش. بەلام دوای ماوەیەکی درێژ کاتێ دامەزراوەکانی مۆدێرنیتە دەگەنە ئاستی بەردەوامی، ئێمە هەرگیز ناتوانین بە تەواوی کۆنترۆڵی هیچ کام لە رێباز یان شوێنی ئەو گەشتە بکەین. لە بەرامبەردا ئێمە هەرگیز توانامان نابێت کە بە تەواوی هەست بە دڵنیایی بکەین چونکە ئەو ناوچەیەی کە پیایدا مۆدێرنێتە دەڕوات بارگەکراوە بە سەرکێشییەکانی ئاکامی بالا. (بروانە گیدنز – 1990 – ل 139)

مۆدێرنیتە لە شێوازی هێزی تێکشکێنەری دژەکانیدا تارادەیەکی بەربلاو هێزێکی کاریگەری پڕ لە جوڵەیە. مۆدێرنیتە "جیهانێکە کە بە خێراییەکی لەرادەبەدەر کەوتۆتە جوڵە" لەگەڵ فراوانبوونێکی گەورەی شوێن و مەودا و فراوانبوونی گۆڕانکاری بەسەر سیستەمەکانی پێشتردا (بروانە گیدنز – 1991 – ل 16). گیدنز بەپەلەیە بۆ لەسەر رۆیشتنی ئەوەی کە ئەم هێزە لەبن نەهاتووەی مۆدێرنێتە پەیڕەوی یەك رێباز ناکات، لە سەروی ئەوەوە یەك پارچەش نییە، بەڵکو زیاتر پێکدێت لە ژمارەیەك بەشی ناکۆك و دژبەیەك. بەم جۆرە گیدنز پێمان دەڵێت کە ئەو بیردۆزێکی مەزنی شێوە کۆنمان پێشکەش ناکات، یان بیردۆزێکی ساکار، یان بیردۆزی گێڕانەوەیەکی بەربلاوی ناڕاستەوخۆمان ناخاتە بەردەم.

بیرۆکەی هێزی لەبن نەهاتووی مۆدێرنیتە بەشێوەیەکی جوان لەگەڵ بیردۆزی بنیادیدا دەگونجێت بە تایبەتی لەگەڵ گرنگێتی کات و شوێن لەو بیردۆزەدا. وێنەی هێزی لەبن نەهاتووی مۆدێرنێتە شتێکە بە پێی کات و شوێن دەجوڵێت. هەرچەندە ئەم وێنەیە بە باشی لەگەڵ جەختکردنی گیدنزدا لەسەر دەسەلاتی

کارکەرەکە نەگونجێت، ئەوا وێنەی ئەو هێزە لەبن نەهاتووە وا دەردەکەوێت کە وزەیەکی زۆر پێشکەشی ئەم میکانیزمەی مۆدێرنە بکات لە چاو ئەو نوێنەرانەی کە مۆدێرنە ئاراستە دەکەن (بڕوانە مێستروڤیك 1998 ل 155). ئەم کێشەیە لەگەڵ رەخنەسازییەکی تەواو گشتیدا دەگونجێت کە ڕێککەوتنێك لە نێوان جەختکردن لەسەر نوێنەرایەتی لە بەرهەمی بیردۆزەیی تەواوی گیدنز و شیکردنەوەی مێژوویی بنەڕەتیدا هەیە کە (ئاماژە دەکات بۆ هەژمونی ئامانجەکانی ئەو سیستەمە دژی توانای ئێمە بۆ گۆڕینی جیهان). (بڕوانە کرەیب 1992 ل 149)

## سەرچاوە

***George Ritzer. Sociological Theory. Fifth edition – New york. 2000. P.p. 555-558.***



***Plutarch***

***robert Lamberton***

***yale unicersity press_2003***

***P.218***

نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "ڕۆبێرت لامبرتۆن"ی مامۆستای فەلسەفەو زانستە سیاسیەکانە لە زانکۆی "ییل"ی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لێرەدا سەربوردەیەکی تەواو دەربارەی ژیان و بەرهەمەکانی فەیلەسوفی یۆنانی_ ڕۆمانی "بلۆتارک" دەخاتە ڕوو.

بیریارانی ئەوروپا لەسەرەتای ڕۆژگاری ڕێنیسانسەوە گرنگی ئەم پیاوەیان بۆ دەرکەوت و کەوتنە کۆکردنەوەی کۆی بەرهەمەکانی، لەژێر دوو ناونیشانی پان و بەریندا کە بریتین لە: (بەرهەمە ئەخلاقیەکان و ژیانی پیاوە مەزنەکان).

"بلۆتارک" ساڵی 46ز هاتۆتە دنیاوەو ساڵی 120ز کۆچی دوایی کردووە. خێزانەکەی دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتوو بووە، ئەمەش وایکردووە ژیانێکی خۆش بژی و بەشێوەیەکی دروست پەروەردە بکرێت و خوێندنێکی باشیش بخوێنێت. هەموو ئەمانە بوونە مایەی ئەوەی گەشە بە بەهرەکانی و کەسایەتی ئەو بدەن..

"بلۆتارک" چەندین جار چۆتە یۆنان و یەکەمجاریش سەردانی ئەسینای کردووە کە تا ئەو کاتەش پایتەختی دنیا بوو لەڕووی شۆرەت و شکۆمەندی و فەلسەفەوە. هەروەها بەسەردان چۆتە ئەسکەندەریەو دوای ئەوە سەرقاڵی نوسینەوەی بەرهەمەکانی بووە کە نیوەیان بەئێمە گەیشتووە.

سەبارەت بە ئەخلاق، ئەو پرسیارەی "بلۆتارک" دەیکرد بەمجۆرە بوو: (چۆن دەتوانین کەسی دۆست لە دوو ڕوو جیابکەینەوە، یاخود سودو بایەخی دوژمن چییە؟ یان لە بواری فەزیلەتدا بەرەو پێشچون هەیەو..هتد؟). سەبارەت بەم مەسەلەیە "ڕۆبێرت لامبرتۆن" دەڵێت: (لای بلۆتارك فەلسەفە تێکەڵ بە ئاکار دەبێت و لای ئەو فەلسەفە بێ ئاکار یاخود شارستانیەت بەبێ ئاکار، شتێکی بێ مانایە.. ئەو پێی وابوو ئەرکی فیکر ئەوەیە

دەستگیرۆی خەڵك بكات بەرەو چاكەو لەویشەوە بەرەو بەختەوەری.. بەختەوەری نابێت بەبێ فەزیلەت و ژیانێكی ڕاست و دروست و ئەنگێزەیەكی مرۆڤ دۆستانە بەرامبەر ئەوانی دی.. بلۆتارك وەكو ڕواقییەكانی نەدەكرد كە دەیانویست هۆكارە نا ئەقڵانییەكان و هەڵچون و ئارەزووە سەرەڕۆكان لەدەروونی مرۆڤەكان دەربهێنن, بەڵكو دەیویست لەڕێی ئەقڵەوە كۆنترۆڵیان بكات.. ئەو پێی وابوو ئاقڵ ئەو كەسەیە دەتوانێت جڵەوی هەست و سۆزی خۆی بكات, نەك ئەوەی ئەو كارەی پێ ناكرێت. بلۆتارك دوژمنی سەرسەختی ڕواقییەكان و شوێن كەوتوانی ئەبیقۆری فەیلەسوف بوو. ڕاستە ئەو بە قارەمانێتی و بوێری ڕواقیەكان سەرسام بوو, هەروەها هەندێك لە بۆچونەكانیانی پێ پەسەندبوو, بەڵام لەناخەوە بەتوندی دژایەتی دەكردن.. بلۆتارك بڕوای بە سروشتی مرۆڤایەتی و نەرم و نیانی ئینسان و تەنانەت بڕوای بە لاوازی و دەستە پاچەیی مرۆڤ هەبوو.. ئەو دەیزانی مرۆڤ ناتەواو و لاوازەو بە پێویستی دەزانی كە لاوازەكانمان خۆش بوێ و هاوسۆز بین لەگەڵیاندا, نەك بەچاوێكی سوك لێیان بڕوانین, وەكو ڕواقییە لەخۆباییەكان دەیانكرد.. سەبارەت بە ئەبیقۆریەكانیش _ واتە ئەوانەی شوێن لەزەت كەوتون لەژیاندا_ ئەوا ڕقێكی زۆری لێیان بوو, بەتەواوەتی دژی مەیلی مادیەت و بێباوەڕی ئەوان بوو.. هاوكات تەرێزی لە بایەخدانی زۆری ئەوان دەكرد, بە چێژو لەزەتەكانی ژیان كە بەلای ئەوانەوە لەسەروو هەموو بەهایەكەوە بوو).

كتێبە دیارو ناسراوەكەی كە تەرخانە بۆ كەسایەتییە بەناوبانگەكانی ناو مێژوو, بەدرێژایی ڕۆژگار جێگای سەرسامی بووە .. "بلۆتارك" هەندێك كەسایەتی مەزنی یۆنانی و ڕۆمانی هەڵبژاردووەو سەربوردەی ژیانیانی بۆ گێڕاوینەتەوەو وەكو نمونەیەك نیشانی داوین, لەناو ئەو كەسایەتیانەی مەزنی و خەسڵەتیانی باسكردووە, ئەمانە بوون: "ئەسكەندەری مەكدۆنی, یۆلیۆس قەیسەر, شیشرۆن و .. هتد".

لەڕاستیدا پەیوەندیەكی توندوتۆڵ لەنێوان فەلسەفەی ئەخلاقی "بلۆتارك" و ئەو كتێبەیدا هەیە كە تەرخانە بۆ مرۆڤە مەزن و بەناوبانگەكان.. دەتوانین بڵێین كتێبی دووەم جگە لە پراكتیزەكردنی كتێبی یەكەم بەشێوەیەكی عەمەلی, شتێكی تر نییە: كتێبی یەكەم تیۆرییەو دووەمیان عەمەلییە كە بەشێوەیەكی باشتر پرانسیپە فەلسەفیەكان ڕوندەكاتەوە, ئەویش لە میانەی لێكۆڵینەوە لەو كەسایەتیە زیندوانەی لەقۆناغێك لە قۆناغەكانی مێژوودا ژیاون.

### سەرچاوە

بیان الكتب, ژمارە (275), 2003/8/11.

## مۆنتسكیو

### بیرمەندی گەورەی ڕۆشنگەری

جان لاكوتیر

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ژمارەی لاپەڕە: 366 لاپەڕە

لەبڵاوكراوەكانی سویل/ پاریس/ 2003

دانـــەری ئـــەم کتێبـــە ڕۆژنامەنوسی بەتوانا و نوسەری بەناوبانگی فەرەنساجان لاکوتیرە کە یەکێکە لەگەورە شارەزایانی جیهـــانی عـــەرەبی لــــە ڕۆژهەڵاتییەوە بۆ ڕۆژئاوای، لە پەنجاکانـــدا وەك پـــەیامنێری ڕۆژنامـــە فەرەنســـییەکان لـــە قـاهیرەدا ئیشـی کـردووە، بـۆ ماوەیەکی درێژ چاوی بە جەمال عەبدولناسر کەوتووە. هـەروەها لـــە زۆربـــەی پایتەختـــەکانی مەغریبی عەرەبی نیشتەجێ بووە و بۆرقێبـە و حەسـەنی دووەم و ســــەرکردە مێژووییـــــەکانی ناســییوە، بەتایبــەت ئەوانــەی جـەزائیر، بـەڵام لایـەنێکی دیکـە هەیە لە ژیانی جان لاکوتیر کە پێدەچـێ نـەزانراوبێت ئـەویش: ســـەرقاڵبونیەتی بـــە نوســـینی سەرگوزشـــــتەی ژیـــــانی بلیمەتـــــەکانی فەرەنســـــا، چ سیاسـیەکان یـاخود ئەدیبـەکان یان بیرمەندەکانی.

ئـــــەوە جـــان لاکـــــوتیرە سەرگوزشـــتەی دیگـــۆڵی لـــە ســێ بەشــدا و سەرگوزشــتەی فرانســـوا میتێرانـــی لـــە دوو بەشدا نوسیوە و سەرگوزشتەی جـەمال عەبدولناســر و هۆشـــی منە و ئەندرێ مالرۆ و ستندال و چـــــــەندانی دیکـــــــەی نوســـیوە، کـــاتێکیش لێـــی دەپرسیت:

بەڕێز لاکوتیر تۆ لە ژیاندا چ کارەی؟ وەڵامتدەداتەوە: نوسینی سەرگوزشـــتەی کەڵـــە پیـــاوان. هاوکـات هەنـدێ کتێبـی گرنگـی سـەبارەت بـە جیهـانی عـەرەبی نوســـیوە، لەوانـــە (میســـر لـــە حاڵـەتی دینامیکیەتـدا) کـە بـە هاوبەشـــی لەگـــەڵ ســـیمۆن لاکوتیری هاوسەری نوسیویانە، هـــەروەها کتێبێکـــی دیکەشـــی لەگەڵ "جیرار خوری" و "غەسان ئـــــەلتوینی" بەناونیشـــــانی (ســـەدەیەك لـــە پێنـــاو هیچـــدا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبی لە ئیمپراتۆریـــەتی تورکییـــەوە بـــۆ ئیمپراتۆریـــــەتی ئـــــەمریکی) نوسییوە.

جـــان لاکـــوتیر لـــەم کتێبـــە تازەیەیـــدا قســـەوباس لەســـەر یـــــەکێك لەبیرمەنـــــدەکانی ڕۆشـــنگەری فەرەنســـا دەکـــات: ئەویش مۆنتسکیویە، زانراویشە جگـــە لـــە ڤـــۆڵتێر(دوژمنی سەرسەختی مۆنتسکیو) و دیدرۆ و جـان جـاك ڕۆسـۆ و ئـەوانی دیکـــە، مۆنتســـکیو ســـەدەی هـــەژدەمی بەخۆیـــەوە ســـەرقاڵ کردبوو. کاتێ ناوی مۆنتسکیو دەهێنرێـــت ئـــەوا دەمودەســـت کتێبـــــە بەناوبانگەکـــــەیمان دەکەوێتـــەوە بـــیر: (ڕۆحـــی یاســـاکان) کـــە تێیـــدا گەڵاڵـــەی تیـــۆرێکی تـــازەی بـــۆ یاســـای مـەدەنی و سیاسیخستوەتەڕوو. مۆنتسـکیو خـاوەنی ئـەو تێـزە بەناوبانگەیـە کـە جـەخت لەسـەر جیاکردنـــــــەوەی نێـــــــوان دەســـــەڵاتەکانی یاســـــادانان و جێبـــــەجێکردن و قـــــەزایی دەکاتەوە، ئەم تیۆرەش تا ئێستا لـــە هـــەموو وڵاتـــە دیموکراتییـــە مۆدێرنەکانـــــدا پـــــەیڕەوی لێـــدەکرێ. پێویســـتە دادوەران بێلایـــەنی خۆیـــان دەربـــڕن لـــە دەســەڵاتی جێبـەجێکردن، واتـە لەگـەڵ حکومـەت و وەزیرەکـان و نابێ لەلایـەن ئەوانـەوە فشاریان بخرێتەســــەر، گــــەر دادوەران ملیاندا بۆیان ئەوا ئەو بڕیارانەی

ده ـــه

نا ی

ده ـــه

تو ان

بکـ ێ

ده ی

فه ا،

نه ە.



لێرەوە قسەکردن ئاسانە، بەڵام جێبەجێکردنی ئەو قسانە گرانە.

هەرچۆنێك بێت تیۆرەکەی مۆنتسکیو ئاسەوارێکی پۆزەتیڤی هەیە و ناکرێ چاوپۆشی لێبکرێ، جیاکردنەوەی دەسەڵاتی ئەندام پەرلەمانەکان لەگەڵ دەسەڵاتی وەزیرەکان و لەگەڵ دەسەڵاتی دادوەراندا، مەسەلەیەکە بەشێوەیەکی گشتی لە وڵاتانی دیموکراسیدا پیادەکراوە، گەرچی هەندێ دەستدرێژی لەم لاو لەولا هەیە. مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت دامەزراندنی ئەم رژێمە دیموکراسییە تازەیەی دەسەڵاتەکان لێکدی جیادەکاتەوە تاکو هەریەکەیان بەباشترین شێوە ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن و هەروەها تاکو هەریەکەیان حەقی تەواوی خۆی بدات بە خاوەن حەق، ئەوا باشییەکەی بۆ مۆنتسکیو دەگەڕێتەوە.

شتی گرنگ لە کتێبەکەی جان لاکوتیر ئەوەیە کە مۆنتسکیوی بە شێوەیەکی باش خستۆتەوە نێو سەردەمەکەی خۆی، بیرمەند هەرچەندە بلیمەتیش بێت ئەوا ناکرێ لەو بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیرییە جیابکرێتەوە کە لەدەوروپشتیدایە.

لەمبارەیەوە دانەر ئاوا دەڵێت: پێویستە ئەوە بزانرێ کە ئەو مۆنتسکیۆیەی ساڵی 1689 لەدایك بووە و ساڵی 1755 مردووە، لە ماوەیەکی کودەتائامێز و وەرچەرخانێکی مێژوویی گەورەدا ژیاوە. لویسی چواردەهەم لە ساڵی 1643تاکو ساڵی 1715حوکمی فەرەنسای کردووە، واتە بەدرێژایی حەفتاو دوو ساڵ، ئەمەش درێژترین سەردەمی حوکمڕانی پاشایەتی بووە، لەبەر ئەم هۆیەش بوو پێیان دەوت پادشای گەورە یاخود بە پاشای پرشنگدار وەك رۆژ ناویاندەبرد. هەر ئەمیش بوو شاری فەرسای بنیادنا و لەو سەردەمەدا ئەو پایتەختی فەرەنسا بوو نەك پاریس، هەر لە سەردەمی ئەودا فەرەنسا مەزنترین هێزی ئابوری بوو.

بەڵام مردنەکەی لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا بەشێوەیەکی رەها مانای هەرەس هێنانی رژێمی ستەمگەرایی دەگەیاند، یاخود بڵێ مردنەکەی سەرەتای لێکهەڵوەشاندنەوەی پرۆژەکەی بوو، چونکە ئەم رژێمە بە کردەیی کۆتایی پێنەهات تەنها بە بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی نەبێت لە ساڵی 1789دا.

پاشان جان لاکوتیر بەردەوام دەبێت و دەڵێ: بەڵام ئەم رژێمە لەناو نەچوو تەنها ئەو کاتە نەبێت کە مەشروعیەتی مانەوەی خۆی لەدەستدا، کێن ئەوانەی ئەم مەشروعیەتەیان هەڵتەکاند و گومانیان لێکرد و دواتر روخاندیان؟ ئەوانە فەیلەسوفانی رۆشنگەر بوون. پاشاکانی فەرەنسا بەلای خەڵکییەوە سێبەری یەزدان بوون لەسەر زەوی و کڵێسای کاتۆلیکیش مەشروعیەتی خوایانەی بەسەردا پۆشیبوون، لەبەر ئەوە پادشای فەرەنسا مرۆڤێك نەبوو وەك هەر مرۆڤێکی دیکە. ئەو لەیەك کاتدا هەم مرۆڤ بووە و هەم لەسەرو مرۆڤیشەوە بووە و بەدرێژایی چەندین سەدە خاوەنی پیرۆزییەکی پرشان و شەوکەت بووە، ئەم پیرۆزییەش بووە کە فەیلەسوفان لەبەریان داماڵی، کاتێ دەستیان کرد بە رەخنەگرتن لە مەشروعیەتی کۆن کە پادشای واپیشاندەدا گوایە لەسەر و گەل و لەسەرو مرۆڤایەتییەوەیە.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو شەڕی نێوان فەیلەسوفانی رۆشنگەر لەگەڵ (پیاوانی ئاینی)

مەسیحیدا دەستپێکرد، ئەوانە کەسێتی پادشایان پیرۆز دەکرد و سیفەتی پیرۆزکردنیان لەرێگەی بەکارهێنانی ئاینی مەسیحیەوە بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنا، بەلام فەیلەسوفان وتیان پادشای فەرەنسا مرۆڤە و مەعسوم نییە و نابێ سیفەتی خوایانەی بدرێتی یاخود ئاین بۆ ئەم مەبەستە ئیستغلال بکرێت. ئیدی لەو کاتەوە هۆشیاری فەرەنسی–ئەوروپی بەگشتی– ئەوەی بۆل هازار ناوی دەنێ قەیرانی هۆشیاری ئەوروپی هاتە ئاراوە، ئەوەشی بۆل هازار ناناسێ، ئەوا ئەو کەسەیە کە بە فەرەنسی کتێبگەلێکی گرنگی لەسەر فەلسەفەی رۆشنگەری نوسیوە.

فەیلەسوفانی رۆشنگەری راڤەکردنێکی عەقلانیان بەخشییە مەسیحییەت، ئەم راڤەکردنەش بە تەواوەتی پێچەوانەی راڤەکردنی قەشە و کاهینەکان بوو. هەر لەم راڤەکردنە پێچەوانەیەشەوە بوو کە هۆشیاری ئەوروپی لەگەڵ خودی خۆیدا کەوتە قەیرانەوە، پیاوانی ئاینی شتێکیان بەگەل دەوت و فەیلەسوفەکانیش شتێکی دیکە. ئیدی گەل نەیدەزانی چۆن هەڵسوکەوت بکات و نەیدەزانی بە دروستی باوەڕ بەکامیان بکات، ئایا باوەڕ بە فەیلەسوفەکان بکات یاخود بە قەشەکان؟ بەلام لە واقیعدا خەڵکە رەش و روتەکە لەبەر ئەوەی نەخوێندەوار و تێنەگەشتو بوون کەوتنە شوێن قەشەکان، هەر بۆیە لە کڵێساکاندا گوێیان بۆ قسە و پەندو ئامۆژگاری پیاوانی ئاینی دەگرت و لەوەش زیاتر هیچیان نەدەزانی.

لێرەوە کاتێ قسە لە قەیرانی هۆشیاری ئەوروپی دەکەین، ئەوا مەبەستمان قەیرانی رۆشنبیران یاخود چینی خوێندەوارە کە خوێندن و نوسین دەزانن نەك قەیرانی خەڵکە رەش و روتەکە.

جان لاکوتیر وایدەبینێ دواجار کتێبی فەیلەسوفەکان خەڵکیان فێرکرد گومان لە قسەی پیاوانی ئاینی بکەن، لێرەوە قسەی پیاوانی ئاینی راستگۆیی خۆیان لەدەستدا.

ئالەم کەش و هەوایەدا مونتسکیو ژیاوە و گەورە بووە، لەبەر ئەوە تیۆرەکەی کە لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (رۆحی یاساکان) باسی لێوەکردووە، تیۆرێکی عەمەلی تەواوە و لەژێر کاریگەری قسەی قەشەکاندا نەبووە، بەڵکو بەو تێبینیانە کاریگەربووە کە واقیع خستونیەتیە روو.

بگرە جان لاکوتیر تا ئەو ئاستە دەروا کە مونتسکیو بە یەکەم کەس دادەنێ لە دامەزراندنی زانستی کۆمەڵناسیدا، چونکە ئەو یاساکانی بە بارودۆخی کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و سیاسییەوە بەستۆتەوە. بگرە یاساکانی بە جوگرافیای ولاتانی پەیوەندیدارەوە گرێداوە، هەر ولاتێ بەگوێرەی بارودۆخی مێژویی خۆی و عادات و تەقالیدو بگرە تەنانەت بەگوێرەی بارودۆخی ئابوری ولاتەکەیەوە یاساکان دادەرێژێ. ئەم بەستنەوەیەی نێوان یاساکان لەگەڵ بارودۆخی مادی ئەوەیە کە بلیمەتی مونتسکیو و تازەگەری ئەو پیشاندەدات، لە واقیعدا مونتسکیو شۆرشێکی لە عەقڵیەتی خەڵکیدا بەرپاکرد، کاتێ تێروانینی ئەوانی بۆ مێژو بۆ واقیع و بۆ چارەنوسیان گۆری.

کتێبەکەی مۆنتسکیو (رۆحی یاساکان) کە ساڵی 1748دەرچووە، سەلماندی پەیوەندییەکی کۆنکرێتی لەنێوان فاکتەرە کۆمەلایەتی و جوگرافی و سیاسی و ئابوری و

دینیەکاندا هەیە، بەڵام پێشتر خەڵك باوەڕیان وابوو کە تێڕوانینەکانی کڵێسای مەسیحی یاخود غەیبانیەتە کە تەحەکوم بە مرۆڤ و دواڕۆژیانەوە دەکات و جگە لەوانە هیچی دیکە نییە، کەس ئاگاداری ئەوە نەبوو فاکتەرە مادی و کۆمەڵایەتیەکان ڕۆڵیان هەیە، تائەو کاتەی مۆنتسکیو هات. ئەمەش مانای وایە ئەو دانەری بنچینەی زانستی کۆمەڵناسییە و شۆڕشێکی لە عەقڵیەتی ئەوروپییەکاندا بەرپاکرد، بەڵام ئیبن خەلدون تاڕادەیەك پێش ئەو کەوتبوو.

لێرەوە یاسا وەزعییەکان کە تەحەکوم بە مرۆڤەوە دەکەن، بەرهەمی مەرجە مادییەکان و فاکتەرە کۆمەڵایەتیە هەستپێکراوەکانە کە تەوقی یاساکانی داوە. ئایا مونتسکیو پێش مارکس مارکسی بووە؟ بەڵێ تاڕادەیەك، بەڵام بەمەرجێ ڕۆڵی فاکتەرە فیکری یاخود عەقائیدیەکان لە گەڵاڵە بونی یاساکاندا پیشتگوێ نەخرێت. ئالێرەدا جیاوازی لەنێوان تێڕوانینی ئەو و مارکسدا هەیە، چونکە فاکتەرە مادییەکان هەموو شتێك نییە و- وەك ئەوەی مارکسییەکان پێیان وایە- ناتوانێ هەموو شتێك یەکلایی بکاتەوە، بەڵکو فاکتەرە مەعنەوی و عەقائیدی و ئاینییەکانیش ڕۆڵیان هەیە و ئەو ڕۆڵەش گاڵتەی پێناکرێ و ناکرێ تەنها والێیبڕوانین گوایە ئەوە ڕەنگدانەوەی بونیادی ژێرخانی کۆمەڵگایە.

جان لاکوتیر لەم کتێبەیدا بەشێك بۆ قسەکردن لەبارەی کەسایەتی مونتسکیو و هەڵسوکەوتی و چۆنیەتی ژیانی بەشێوەیەکی گشتی تەرخاندەکات، ئەو بەشەش بەشێکی نایاب و خۆشە. دانەر ئاوا دەڵێ: لە مێژوی ئەدەبدا کەسێك نابینیت هێندەی مونتسکیو وێنەیەکی پێکەنیناوی و گەشبین و دڵخۆشی دابێت بەخۆی! گەر کتێبی یاداشتنامەکان بخوێنینەوە، ئەوانەی لە مێژودا هەر لە ئەبیقۆرەوە تاکو ئەندریە جید و لە گۆتەوە بۆ واڵت ویتمان نوسراون، دەبینین ئەو گەورە نوسەرانە باس لە نەهامەتی و ناسۆرییەکانیان دەکەن، هەروەها باس لە خۆشییەکانیشیان دەکەن، بەڵام زیاتر باس لە نەهامەتیەکانیان دەکەن، کەچی مونتسکیو تاڕادەیەك وێنەیەکی تەواو پۆزەتیڤمان دەداتێ.

لەواقیعدا مونتسکیو سەرنجە تایبەتیەکانی خۆی لە کتێبێکدا تۆمارکردووە، بەمەش لە دوای خۆی گەواهیدەرێکی زیندوی لەسەر کەسێتی خۆی جێهێشتووە.

لەو کتێبەدا دەڵێ: بەخۆشحاڵییەکی زۆرەوە لەدایك بووم و پێویستە دان بەوەدا بنێم کە بلیمەتیەکەم یاخود کەسایەتیەکەم بەرهەمی ئەم لەدایك بوونە خۆشحاڵەم بووە. پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێ: من خۆم باش دەناسم، دانی پێدا دەنێم لە ژیانمدا خەم و خەفەتم زۆر نەبینیوە، دوژمنی زۆرم نەبووە، لە واقیعدا ئەوە خوێندنەوە بوو لە وەڕسی ژیان ڕزگاری کردم، کاتێ هەستم بە ناخۆشییەك دەکرد ئەوا هێندە بەس بوو بۆ ماوەی کاتژمێرێك لەهەرکتێبێك بێت بخوێنمەوە تاکو ئەو ناخۆشییەم بڕەوێتەوە.

دواتر مونتسکیو بەردەوام دەبێ و دەڵێ: بەیانیان کە لە خەو هەڵدەسام، بە هاتنی سپێدە هەستم بە خۆشی و شاگەشکە بوون دەکرد، کاتێ کە پرشنگی ڕوناکیم دەبینی لە خۆشیەو کامەرانیدا دەکەوتمە سەماکردن و بەدرێژایی ڕۆژەکەش

بەکامەرانی دەمامەوە. بێگومان بەردەوام حەزم لە کاری چاکە بووە و بەرژەوەندی وڵاتم خستبووە پێش هەموو شتێکەوە، کاتێکیش شتێکم بۆ بەرژەوەندی گشتی دەکرد ئەوا لەناوەوەی خۆمدا هەستم بە ڕازیبوونێکی گەورە دەکرد. لەسەرەتای ژیانمدا بەشێوەیەکی بەربلاو ڕۆچوبومە نێو ژیانی کۆمەڵگا و بارەکان و لەزەت وەرگرتنەوە، لەوبڕوایەدا بووم من بێ ئەوانە ناتوانم بژیم. ژیانی گۆشەگیری و تەنهایی زۆر ترسناك و تۆقێنەرانە دەهاتنە بەرچاوم، بەڵام کاتێ پشتم کردە دنیا و گەڕامەوە بۆ گوندەکەم و بۆ تەنهایی و هێمنی لادێی جوان، ئیدی نەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ ژیانی نێو قەڵەباڵخی و هەراوزەنا.

ئاوا دەبینین مونتسکیو وەك چۆن مرۆڤێکی شەریف، ناسك، خۆشمەشرەب بووە، بەهەمان شێوەش فەیلەسوفێکی قوڵ و مرۆڤێکی گەورە بووە، بەڵام داخۆ ئەو فەیلەسوفە گەورانە کێن کە کاریگەریان هەبووە بەسەرییەوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە جان لاکوتیر دەڵێ: دەبێ کاریگەری فەلسەفەی ئینگلیز لەسەر مونتسکیو لەیادنەکەین بەتایبەتی فەلسەفەی ئیسحاق نیوتن یاخود ڕاستتر زانستە گەورەکەی نیوتن. لە واقیعدا نیوتن تەنها کاریگەری بەسەر ئەوەوە نەبوو، بەڵکو کاریگەری بەسەر هەموو نەوەکەیەوە هەبووە، کاریگەریەکەی گەورە بوو وەك کاریگەری دیکارت بەسەر نەوەی پێش ئەوەوە.

ئەو وانە گەورەیە چی بوو کە مونتسکیو لە نیوتنەوە فێری بوو؟ئەو وانەیە بریتی بوو لەوەی هەمان ئەو یاسا هۆکاریانەی نیوتن بەسەر سروشتدا پراکتیکی دەکرد ئەو بەسەر مرۆڤایەتیدا پراکتیکی بکات، چونکە پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکان نە پەیوەندیەکی ئاژاوەگێڕانە و نە پەیوەندیەکی بێهودەییانە بوو وەك ئەوەی لێیتێگەشتبووین، بەڵکو ئەو پەیوەندیانە بە نهێنی ملکەچی یاسا گشتیەکانن. ئەو وانە گەورەیەش کە نیوتن فێری کردین ئەوەیە چینەکانیش هەندێ یاسا هەیە کە تەحەکومیان پێوەدەکات، لێرەوە هەموو شتێ لەم گەردونەدا بەویستی کۆمەڵێ یاسای دیاریکراو دەڕوات بەڕێوە کە پەروەردگاری مەزن دروستی کردووە.

ئەرکی بیرمەند و فەیلەسوفانیش ئەوەیە ئەو یاسایانە ئاشکرا بکەن، بەم مانایەش نیوتن و فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری هەمویان باوەڕداربوون. لێرەوە دەستەواژە بەناوبانگەکەی "لویس باستۆر"یان بەسەردا جێبەجێ دەبێ کە دەڵێ: (زانستی کەم لە یەزدان دوورت دەخاتەوە و زانستی زۆر دەتگەڕێنێتەوە بۆلای!)، ئەمەش ڕاستە و لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە یەك دەگرێتەوە: (انما یخشی اللە من عبادە العلماء).

مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت مونتسکیو پێش جان جاك ڕۆسۆ تیۆرەی سیاسی بەناوبانگ ئەوەی پێیدەوترێ (پەیمانی کۆمەڵایەتی) ئاشکرا کردووە، بەڵام توانستی ڕۆسۆ لەوەدا دەردەکەوێت کە توانی ئەو تیۆرەیە بەشێوەیەکی ڕون و ئاشکرا زیاتر گەڵاڵە بکات. حوکمکردن لە تێڕوانینی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری بووە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان حاکم و حوکمکراوەکان، یاخود لەنێوان حکومەت و گەلدا، گەر حکومەت لەو پەیمانە لایدا ئەوا

گەل بۆی هەیە ئەو حکومەتە لابدات، چونکە دواجار سەروەری بۆ گەلە کە سەردارێکی بێلایەنە.

**سەرچاوە**

بیان الکتب

## ژنانی نۆبڵ

لە عەرەبییەوە: سەردەم




لە چاپکراوەکانی وەکالەتی رۆژنامەوانیی عەرەبی لە قاهیرە کتێبێکی تازەی خالد محەمەد غازی نووسەر بە ناوی (ژنانی نۆبڵ: ئەو ژنانەی خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرتووە) دەرچووە. کتێبەکە 185 لاپەڕەی مام ناوەندە و باس لە خەونی هاوبەش و ئەزموونی تاڵی ژنە داهێنەرەکان دەکات و، ئەو چەوسانەوە فیکری و کۆمەڵایەتی و رەگەزپەرستیە دەردەخات کە ئەو نووسەرانە کۆدەکاتەوە. ئەگەرچی زوربەیان لە وڵاتانێکدا ژیاون کە شۆڕشی پیشەسازی و فیکریان بە خۆوە دیوە. ژنە داهێنەرەکانی کەرتی ئاسیا بە تەواویی لەم خەڵاتە بێ بەشبوون و، ژنانی کەرتەی ئەفریقیاش لەوان چاکترنین، بێجگە لە "نادین جوردیمر"ی ئەدیب کە بە هاونیشتمانیەکی خوارووی ئەفەریقا ناودەبرێت و، لە ڕاستیدا بەرەگەز ئەوروپاییە. چونکە دایک و باوکی لە ئەوروپاوە چوونەتە ئەفریقا و لەوێ لە دایک بووە.

نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا دەڵێت: مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنیا باسی ئەو ژنانە نیە کە خەڵاتی نوبڵیان وەرگرتووە، یان بۆ جیاکردنەوەی پیاو وژن بێت لە وەرگرتنی خەڵاتەکەدا، یان دابەشکردنێکی رەگەزیی بێت. بەڵکو بە پێی پێدراو و پێویست کۆمەڵێك پاسا و هەن، لە ژیان نامەی تایبەتی ئەو ژنە داهێنەر و شاعیر و رۆمان نووسانەوە دەردەکەون کە خەڵاتی نۆبڵیان پێبەخشراوە.

کتێبەکە سیانزە نەسك (فەسڵ)ە، بێجگە لە سێ پاشکۆی گرنگ، پاشکۆی یەکەمیان بە ناوی (نۆبڵ: بلیمەتی و خەڵاتی ناوازە) لەم بەشەدا باس لە ژیانی (ئەلفرید نۆبڵ)ی خاوەنی خەڵاتەکە و وێستگە سەرەکیەکانی ژیانی دەکات. پاشکۆی دووەم (دەزگای نۆبڵ.. مەرجەکان و یاسا) و پاشکۆی سێیەم بە ناوی (خەڵاتەکە و ئاکادیمیای سوید)ەوەیە. بەڵام سیانزە نەسکەکە لە یەکەمیاندا نووسەر باسی ئەو نۆ ژنە داهێنەرە و باری ژیانیان دەکات، پاشان بۆ هەر یەکێکیان نەسکێك تەرخان دەکات. رووناکی دەخاتە سەر ئەدەب و بەرهەم و ژیانیان، ژنە نوسەرەکان ئەمانەن: نووسەری سویدی سلمی لا جیر لوف – نووسەری ئیتالی جراتسیا دیلیدا – نووسەری زنجی تونی موریسون – شاعیری جوولەکە نیللی ساخسی – نووسەری ئەفریقایی نادین جودیمر – نووسەری پۆڵەندی فیسلاف شیمبور سکا – رۆمان نووسی نەرویجی سیجرید

ئەندسیت – نووسەری ئەمریکایی بیرڵ باك.

نووسەر نەسکێکی بۆ (خاڵە هاوبەشەکانی نێوان نۆبڵیەکان) تەرخان کردوە، نەسکێکی تری بە ناوی (بازنەی گومان) و دوا نەسکی بە ناوی (خەلاّتەکە لە ولاّتانی عەرەبدا).

خالد غازی نووسەر دەڵێت: نۆ ژن بەرانبەر ژمارەیەکی زۆری پیاو، ئەمە رێژەیەکی کەمە.. دەشێت نیمچە گومانێك لەوە بکرێت کە بۆچی ژنانی داهێنەر دوور خراونەتەوە، ناوی ژنانی عەرەب و ئاسیەویش بۆ خەلاّتەکە هەر لە ئارادا نیە؟ ئەمە لە کاتێکدا گریمانەی ئەوە بکەین کە هەندێك لەو ناوانە خودی ئاکادیمیای سویدی دەستنیشانی کردوون کە هەر خۆیشی خەلاّتەکە دەبەخشێت. هەرچۆنێك بێت ئەو خەلاّتانە و بۆ ئەو ژنانە گەلێك مەبەستی لە دواوەیە و وەلاّمی هەندێك پرسیاریش کە تا ئێستا دەکرێت.

نووسەر جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە گوشاری زۆر لەسەر خەلاّتەکە هەیە. دیارترینیان ئەوەیە کە مەرجی بەخشینی خەلاّتەکە ناگۆڕێت و هیچ هەوڵێکیش بۆ پێشخستنی نادرێت کە لەگەڵ گۆڕانە تازەکانی هەر سەردەمێکدا بگونجێت. هەروەها لیژنە تایبەتەکانی پالاّوتن پەیوەندیان بە میریەوە هەیە لە دەوڵەتەکەیاندا، کەواتە گرانە بۆ لیژنەکە گوێنەداتە لایەنی سیاسی و پەیوەندیی دەوڵەتەکەیان بە دەوڵەتانی گەورە و بچوکەوە، بە تایبەتی لە مەسەلەی ئاشتی و رەگەزپەرستیدا.. دەبێت ئەو گوشارە سیاسی و رەگەزپەرستیەیش لەبەرچاو بگرین کاتێك خەلاّتەکە دەدرێتە نووسەرێکی بێ نێوبانگ کە لە ئاستی ئەو لووتکانەدا نیە کە ئەو خەلاّتەیان دراوەتێ.

لەگەڵ ئەم ڕاستیانەیشدا ئایا دەبێت عەرەب چاوەڕوانی نۆبڵی نوێ نەکەن؟ قەڵەمەکانیش واز لە پێشبینی پالێوراوانی نوێ بێنن؟.. دەشێت هەموو ساڵێك لە ئۆکتۆبەر یان نۆڤەمبەردا ئەدیبێکی تری نۆبڵ تووشی سەرسامیمان بکات؟ کەی ناوی ژنە نووسەری عەرەبمان بۆ خەلاّتەکە بەرچاو دەکەوێت؟

**سەرچاوە**

سایتی ئیلاف 28 یونیو 2004

# پاد ... ڵی

### بۆ ... ە

### مەر ... ش




له عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد

دەزگای *Praemium Erasmianum*ی هۆڵەندی رایگەیاند کە پاداشتی ئیراسمۆسی ئەمساڵ دەدرێ بە روناکبیری سوری سادق جەلال عەزم و ژنە داهێنەری مەغریبی فاتیمە مەرنیسی و بیریاری ئێرانی عەبدولکەریم سروش. ئەم پاداشتە ساڵانە دەدرێت بەو روناکبیرەی کارێکی فیکریی گرنگ پێشکەش بکات کە لە گرنگترین کایە و رواڵەتە رۆشنبیری و کۆمەلاّیەتییەکان بکۆڵێتەوە و کاریگەرییەکی روونی لەسەر ژیانی رۆژانەی کۆمەڵگە هاوچەرخەکانی ئێمەدا هەبێت. بری ئەم پاداشتە بریتییە

لە سەدو پەنجا هەزار یۆرۆ کە لە کۆتایی هەموو ساڵێکدا و لە ئاهەنگێکی رەسمی لە ئەمستردامی پایتەختی هۆڵەندە دەبەخشرێ بەو کەسانەی پاداشتەکە دەبەنەوە. دەستەی سەرپەرشتیاری پاداشتەکە بۆ ئەمساڵ بابەتێکی گرنگ و هەستیاری هەڵبژاردووە لە بارەی "ئیسلام و مۆدێرنە" و هەموو ئەو کارلێك و کاریگەرییانەی لە پەیوەندیی نێوان ئیسلام و مۆدێرنەوە دروست دەبن کە دەشێت ببنە مایەی پێشکەوتنی سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتی، یان بە پێچەوانەوە ببنە مایەی پاشکەوتوویی. لیژنەی بریاردانی پاداشتەکە بەرهەمی فەلسەفی و فیکری و رۆشنبیریی ئەو سێ بیریارەی لەبەرچاو گرتووە کە ڕۆڵێکی رۆشنبیریی دیاریان هەبووە چ لە بواری رەخنە لە فیکری ئایینی یان لە وەرگرتنی تیۆرە نوێیەکان و بە دەنگەوە چوونی دیاردە و ڕواڵەتەکانی گلوبالیزم و بانگەشە کردن بۆ مۆدێرنیزە کردنی کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکان و پەرەپێدانی زانستە مرۆڤایەتییەکان و بانگەشەی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت و جەختکردن لە مافەکانی مرۆڤ بە تایبەتی مافەکانی ژنان.

ئەم پاداشتە وەك رێزلێنانێك بۆ بەرهەمە فیکرییەکانیان دراوە بەو سێ رووناکبیرە، چونکە بەرهەمەکان پەیوەندییەکی نزیکیان بە مەسەلە رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە هەیە، هەروەها رۆڵی ئایینی ئیسلامی بە تایبەتی لە کۆمەڵگە ئەورووپی و خۆرئاواییەکاندا. گرنگترین ئەو کتێبانەی سادق جەلال عەزم چاپی کردون، ئەمانەن: "رەخنە لە بیری ئایینی"، "خۆرهەڵاتناسی و خۆرهەڵاتناسیی پێچەوانە"، "زەینیەتی تەحریم"، "پاش زەینیەتی تەحریم"، "گلۆبالیزم چییە؟". بەڵام فاتیمە مەرنیسی ژمارەیەکی زۆری کتێب و لێکۆڵینەوەی چاپ کردووە، لەوانە: "حەریمی سیاسی"، "سێکس وەکو ئەندازەیەکی کۆمەڵایەتی"، "حیجاب و دەستەبژێری نێرینە"، "مەغریب لە میانی ئافرەتەکانیدا"، "ترس لە مۆدێرنە: ئیسلام و دیموکراسیەت"، "شەهرەزاد خەڵکی مەغریب نییە"، "چەند سوڵتانەیەکی لە بیرکراو"، "ژنان لەسەر باڵی خەون"، مەرنیسی ساڵی پار پاداشتی میر ئوستریاسی ئەدەبیی لە ئیسپانیا وەرگرتووە.

عەبدولکەریم سروشی توێژەر و بیریاری ناوداری ئێرانی، لە زانکۆی تاران دکتۆرای لە دەرمانسازی وەرگرتووە، لە زانکۆی لەندەنیشدا دکتۆرای لە فەلسەفەی زانست بە دەستهێناوە، سروش یەکێکە لەو بیریارە ئێرانییە دەگمەنانەی بەرهەمگەلێکی ئێجگار زۆری هەیە. کاتێك رژێمی شا رووخا، سروش گەڕایەوە بۆ ئێران و لە "لیژنەی شۆڕشی رۆشنبیری"دا بوو بە ئەندام، دواتر پەیوەندیی بە کۆمەڵەی حیکمەت و فەلسەفەوە کرد. توێژینەوە بەراییەکانی عەبدولکەریم سروش پتر لە بارەی تیۆری مارکسیزم و بابەتەکانی فەلسەفەی زانستی بوون کە دواتر بۆ ماوەی چەندین ساڵ لێیان دابڕا. سروش زۆر لە ئێران نەمایەوە، لە ساڵی 1996 بەناچاری وڵاتی جێهێشت و رووی کردە ئینگلتەرە و لەوێشەوە بەرەو تاراوگەی کەنەدی. ئەمە بەهۆی ئەو مشتومڕە توندو تیژانەوە بوو کە گۆڤاری *Kiyan* ی فیکری دەیوروژاندن بە تایبەتی ئەو وتارانەی سروش تیایدا بڵاوی

دەکردنـــەوە و ســـەرجەمیان لـــە بــــارەی فرەیــــی ئــــایینی و لێکۆڵینەوە هیرمینیۆتیکییەکان و لێبـوردنی ئـایینی و دەســەڵاتی ئیکلیرکی لە دەوڵەت بوون.

ســروش هــەر لــە ســاڵی دوو هــەزارەوە لــە چــەندین زانکــۆی ئەورووپیـدا دەرس دەڵێتـەوە، بـۆ نموونـە: هارفـارد، یـالا، بـەرلین، کــەپتر، موحــازەرە لــە بابــەتی "ئیســـــلام و دیموکراســـــیەت" دەڵێتـەوە. گـرنگترین کتێبـەکانی سـروش کـە مشـتومڕێکی گـەرمی لە ئێراندا ناوەتەوە، ئەمانەن:

"فەلســـــەفەی مێـــــژوو"، "زانســـــت چـــییە؟ فەلســـەفە چـــییە؟"، "چـــەند ڕێگەیـــەکی دروســـت لـــە بـــارەی فرەیـــی ئـایینی"، "ڕۆمیـی مەسـنەوی"، "سروشـــــتی ناســـــەقامگیریی گەردوون"، "چەند لێکچەرێك لـە فەلســـــــــەفەی زانســـــــــتە کۆمەڵایەتییـــەکان"، "عـــەقڵ و ئــــازادی و دیموکراســــیەت لـــە ئیســـلامدا"، جگـــە لـــە دەیـــان توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی فیکری لــە کایــە جیاجیاکــانی زانســتە مرۆڤایەتییەکان.

**سەرچاوە**

*www.kikah.com*

## ڕاوچی خەڵاتەکان

### "جۆن ماکسویل کوتزییە"

لە عەرەبییەوە: سازان قادر

کۆتزییە نوسەر و ڕەخنـەگری کۆمەڵایەتیـە، نـاوێکی دیـارە لـە ئــــەدەبی جیهانیـــدا و بـــراوەی خەڵاتی نۆبلی (2003)یە، لەگەڵ ئــــەوەی چــــەند ڕۆمـــــانێکی بـەناوبانگی نووسـیوە، خـاوەنی



چەندین وتاریشە کە لە ڕۆژنامە جــــــــۆراو جۆرەکانــــــــدا بڵاویکردۆتەوە. ئەم وتارانەیشی لـــە دوو کتێبـــدا کۆکردۆتـــەوە ئـەوانیش (تاوانبـارکردن) سـاڵی 1996 و (کـەنارەکانی خۆرئـاوا) سـاڵی 2001، کتێبـی یەکـەمیان چــەند وتــارێکی کۆمەڵایەتییـــە بــەڵام کتێبــی دووەمیــان چــەند ووتارێکی ئەدەبی لەخۆگرتووە.

کۆتزییــــــە لــــــە دیــــــدی ڕەخنەگرەکانـەوە بـە یـەکێك لـەو نووســــــــەرە بەتوانایانـــــــــە دەژمێردرێــت کــە توانیویـــەتی بەشـێوەیەکی فانتـازی و ڕەسـەن مامەڵــە لەگــەڵ کێشــە سیاســیە گرنگەکاندا بکات.

سـیمای نووسـینی کوتزییـە ســــانایی و شــــیکردنەوەیەکی لۆژیکی شتەکانە، کە دوا ڕۆمانی (ئیلیـــــزا بـــــیس کاســـــتیو)ی بڵاوکردەوە سۆز و خۆشەویستی ژنانی بە دەست هێنا..

بـۆ زیـاتر ئاشـنابوونمان بـەم نووســــەرە کــــە شــــیکەرەوەی نەخۆشیەکانی کۆمەڵگاکەیـەتی، دەبێـت گوزەرێـك بـە گـرنگترین ڕۆمانیدا بکەین.

جـــۆن ماکســـویل کۆتزییـــە سـاڵی 1940 لـە شـاری "کیـب تـــاون"ی خـــوارووی ئـــەفریقیا لــەدایك بــووە، خوێنــدنی لــە هــەردوو ڕشــتەی ئینگلیــزی و ماتماتیکـــدا لـــە زانکۆکـــانی ئـــەفریقیا و بـــەریتانیا تـــەواو کردووە.

لـە سـاڵی 1973دا وانـەی لـە زانکۆکانی ئەفریقیا و بریتانیا و ئەمـەریکادا وتۆتـەوە، سـەرەتای ڕێگـەی ئەدەبیشـی بـە ڕۆمـانی (*zoon - darknes*) واتـە (زەوی تـاریکی) لـە سـاڵی 1974 دەست

پێکردووە، لە دوای ئەمیش بە سێ ساڵ ڕۆمانی (لەناو دڵی نیشتمان) ساڵی 1977 بەمەش خەڵاتی خوارووی ئەفریقای (*CAN*)، وەرگرتووە. کە لە حەفتاکاندا ڕۆمانی (لە چاوەڕوانیی بەربەرەکاندا)ی بڵاوکردەوە و خۆشەویستی و ناوبانگی زیاتر برەوی سەند. کە ڕۆمانی (هەندێ لایەنی ورد و درشتی ژیانی مایکل کی) لە ساڵی 1983 بڵاوکردەوە، خەڵاتی (پۆکەر)ی بەریتانیی وەرگرت و بوو بە ناوێکی جیهانی.

لە دوای ئەمیش ڕۆمانی (دوژمن) ساڵی 1987 توانی خەڵاتی کتێبی جیهانی لەلایەن ڕۆژنامەی (سەندەی ئێکسبریس)ەوە بەدەستبهێنێت.

کوتزییە لەسەر شێوازە سەرکەوتووەکەی بەردەوام بوو تا ساڵی 1992 کە ڕۆمانی (مامۆستا پەترسبۆرگ)ی نووسی خەڵاتی تایمزی دەوڵەتی لە ئێرلەندادا پێبەخشرا، پاشان ساڵی 1997 ڕۆمانی (زارۆیی) نووسی کە باس لە ڕەوتی منداڵی خۆی دەکات، لە دوای ئەمیش لە ساڵی 1999دا ڕۆمانی (بەدناو)ی بڵاوکردەوە و بۆ جاری دووەم خەڵاتی (پۆکەر)ی وەرگرتەوە.

## بەرهەمەکانی نوسەر:

**(زەوی تاریکی) ساڵی** 1974

زەوی تاریکی یەکەم بەرهەمی نووسەرە و نمونەیەکی خۆسەلماندنی نووسەر و توانای دەسەڵاتیەتی بەسەر زەمەن و شیکردنەوەی بارودۆخەکان.

ئەم ڕۆمانە بەسەرهاتی پیاوێك دەگێڕێتەوە کار بۆ یەکێك لە دامەزراوە ئەمریکیەکان دەکات، لە ڕۆژەکانی جەنگی ڤێتنامدا و ئەو شەڕە دەرونیەی لێی دەکەوێتەوە. لەم ڕۆمانەدا دوو هێڵ بۆ هەڵهاتن دەبینین و لەگەڵ بەکارهێنانی جەنگی دەروونی و گرفتەکانی دیکەدا.

هێڵی یەکەم تاکەکەسییە کاتێك کە مرۆڤ قەبارەی راستەقینەی خۆی دەناسێ و هێڵی دووەمیش ڕاکردن لە دڕندایەتی کۆمەڵگە و ژیان.

**(لە ناو دڵی نیشتمان)دا ساڵی** 1977.

ئەم ڕۆمانە باس لە شیکردنەوەی نەخۆشییەکی دەروونی و شڵەژاندنی ڕۆحی کچێك دەکات کە لەگەڵ باوکیدا دەژیا توشی حاڵەتێك لە ناهەمواری دەبێت، بەشێوەیەکی کتوپڕی بە پەیوەندی باوکی لەگەڵ ژنێکی سپی پێستی گەنجدا دەزانێ و لەبەرئەمە بیر لە کوشتنی هەردووکیان دەکاتەوە.

هەروەها بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی چیرۆکەکە دەبینین کچەکە دوا ڕۆژی خۆی بە خزمەتکاری ماڵەکەیانەوە دەبەستێتەوە و لێرەوە خوێنەر ئاشنایەتی لەگەڵ ڕووداوەکانی چیرۆکەکەدا پەیدا دەکات، بەهۆی ئەو بیرەوەرییانەی کە کچەکە دەینوسێتەوە و بە شێوەیەك لە ڕێگەی نووسینی ئەم بیرەوەرییانەوە دەتوانین کەسایەتی و دەروون و بیروبۆچوونی و گەشەکردنی بیری ئەو کچە بناسین، ئەم ڕۆمانە بە شێوازێك لە شێوازەکانی کۆتزییە دادەنرێت لە ڕێگەیەوە لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی خوارووی ئەفریقیا دەردەخات هەروەها بە شێوازێکی تایبەتی چارەسەری کێشە سیاسییەکان دەکات.

**(لە چاوەڕوانی بەربەرەبیەکاندا)دا ساڵی** 1982

ڕۆمانێکی سیاسی توند و تیژە ساکاری تاکەکەسێکی نمونەیی پێوە دیارە کە بەرەو

کردنــەوەی دەرگایــەك لێیــەوە تەنگ و چــەڵەمە و ناخۆشــییەکان تیادایــە لێــرەدا کۆتزیــە هێڵــەکانی ئیمپراتۆرێکی ئەفسانەیی لە شوێن و کاتێکی ناشیاودا دەچنێ. تیادا وێنەی واقعــی بارودۆخــە گشــتیەکەی خواروی ئەفریقیا بەشێوەیەکی تیژ و ڕقەبەرایەتی دەخاتە ڕوو.

(ژیانی مایکل کی) ساڵی 1983

لــەم ڕۆمانــەدا کۆتزییــە دەکەوێتە ژێر کاریگەری شێوازی هەریەکــە لــە نووســەران (دانیێــل دۆفــۆ و کافکــا و ســامۆئیل بیکیــت)، کۆتزییــە بەشێوەیەکی ڕون و ئاشکرا ئەوە دڵنیا دەکات کــە نوســەرێکی تایبەتــە و لــەم ڕۆمانــەدا ژیــانی هاوولاتیــەکی سادە و ساکار دەخاتە ڕوو، باس لــە حاڵــەتی نــەبونی ئاســایش و جــەنگ و ئــەو گفتوگۆیانــەی کــە ڕوودەدەن دەســت پێبکــات. هــەروەها بــە نکــوڵی لۆجیــك داواکارییــەکانی هاوولاتیــان کۆتایی دێت.

(دوژمن) ساڵی 1987

کۆتزییە لەم ڕۆمانەدا حاڵەتی کەمایــەتی بــە ئــەدەب قــەرەبوو دەکــات و پاڵــەوانی ڕۆمانەکــەی ئافرەتێکە هەست بە ئاڵۆزی ئەو کەمایەتیە دەکات بەشێوەیەك ئەو وەك نوســەرێکی گــەورەی ڕۆمــان لەو بڕوایەدایە ئەوەی دەینوسێت هیچ پلە و نرخێکی ئەدەبی نییە، ئەم ڕۆمانــەش بەرجەســتەکردنی هاوچەرخی ڕۆمانی نوسەر دانێڵ فــۆ لــە (سەرکێشــییەکانی ڕۆبنسۆن کرۆز)ە.

(مامۆستا پەترسبۆرگ) ساڵی 1994

ئــەم ڕۆمانــە نووســەر ژیــانی ئــەدەبی و جیهــانی ئــەدەبی دیستوفسکیمان بـۆ دەردەخـات پاڵەوانــە خەیاڵیــەکانی کــە کۆتزییــە دروســتیان دەکـات بـۆ ئــەوەی بــە کــرداری کــە لــە گێڕانەوەی پێشکەشکراو دەچێ بـۆ ئـازار و هیلاکییــەکانیان لــە باسکردنێکی ئازاددا.

لێرەوە نوســەر هــەوڵ دەدات لە پێناوی چارەسەرکردنی کێشە ئەهریمەنییــەکانی بــاوەڕ بــە پێشــینییە جادوییــەك دەســتەبەر بکــات، پاڵــەوانی ڕۆمانەکــە (ئلیــزابیس کاســتیۆیە) بــەهۆی جادووەوە جارێکی تر بۆ شانۆی (بوون) دەگەڕێتەوە.

(زارویی) ساڵی 1999

ئــەم ڕۆمانــە بریتییــە لــە باســـکردنی بیرەوەرییـــەکانی نووسـەر و بـە ئاشکرا گرفتـی ڕق لێبوونــەوەی باوکێـك دەردەخـات کاتێك لە کوڕەکەی جیادەبێتەوە، چــۆن بڕیــاری بەســەردا سەپێنراوە. هەروەها ئەم ڕۆمانە لــەو کێشــە و ڕووداوانــە دەکۆڵێتەوە کە لە نێوان سپی و ڕەش پێستەکاندا ڕوودەدات وەك جیاوازی چینایەتی و جیاوازی تاکەکەسی سێیەم لـە ئـەفریقادا لەڕاســتیدا ڕەنگدانەوەیەکــە بـۆ ڕۆمانەکـەی (لیـو تۆلسـتۆی) کـە هــەمان ناونیشــانی هەیــە پەیوەنــدی لــە نێــوان ڕاســتی و خەیاڵدا کوتزیە لێرەدا بە ڕۆڵـی گێڕانــەوەی چــیرۆکەکە هەڵدەستێت.

(بەد ناو) ساڵی 1999

ئەم ڕۆمانە باسی بەسەرهاتی ژیـانی بـاوك و کچێك دەکـات لـە خــوارووی ئــەفریقیا لــە کــاتی ڕووخاندنی دەسەڵاتی ڕەشەکاندا لەم وڵاتەدا. خوێنەر لێرەدا لەگەڵ ڕووداوەکانی ژیانی دیفید لۆری تەمــەن (53) ســاڵدا دەژی کــە بڕیــار دەدات جــارێکی تــر ژن بهێنێتــەوە لــە دوای شکســت هێنانی ژنهێنانەکانی تری، بەڵام لـە دوای هــەر شکسـت هێنانێـك سـەروەت و سـامانێکی گـەورەی بەدەست دەهێنا.

کاتێك چاوی بە کچێکی لاو دەکەوێت ناوی (میلانی)یە بە ئاسانی دەتوانێ لە خشتەی بدات، لە دوایدا کە دایك و باوکی کچە بەمە دەزانن وا لە کچەکە دەکەن کە واز لە کارەکەی بهێنێت و بەرەو شاری (کیب تاون) کۆچ بکەن. دوای ئەمە لوری و کچە تاقانەکەی کە لە یەکێك لە ژنەکانی رابردووی هەیبوو ئەویێ بەجێدەهێڵن بەرەو گوندێك کۆچ دەکەن، لەوێش کچەکەی دووچاری پەلاماردان لەلایەن چەند کوڕێکی لاوی رەش پێستەوە دەبێت، دوای ئەم کارەساتەش دیسانەوە بڕیاری گەڕانەوە بەرەو شاری (کیب تاون) دەدەن، بۆ ئەوەی ئەو کارەساتە بشارنەوە کە تووشی کچەکەی بووە و سەرئەنجام دووگیان دەبێ لە یەکێك لە نەخۆشخانەی ئاژەڵداری بۆ خزمەتکردنی گیانلەبەران کار دەکات.

(**گەنجەکانی** 2002)

ئەم ڕۆمانە بە تەواوکەری ماوەی منداڵی ئەو نووسەرەی کە لە ڕۆمانی منداڵیدا لە ساڵی 1987 بلاویکردبویەوە دادەنرێت. پاڵەوانی ڕۆمانەکە خوێندکارێکە لە خوارووی ئەفریقیا لە قۆناغی پەنجاکاندا بیر لە ڕاکردن لە گوندەکەی خۆی و لە کێشە خێزانیەکانی کە هەیبوو لە ماڵەکەیدا ئەو کارە بە ئەنجام دەگەیەنێت کە خۆی لەو بڕوایەدا بوو کە ڕاست بێت، تا سەرئەنجام دەکەوێتە لەندەنەوە بەشێوەیەك کە ئەو شیعرە نادۆزێتەوە کە خەوی پێوە دەبینێ وە یاخود ئەو ڕۆمانەی کە خەون بە نووسینییەوە دەبینێ وە لۆمەکردن و ڕۆتین بەردەوام لە ژیانیدا دەبێت تا وای لێدێت بە کەمترین و بێ نرخترین کار ڕازی بێت.

(**ئیلیزابیست کاستیۆ**)

**ساڵی** 2003

ئەم ڕۆمانەی کۆتزییە باس لە ژیانی نوسەری ئوسترالی ژن (ئیلیزابیس کاستیۆ)ی خاوەن ڕۆمانی "ماڵێك لە شەقامی (الکن)" ساڵی 1969 دەکات بۆ ئەوەی بیکاتە ئەوەی نوێ و ژیانی دابین دەکات بۆ ئەو کۆنگرانەی کە باس لە پەیوەندییە مرۆییەکانی مرۆڤ دەکات تا بانگهێشت دەکرێ بۆ یەکێك لە کۆبونەوەکانی (ئەمستردام) داوای لێدەکرێ باس لە گرفتە باوەکان بکات بەشێوەیەکی سەرسوڕمان دەوەستێت ناتوانێ گفتوگۆ سەبارەت شتێك بکات کە بڕوای پێنەبێت، هەروەها نوسەر لە دەردی تەنیایی لەم ڕۆمانەدا لەسەر ڕۆشنایی چەند دێڕێکەوە کۆتزییە دەڵێت: من نوسەرێکم ئەوەی دەینووسم ئەوەیە کە دەیبیستم و لەبەرئەوەی من ویژدانی مرۆڤایەتیم کاری من گەڕان و پشکنینە و وەلامدانەوە و دادگایی کردنە.

لەبەرئەوەی من هەمیشە ووشەکان دەنووسم لە دوایدا ئاستی دەنگدانەوەی تاقی دەکەمەوە تا دڵنیابم لەوەی کە گوێم لێیەتی ڕاستەقینەیە هەروەها کۆتزییە خاوەنی کتێبێکە کە تێکەڵاوە لە نێوان ڕۆمان و وتار و کتێبێکیش لە هەشت بەش پێکدێت بە ناوی (وانە)یە تیایدا چەندین لێکۆڵینەوەی فیکری و ڕەخنەگرانەی پوخت و چڕ و پاکژی بەشێوەی پەخشان نووسیوە کە دادەنرێت بە کورتەیەك بۆ ژیانی کۆتزییەی تەمەن شەست و سێ ساڵ کە لە ژیانیدا مادەی ئەلکحولی نەخواردووە.

**سەرچاوە**

